# الوجيز



# في أصول الفقه

## بەکوردی

دانانی:
دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی
کردویەتی بەکوردی

بەرگی دووەم

# الوجيز
# في أصول الفقه

## بــــه كـــــوردی

دانـانی

**دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان**

(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)

**عەبدوڵلا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی**

**کردوویەتی بە کوردی**

**بەرگی دووەم**

# پێناسی کتێب

*ناوی کتێب: الوجیز فی اصول الفقه، به کوردی.
* دانانی: دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)
* وەرگێڕانی: عەبدوڵلا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی
*پەیوەندیکردن: shexnami@yahoo.com
* ﴿بەرگی دووەم﴾
* هەڵەچن: ئەندازیار مەلا ڕاستگۆ گەچێنەیی.
* نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
* چاپ: چاپخانەی چوارچرا – سلێمانی
*بڵاوکردنەوەی: کتێبخانەی بێخود – سەییدسادق، ﴿٠٧٥٠١٢٤٦٨١٨﴾.
*ساڵی چاپ: ١٤٣٦ – ٢٠١٥

ژمارەی سپاردنی ( ١٢٣٧ )ی، ساڵی(٢٠١٣ )ی، پێدراوە.

# چمکێك لە ژیان و کەسایەتی
# عەللامە، دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان
## ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت )

دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان بەهیچ ئەلعانیی، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە ساڵی (١٩١٧)، لە شاری (بەغداد)ی، پایتەختی عێراق، لە دایك بووە، و یەکێك بووە، لە زانایانی ئەهلی سوننە لە عێراق، و ئەمینداری پێشووی کۆمەڵەی (أخوانُ المُسلِمین)بووە، هەر لە عێراق، و بەڵام دواتر وازی لە حزبایەتی هێناوە، و خۆی بۆ خزمەت کردنی زانستە ئیسلامییەکان یەکلایی کردۆتەوە، و هەروەها یەکێك بووە، لە زانا زۆر شارەزاکانی زانستی ئوصولی فیقهی ئیسلامیی، و شەریعەتی ئیسلامیی، و سەردەمی نەشونماکردن، و گەورە بوون و خوێندنی هەر لە شاری (بەغداد)ی، پایتەختی عێراقدا بووە، و پاشان گەشتی کردووە، بۆ وولاتی (یەمەن)، و لە زۆر لە زانکۆکانی ئەوێدا ماوەتەوە، و هەر لە شاری (بەغداد)، (خانەی مامۆستایانی سەرەتایی)، تەواو کردووە، و و بووەتە مامۆستای سەرەتایی، و پاشان چۆتە (کۆلێژی ماف)، و ئەویشی تەواو کردووە، و دواتر کراوەتە بەڕێوەبەری (ئامادەیی نەجیبە خاتونی ئایینی)، و دواتر پەیوەندی بە پەیمانگای شەریعەتی ئیسلامییەوە، لە زانکۆی (قاهیرە)، کردووە، و بڕوانامەی ماستەری، بە پلەی(نایاب)، بە دەست هێناوە، و هەر دوای ئەمەیش بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی (قاهیرە)، لە ساڵی، (١٩٦٢)، بە پلەیەکی بەرز پێدراوە، و دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، پسپۆڕی فیقهی ئیسلامیی بووە، و ئاگاداری سەرجەمی سەرچاوە

گرنگەکانی بووە، بە تایبەت پەرتووکەکانی، شیخ الإسلام، (ئیبن تەیمیە)، و (ئیبن قەییمی جەوزی – قوتابی)، و هەروەها لە پرس و باسی تایبەت بە فیقهی ئیسلامییدا، گۆڕینەوەی بیروڕای زانستی زۆری لە گەڵ زانایانی پایەبەرزدا کردووە.

**- دواتر لە ژیانیدا، ئەم پۆستانەی وەرگرتوون:**

(١). مامۆستای شەریعەتی ئیسلامیی بووە، و هەروەها سەرۆکی بەشی شەریعەتی ئیسلامیی بووە، لە (کۆلێژی ماف)، لە زانکۆی بەغداد.

(٢). مامۆستای وانە شەرعییەکان بووە، و هەروەها سەرۆکی بەشی ئایین بووە، لە (کۆلێژی ئاداب)، لە زانکۆی بەغداد.

(٣). مامۆستای شەریعەتی ئیسلامیی بووە، لە کۆلێژی توێژینەوە ئیسلامییەکان، و هەروەها ڕاگرایەتیشی کردووە. .

(٤). لە ساڵی،(1992)بە دواوە، تا کۆتایی تەمەنی، مامۆستای شەریعەتی ئیسلامیی بووە، لە کۆلێژی توێژینەوە ئیسلامییەکان، و هەروەها خوێندنی ماجستێر، و دکتۆرا، بووە، لە زانکۆی (صەنعا)ـی، پایتەختی یەمەن.

(٥). هەروەها مامۆستای بەشی (فیقهـ، وئوصول)، بووە، هەر لە زانکۆی (ئیمان)، لە شاری (صەنعا)ـی، پایتەختی یەمەن.

(٦). هەر لە حەفتاکانەوە، ئەندامی کۆڕبەندی زانایانی زانکۆی ئیسلامیی بووە.

(٧). لە ساڵی،(٢٠٠٠)بە دواوە، ئەندامی کۆڕبەندی فیقهی بووە، کە سەر بە(ڕابیتەی جیهانی ئیسلامیی)ییـە.

(٨). ئەندامی کۆڕبەندی کۆمیتەی فیقهی ئیسلامیی بووە، لە زانکۆی (ئیمان)، لە شاری (صەنعا)ـی، پایتەختی یەمەن.

(٩). لە شەستەکاندا، چەندەها وانەی لە، (ڤیستیڤاڵی هەفتەی فیقهی ئیسلامیی)دا، داوەتەوە، لە وڵاتی (کوەیت).

(١٠). لە شەستەکاندا، چەندەها وتار، و بابەتی لە (ئینسکلۆپیدیای فیقهی ئیسلامیی)دا، هەر لە وڵاتی (کوەیت)، نووسیوە.

(١١). بەشداری لە بازنەی زانستی، (یاسا، و زانستە سیاسییەکان)دا، کردووە، کە لە ساڵی، (1969 )دا، کە لە شاری (بەغدا)ـی، پایتەختی عێراقدا، بە چاودێری، (کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی)، سازدرابوو، کە وتارێکی، سەبارەت بە، (یاسای نێودەوڵەتی گشتی، و شەریعەتی ئیسلامیی)، پێشکەش کردووە.

(١٢). لە حەفتاکاندا، وەك ئەندامی ئەنجومەنی ئەمیندارانی (زانکۆی ئیسلامیی)، دیاری کراوە، لە شاری (مەدینەی منەووەرە).

(١٣). لە حەفتاکاندا، بەشداری (هەفتەی فیقهی ئیسلامیی)، کردووە، و وتارێکی پێشکەش کردووە لە شاری (ڕیاض)، لە سعودیە.

(١٤). لە ساڵەکانی (١٩٩٥ – ١٩٩٦)دا، بەشداری (هەفتەی فیقهی ئیسلامیی)، کردووە، لە وڵاتی قەتەر.

(١٥). سەرپەرشتی سەدان نامەی ماجستێر، و دکتۆرای کردووە، لە زانکۆکانی (بەغدا)، و (صەنعا)ـی، پایتەختی وڵاتی یەمەن.

(١٦). ئەندامی لیژنەی دادوەری بووە، بۆ پێدانی خەڵاتی (هائیل سەعید)، بۆ زانست و ئاداب.

(١٧). لە ساڵی(1954 )دا، لە سەربازگەی (سوارە توکە)، لە کوردستانی عێراق، سەرپەرشتیاری ئاینی، و پەروەردەیی بووە، لەو سەربازگەیەدا.

(١٨). خەلاتی، (مەلیك فەیصەڵی جیهانی، لە توێژینەوە ئیسلامییەکان)، لە ساڵی، (١٤١٧ ك – ١٩٩٧ز)، پێبدراوە، بە هۆی کتێبە مەزنەکەیەوە، (المفصل في أحكام المرأة وبيت المسلم في الشريعة الإسلامية)، کە (١١) بەرگە، و بە پێی مەزهەبە جیاوازەکان نووسیویەتی.

لە گەڵ چەندەها پایەی زانستی و ئەکادیمی تر.

## * کتێبەکانی:

١. أحكام الذميين والمستأمنين في دار الإسلام.

٢. المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية.

٣. الكفالة والحوالة في الفقه المقارن.

٤. أصول الدعوة.

٥. الفرد والدولة في الشريعة.

٦. المفصل في أحكام المرأة وبيت المسلم في الشريعة الإسلامية، (١١) بەرگە.

٧. الوجيز في شرح القواعد الفقهية في الشريعة الإسلامية.

٨. الشرح العراقي للأصول العشرين.

٩. نظرات في الشريعة الإسلامية.

١٠. الوجيز في أصول الفقه. (کە لە بەردەستماندایە).

## * توێژینەوە زانستییەکانی:

١١. أثر القصود في التصرفات والعقود.

١٢. اللقطة وأحكامها في الشريعة الإسلامية.

١٣. أحكام اللقيط في الشريعة الإسلامية.

١٤. حالة الضرورة في الشريعة الإسلامية.

١٥. الشريعة الإسلامية والقانون الدولي العام.

١٦.الاختلاف في الشريعة الإسلامية.

١٧.عقيدة القضاء والقدر وآثرها في سلوك الفرد.

١٨.العقوبة في الشريعة الإسلامية.

١٩. حقوق الأفراد في دار الإسلام.

٢٠. القيود الواردة على الملكية الفردية للمصلحة العامة في الشريعة الإسلامية

٢١. نظام القضاء في الشريعة الإسلامية.

٢٢. موقف الشريعة الإسلامية من الرق.

٢٣.النية المجردة في الشريعة الإسلامية.

٢٤. مسائل الرضاع في الشريعة الإسلامية.

له گەڵ چەندەها کتێب و باسی زانستی و ئەکادیمی تر.

## * کۆچی دوایی:

دواجار، عەللامە دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە بەرواری، (٢٨ – ١ – ٢٠١٤)، لە شاری (صەنعا)ی، پایتەختی وڵاتی یەمەن، کۆچی دوایی کرد، غفَرالله لهُ، و أسْكَنَهُ فَسيحَ جَنّاته.

## (( بەندی سێیەم ))

# ڕێگاو ڕێساکانی هەڵێنجانی حوکمەکان

### ٢٥٧- ڕێخۆشکردن:

لە بەندی یەکەمدا، قسەمان کرد، لەسەر حوکمو پرسە پەیوەندیدارەکان پێیەوەو، لە بەندی دووەمدا لەسەر بەڵگەکانی ئەحکام دواینو، لەم بەندەدا دەمانەوێت قسە بکەین ، لەسەر ڕێگاکانی دەرهێنانی حوکمەکان، لەسەر چاوەکانیانەوەو، هەروەها قسەدەکەین، لەسەر ئەو یاسایانەی، کە لەکاتی دەرهێنانی حوکمەکاندا، وناسینیان بەهۆی ئەو سەرچاوانەوە موجتەهید ڕێنماییو بەرچاوڕوونی وەردەگرێت.

یەکەم سەرچاوەی شەرعدانان، بریتیە لە دەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) کە ئەمانە سەرچاوەی هەموو هەڵێنجانێکنو، پاڵپشتی هەموو بەڵگەیەکنو، لەبەر ئەوەی کە ئەم دەقانە بەزمانی عەرەبی هاتوون، دەبێت زانیاری پێویستمان هەبێت لەسەر یاساو ڕێساکانی زمانی عەرەبی کە تایبەتن بەڕاڤەی ئەو دەقانەو زانایانی زانستی ئوصوڵی فیقە، بایەخیان داوە بە ڕونکردنەوەی ئەو یاسایانەو، لەدوای سەقامگیربوونی شێوازەکانی زمانی عەرەبیو بەکار هێنانی ماناکان لەبەرگو زاراوەی خۆیانداو، ئاستی مانادانی ووشەکان، لەسەر ئەو مانایەی مەبەستیانەو هتد....، کەواتە: پەرژاونەتەسەر ڕوونکردنەوەی یاسای ئەم پرسانە! جا ئەم یاسایانە، کە ئێمە بە یاساکانی ئوصولی فیقە، (القواعد الأصولية)[1] ، ناوزەدیان دەکەین تەنها خۆیان بەس نین، بۆ تێگەیشتن لە دەقەکانو

---

[1] ئەم یاسا و ڕێسایانە پێویستن بۆ ڕاڤەکردنی هەر دەقێکی یاسایی کە بەزمانی عەرەبی نووسرابێت چونکە ئەم یاساو ڕێسایانە تەرازووو پێوەرن بۆ تێگەیشتنی زمانی عەرەبیو، لەبەر ئەوەی کەیاسا بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوە بۆیە ئەویش بەمەبەستی تێگەیشتن لە زاراوەو

---

دەستەواژەکانی ملکەچی ئەو تەرازوو پێوەرانە دەبێتو ئەمەیش چونیەکە ئەو یاسایە هەر لە بنەڕەتدا بەزمانی عەرەبی دانرابێت، یان لە زمانێکی بێگانەوە پەرچڤە کرابێت بۆسەر زمانی عەرەبی، بۆیە ڕەچاونەکردنی ئەو یاسایانە لە ڕاڤەکردنی دەقەکاندا، دەبێتە هۆی کەوتنە هەڵەوە لە گەیشتن لەو یاسایانەو زانینی حوکمەکانیو ئەوەی کە پێوەی پەیوەستە لە پراکتیزە کردنی واتای ئەو دەقانە بەسەر پێشهاتە جۆراو جۆرەکانی ژیانماندا، و دواجار ئەمەیش دەبێتە هۆکاری فەوتانی مافی خەڵکیو چونکە دادوەر بەپێی تێگەیشتنی خۆی یاساکان جێ بەجێ دەکاتو، بۆیە ئەگەر تێگەیشتنەکەی نەخۆش بوو یان عەیبدار بوو یان نادروست بوو، ئەمە دەبێتە هۆی تیاچوونی مافی خاوەنەکانیانو، مافەکە دەدرێت بە کەسێك کە خاوەن ماف نییەو لەم پرۆسە یەشدا کەسی بێ تاوان تاوانبار دەکرێتو تاوانبار ڕزگاری دەبێتو دواجار لێرەدا ئەوە سودی دەبێت، کە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ڕاڤەکردنی یاساکان، بەسێ شێواز دەبێت:

- **یەکەم:** ڕاڤەکردنێکی شەرع شێوە (التفسیر الفقهي)، کە ئەمەیش ئەوەیانە کە شەرعزانەکان (فقهاء) لە ڕاڤەکردنەکانیاندا بۆ یاساکان بەکاریان هێناوەو، ئەم جۆرە ڕاڤەیە بەڕاستی زۆر داماڵراوەو، لۆژیکی ڕووتەو، ڕەچاوی سەردەم (واقع) نەکراوە.

- – **دووەم:** ڕاڤەی دادوەری (التفسیر القضائي) ئەمەیان ڕەچاوی واقیعی تیادا کراوەو، ڕەچاوی ئەو پێشهاتانەکراوە کە دەخرێتە بەردەم دادوەر و ئەم جۆرە ڕاڤەیە شێوازی زانستی زیاتر بەسەریدا زاڵەو، هەروەها کاریگەری واقیعی زیاتر لەسەردیارە، بە پێچەوانەی ڕاڤەی فیقهییەوەو، لێرەدا دادوەر کار لەسەر ڕاڤەکردنی یاساکان دەکات لەکاتی تەماشاکردنی پێشهاتە سکاڵا لەسەر کراوەکاندا، و ئەو بەجۆرێ ڕاڤەی دەکات. کە ڕێخۆش بکات بۆ جێ بەجێ کردنی بۆیە دروست نییە، کە هەر لەڕێوە یاخود بەسەربەخۆیی داوا لەدادوەر بکرێت، و کە ڕاڤەیەك دەربکات بۆ هەر دەقێکی یاسای دیاریکراو، چونکە کاتێك ئەو ڕاڤەی دەکات کە لەکاتی جێ بەجێ کردنی ئەو یاسایەدا بێت، بەسەر پێشهاتەکاندا. چونکە ئەم ڕاڤەیە زۆر زەرورە، و پێویستیشی بەجێ بەجێ کردن هەیە.

- **سێیەم:** ڕاڤەی شەرع دانان (التفسیر التشریعي) ئەمەیان بریتییە لەو ڕاڤەیەی خودی شەرعدانەر، گرتویەتیە ئەستۆی خۆی، تا تارمایی سەر دەقێك لا ببات یاخود نادیاریو تەمی سەر دەستەواژەیەك بڕەوێنێتەوە، یاخود بابەتێکی ڕەها (مطلق) سنوردار، (تقیید) بکات، یاخود کێشەو گرفتێك لا ببات بەهۆی ڕاڤەکردنەکەوەو، ئەم جۆرە ڕاڤەیە سەر بەدەقە بنەڕەتیەکەیە، و وەك بەشێکی ئەو تەماشا دەکرێت.

ڕاڤـه كردنیـان بـه شـێوەیەكی كامـڵو تـەواو، بـەڵكو دەبێـت مەبەستەگشـتیەكانی شەرعدانەر تـێ بگـەینو بـزانین، كـه مەبەستی چـی بـووە لـه بەشـەرع كردنـی ئـەو ئەحكامانەدا.

هەروەها پێویستیشه بۆ كەسی موجتەهید كه ئـەو یاسـاو ڕێسـایانه بزانێـت، كـه پشتیان پـێ دەبەستێت، بۆ ڕەواندنەوەی ئـەو گرفـتو پێچـەوانه گەریانـەی كەدێنـه سەر ڕێی، له دژایەتی نێوان دەقەكان، یاخود ئەحكامەكانداو، چۆنیەتی لابردنی ئەو دژایەتییـەو ڕێگاكـانیو هـەروەها زانینـی (الناسـخو المنسـوخ)و، زانینـی یاسـاكانی بەلایەكدا خستنی بەڵگـەو حوكمـەكان (الترجـيح بـين الأدلـة والأحكـام) بۆیـه ڕێگـاو ڕێساكانی هەڵێنجانی حوكمەكان، لەسەر بوونی زانست وەستاوە بە یاسـا ئوصـولیه زمانەوانییـەكانو، مەبەستەگشتییەكانی شـەرع دانـانو چـۆنییەتی لادانـی دژایـەتی نێـوان بەڵگـەكانو، پێشخسـتنی هەنـدێكیان بەسـەر هەنـدێكی تریانـداو، زانینـی (الناسخو والمنسوخ).

لەم ڕوانگەیەوە، ئەم بەندە دابەش دەكەین بۆ سێ بەش:

- بەشی یەكەم: یاساكانی ئوصولێ.
- بەشی دووەم: مەبەستە گشتییەكانی شەرعدانان.

(مقاصد التشريع العامة)

- بەشی سێیەم: سەبارەت بەسڕپارو سڕاوەو دژایەتی بوونو بەلایەكداخستن، (الناسخ والمنسوخ والتعارض والترجيح).

---

- جـا ئـەم ڕاڤانـە بەگشـتی پشـت بەیاسـاكانی ڕاڤـەكردنی دەقـەكان دەبەسـتن، ئەوانـەی كـە ئاماژەمان پێدان، بەمەبەستی زانینی ئامانجی دەقە دەربڕدراوەكان (منطوق النص)، بـەڵام لـەكاتی نەبوونی دەقدا ئەوا پشت بەقیاسو مەبەسـتەكانی شـەرعدانان (مقاصـد التشـريع)، و هاوێنـەكانیان دەبەسترێت بۆ زانینی حوكمە داواكراوەكە.

# بەشی یەکەم:

## (( یاسا ئوصولییە زمانەوانییەکان ))

### ٢٢٥٨- ڕێخۆشکردن:

ئەم یاسایانە پەیوەستن بە دەربڕینی دەقەکانەوە لەڕووی ئەو مانایانەوە کە دەیگەیەنن، و لێیان دەفامرێتەوە، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێداو، کۆنترۆڵ کردنی ئەم یاسایەنە پێویستی بە هەڵوێستەکردن هەیە، لەسەر بەشەکانی دەربڕین (اللفظ)، سەبارەت بە ماناکەی‌و هەروەها زانینی سەرجەم ئەو شتانەی کە دەچنە ژێر ڕکێفی هەر لقێ لەو لقانەو دابەرشکردنەکانیشیان.

دەربڕینی (اللفظ) لە لای زانایانی ئوصولی فیقهـ، سەبارەت بەو مانایەی کە دەیدات بەدەستەوەو ئاستی پەیوەندی پێیەوە، دەبێتە چوار بەشەوە:

- **بەشی یەکەم:** بە پێوەدانگی دانانی ئەو لەفزە، بۆ ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، و بە پێی ئەم پێوەدانگە بێت، دەبێت بەم جۆرانەوە: (خاص: تایبەت) (عام: گشتی، (مشترك: هاوبەش).

- **بەشی دووەم:** بە پێودانگی بەکار هێنانی ئەو لەفزە بۆ ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، یان بۆ غەیری ئەو دانراوەو، بە پێی پێودانگەیش ئەم بەشانە دێنە ئاراوە: (الحقیقة)و (مجاز:خوازراو)و (سریح: ڕاستەخۆ)و (کنایة: ناڕاسنەوخۆ).

- **بەشی سێیەم:** بەپێی پێودانگی دەلالەت کردنی ئەو لەفزە لەسەر ماناکەی، واتە: لەڕووی ڕوونی ماناکەی‌و، شاراوەیی بوونی لەسەر ئەو لەفزەی کەبۆی بەکار هێنراوەو، بەپێی ئەم پێودانگەیش، ئەم بەشانەی لێ دروست دەبن، (ظاهر)و (نص)و (مفسر)و (محکم)و (خفي)و (مجمل)و (مشکل)و (متشابە).

- **بەشی چوارەم:** بە پێودانگی چۆنیەتی دەلالەت کردنی لەفزەکە لەسەر ئەو مانایەی کە بۆی بەکار هێنراوەو، ڕێگاکانی تێگەیشتنی ئەو مانایە، لە لەفزەکەوەو

بەپێی ئەم پێودانگە دەلالەتی لەفزەکە لە سەرماناکە یان بەڕێگەی دەستەواژە (طريق العبارة) دەبێت، یان ئاماژە (إشارة)، یان دەلالەت کردنو، یان داواکردن (إقتضاء).

جا لەسەر هەموو بەشێك لەم بەشانە قسە دەکەین، لەبەشە باسێکی سەربەخۆداو، بەپێی خۆیو، ئەو ڕێبەندەی کە باسمان کرد، چونکە ئەو ڕیزبەندە ڕیزبەندێکی سروشتییە لەفز یەکەمجار مانا ڕون دەکاتەوەو، دواتر بەکار دەهێنرێت بۆ ئەو مانایەو، دواتر تەماشای دەلالەت کردنی ئەو لەفزە دەکرێت، لەسەر ئەو مانایە، لەڕووی ڕوونیو شاراوەیی دەلالەت کردنەکەوەو، دواتر دەست دەکات بە باسکردنی ڕێگای زانینی ماناکە، ئیتر چونیەکە ئەو مانایە ڕوون بێت، یان ناڕوونو شاراوە.

## (( بەشە باسی یەکەم ))

## سەبارەت بە دانانی لەفز، بۆ مانایەك

٢٥٩- لەفز بەپێی دانانی بۆ ماناکەی، واتە: ئەو مانایەی کە مەبەستمانەو دەمانەوێت بۆ بەشەکانی (خاص)و (عام)و (مشترك) دابەش دەبێتو، لە ژێر باسی (خاص)یشدا (المطلق)و (المقید)و (النهي) جێگایان دەبێتەوەو، لەم ڕوانگەیەوە ئەم بەشە باسە دابەش دەکەین، بۆ سێ مەبەست مەبەستی یەکەم، دەربارەی (خاص)و دووەم: دەربارەی (عام)و مەبەستی سێیەم: دەربارەی (مشترك)ـە.

## (( مەبەستی یەکەم ))

## ( الخاص: تایبەت )

### پێناسەکەیو جۆرەکانی:

١٦٠- (خاص) لە زمانی عەرەبیدا، بەمانای تایبەتو تاکەوە بوو، هاتووە، وەك عەرەبەکان گوتویانە: (إختص فلان بكذا: فلانەکەس لە فلانە شتدا تایبەتە) واتە: تاکەو تەنها لەو شتەدا قاڵو خەریکەو، لەزاراوەی زانایانی زانستی ئوصولی فیقهدا بریتییە لەو لەفزەی کە دانراوە بۆ تەنها یەك مانا، لە شێوەیەکی تایبەت[١]و، دەبێتە سێ بەشەوە تایبەتی کەسی (خاص شخصي)، وەك ناوی کەسەکان (أسماء الأعلام). بۆ نموونە: (زەید)و (موحەمەد)و تایبەتی جۆری (خاص نوعي)، وەك (رجل: پیاو) (أمرأة: ژن)و (فرس: ئەسپ)و، تایبەتی نەژادی (خاص جنسي)، وەك (إنسان: مرۆڤ)و، هەروەها ئەو لەفزەی کەدانراوە بۆ ماناکان، نەوەك بۆ خودی

---

[١] أصول السرخسي، ب١، ل ١٢٥، شرح المنار، ل٦٤- ٦٥.

شتەکان (ذوات)، ئەمەیش هەر سەر بەبابەتی (خاص)ـە، وەك: (العلم: زانین)و (الجهل: نەزانین)و هاووێنەکانی.[1]

بۆیە جۆری (النوعي)و نەژادی (الجنسي)، سەربە (خاص)ن، چونکە مەبەست لە (خاص)بریتیە لە بەکار هێنانی لەفز بۆ یەك مانا، لەو ڕووەوە کە تاكو تەنهایە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە لەدەرەوە چەند تاکێکی تری هەیە، یاخود هەر تاکی تریش نەبن‌و، بێگومان تایبەتی جۆری (الخاص النوعي) وەك (رجل: پیاو) دانراوە بۆیەك مانا، کە بریتییە لەو مرۆڤە نێرینەیەی کە قۆناغی منداڵی تێپەڕاندووەو، هەروەك گوتمان هەرچەندە ئەو مانایە لەدەرەوەدا تاکی تری هەن، بەڵام ئەوە لەلای ئێمە گرنگ نییەو هەروەها تایبەتی نەژادی (الخاص الجنسي) وەك: (إنسان: مرۆڤ)، کە بۆیەك مانا بەکار هاتووە، واتە: یەك ڕاستی‌و حەقیقەت، کە ئەویش گیانداری گۆیەندەیە (الحیوان الناطق)و، کە ئەم تەنها حەقیقەتەی، لەدەرەوە تاکی تری هەن، ئەمە لەلای ئێمە گرنگ نییە چونکە تەماشای ئەوە ناکرێت‌و، لەم ڕوانگەیەوە (الخاص النوعي)و (الخاص الجنسي) هەردووکیان یەك مانایان هەیەو، لەم ڕووەوە هەردووکیان وەك (الخاص الشخصي) وان، کە بۆیەك مانا دانراوە کە بریتیە لە خودی ئەوشتەی کە دیاریکراوەو، تایبەت کراوە.

لە پێناسەی (خاص)و جۆرەکانییەوە، ڕوون دەبێتەوە کە لەفزی ژمارەکانی وەك (ثلاثة)و (عشرة)و (عشرین)و (مئة)و هاووێنەکانیان، هەموویان سەر بە (خاص)ن، بە پێی ئەوەی کە سەربە تایبەتی جۆرین (الخاص النوعي) و هەندێ لە زانایانی زانستی ئوصولی فیقهیش بەڕاشکاوانە ئاماژەیان بەم ڕاستییە داوە.[2]

---

[1] أصول التشريع الأسلامي، للأستاذ علي حسب الله، ل ١٨٠.

[2] حاشية الأزميري، ب١، ل ١٢٨، الثلوج، ب١، ل ٣٤، تسهيل الوصول إلى على الأصول، للمحلاوي، ل ٣٤.

جا ژماره سێ (ثلاثة)و هاووێنەكانی سەربە ناوە ژمارەییەكانن، كە بۆیەك مانا دانراون، چونكە بۆ خودی ئەو ژمارەیە دانراون واتە: هەموو یەكە ژمارەییەكان بەگشتی لە ڕووی ئەوەوە كە (كۆ)، بە بێ تەماشاكردنی هیچ شتێكی تری ئەم بوارەو، هەروەها ئەوەی كە لە چەند تاكێك پێكهاتووە، ئەمە كارناكاتە سەر (خاص) بوونیو، مەرج نییە، كە زۆری ژمارەكە كاریگەری لەسەر تایبەت بوونی دروست بكات، بۆ نموونە ژمارە (سێ)، كە لە سێ یەك پێكهاتووە، واتە: (یەك+ یەك + یەك) ئەم زۆریو تاكە جیاجیایانە كار لەسەر (خاص) بوونەكەی ناكات، چونكە وەك زۆری (زەید) ناوەكان وایە، ئەمە ڕۆشنكەرەوەی ئەو ڕاستییەیە كە ناتوانین مانای بۆ نموونە (سێ) جێ بەجێ بكەین، بەسەر هەر یەكێك لە پێكهێنەرەكانیدا، كە ژمارە (یەك)ـە، چونكە لە سێ (یەكی) پێكهاتووەو مانای (سێ) جیاوازەو (یەك)یش هەر ماناكەی جیاوازە، هەروەك چۆن ناتوانین مانای (زەید) لە تەواوی (زەید) ناوەكاندا بەرجەستە بكەین چونكە هەر یەكێكیان جۆرێكە بەڵام هەندێكی تر لە زانایانی زانستی ئوصولی فیقهـ، ناوە ژمارەیەكیان (أسماء الأعداد) یان سەر بە (خاص) ئەژمار كردووە، بەڵام نەوەك لەسەر بنەمای ئەوەی كە سەربە (الخاص النوعي) بێتو بەڵكو لەسەر بنەمای ئەوەی كە هەر بەهەمان لەفز دەلالەت دەكات، لەسەر تاكی زۆری بێ سنوورو، هەرچی بەم جۆرە بوو، ئەوە سەر بە باسی (خاص)ە بۆیە ئەم گروپەی زانایانی ئوصول، (خاص) بەم جۆرە پێناسە دەكەن، بەوەی كە ئەو لەفزە دانراوەیەكە بۆ بڕێكی زۆر، بەڵام سنوردار دانراوە، وەك، (أسماء الأعداد)، یاخود دانراوە بۆیەك مانا، ئیتر ئەو یەك مانایە، بە پێی كەس بێت، وەك (زەید) یان بەپێی جۆر بێت، وەك (رجل: پیاو). یان بە پێی جینس بێت، وەك، (إنسان: مرۆڤ)[1] هەر چونییەكەو، هەروەها ئەگەر

---

[1] التلويح والتوضيح، ب١ ل٣٢– ٣٤، وهەندێكیان وا (خاص)یان پێناسە كردووە، كە ئەو

پێناسەی یەکەمو خاوەنەکانیان وەربگرین، یان پێناسەی دووەمو خاوەنەکانیان وەربگرین، هەر چونیەکە، چونکە (أسماء الأعداد) سەر بەتایبەت (خاص)نو لە پێری ئەو دێنە ئەژمار.

**٢٦١- حوکمی ((خاص))**

(خاص)، خۆی لەخۆیدا ئاشکرایەو، ڕەهابوونو گرفتی تیادا بەرجەستە نییە، بۆیە دەلالەت دەکات، بە دەلالەتێکی یەکلایی (قطعي)، لەسەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، واتە: بەبێ هیچ ئەگەرێك، کە لە بەڵگەیەکەوە سەری هەڵدابێت، حوکمەکە جێگیر دەکات، لەسەر ئەو ماناو مەبەستەی بۆی هاتووە، بە جێگیرکردنێکی (قەطعي)و بێ گومانو ڕاڕایی، وەك فەرمایشتی پەروەردگار، سەبارەت بە کەفارەتی سوێند، کە دەفەرموێت ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ﴾[1] کە ئەو حوکمەی لەم دەقەوە وەردەگیرێت، ئەوەیە کە واجبە سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت، لە جیاتی کەوتنی سوێندەکەی، چونکە لەفزی (ثلاثة)، لە لەفزە تایبەتییەکانە، و بە (قەطعي) دەلالەت دەکات لەسەر ئەو مانایەو، ڕاڕایی تیادانییەو، هیچ زیادەو کەم لەسەر کردنێك نایگرێتەوەو، هەروەها وەك، بەشەکانی میرات کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، کە سەرجەمیان قەطعین، چونکە سەر بە بابەتی (خاص)ن.

هەروەها وەك فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((في كل أربعين شاةً، شاةٌ)) واتە: زەکاتی چل سەرمەڕ یان چل سەر بزن، مەڕێك، یان بزنێکە، کە ئەندازەگیری کردنی، زەکاتی چل سەر مەڕ یان بزن، ئەندازەگرتنێکە، کە زیادو کەم کردن هەڵناگرێت، چونکە لەفزەکە لە لەفزێکی تایبەتە (خاص)ـەو، هەر

---

لەفزەیە کە شتێکی سنووردار، دەگرێتەوەخۆ، و ئیتر یەك بێت یان دوو، یان سێ، یان زیاتر، بڕوانە (شرح ورقات الأمام الحرمين، للخطابي، ب، ل٣٠، و (لطائف الأشارات، ل ٣٠)).

[1] المائدة (٨٩).

ئەمەیش حوکمی (خاص)ـە، و دروست نییە، کە بگوترێت، کە ئەندازەی زەکاتی ئاژەڵ سیءو نۆ دانەیە، یان پەنجادانەیە،و هەروەك ئەندازەگیری کردنی زەکاتی چل سەر مالأت، بە یەك دانە مەڕ یان بزن، ئەمەیش دیسان زیادەو کەمی لەسەر ناکرێت، چونکە ئەمەیش هەر سەر بە بابەتی (خاص)ـە، و هەر ئەمەیش حوکمە(خاص)ـەکەیە، و بەڵام ئەگەر بەڵگەیەك پەیدا بوو، لەسەر گۆڕینی مانای (خاص)، واتە: گۆڕینی ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، یاخود دانانی مانایەکی تر بۆی، ئەوا لەم حاڵەتەدا، ئەو (خاص)ـە، بەپێی ئەوەی کە بەڵگەکە داوای دەکات، ڕاڤەی بۆدەکرێتو، سەر بەو دادەنرێتو، هەروەها وەك ئەوەی کە حەنەفیەکان دەریان بڕیوە، سەبارەت بەوەی کە ئەو مەڕو بزنەی (شاة) لە فەرموودەکەدا هاتووە، بە خودی مەڕو بزن یا خود نرخەکەی مانایان کردووەو، لێکیان داوەتەوەو، بەڵگەشیان لەسەر ئەمە ڕەچاوکردن و تێبینی کردنی مەبەستو ئامانجی شەرعە، لە دەربڕینەکەیدا، چونکە شەرع دانەری کار بەجێ بۆیە دایناوەو، کردویەتی بە شەرع، تا زەکات دان جێبەجێ بکرێتو، بەهۆی ئەم دەقەوەو داواکەیەوە، سود بۆ هەژاران فەراهەم بکرێتو، پێداویستیەکانیان پڕ بکرێتەوەو، ئەم مانایەش لە دانی خودی مەڕو بزنەکە بە زەکات دێتەدیءو، هەروەها بە دانی نرخی مەڕو بزنەکەیش هەر مەبەستو مەرامەکە دێتەدی!

جا حوکمی(خاص)ئەوەیە کە ڕوونمان کردەوەو، جێگای کۆکبووی نێوان زانایانیشە، بەڵام حەنەفییەکان، لەو پرسانەیدا، کە لەگەڵ خەڵکی تردا ڕاجیاییان هەیە، وەك بەڵگە بەکاریان هێناوەو، لەو پرسانەیش، تەنها یەك پرسیان باس دەکەین:

شەرعزانەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە عیددەی ئافرەتی تەڵاقدراو کە لە کاتی سوڕی مانگانەدا بێتو کابرا چوبێتەلایءو، سکی پڕ نەبێت، ئەمە عیددەکەی سێ

(قُـرْء)ـه، لەبەر ئـەم فەرمایشـتەی پـەروەردگار کـە دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ [1] واتـە: ئـەو ژنانـەی پـاش چـونەلایان، تـەلاق دران، تاسێ پاکیی دەبێت، خۆیان بگرن و، مێردنەکەنـەوە، بـەڵام سـەبارەت بـە لـەفزی (قُرْء)و، مەبەستەکەی، ڕاجیاییـان هەیـە، لـە لای حەنەفییـەکان، دەڵێن مەبەست (حیض) بێ نوێژییەو، لە لایان عیددەی ژنی تەڵاقدراو بە ڕێکردنی سێ جار حەیزە، بەڵام نەیارانی حەنەفییەکان کە شافیعیەکانن، ڕایـان وایـە کـە مەبەسـت لـە لـەفزی (قُـرْء)، (پاکێتی)یـەو بەڵگـەی حەنەفیـەکان ئەوەیـە کـە لـەفزی (ثلاثـة)، خاصـەو، بەشێوەیەکی (قطعي)، دەلالەت دەکات لەسەر ئەو مانایەی کە بـۆی دانـراوە، بۆیـە حوکمەکەی بریتیە لە واجبی سێ جـار حـەیز، لـە عیـددەدا، بـەبێ زیـادو کـەم، جـا ئەگەر مانای لەفزی (قُرْء)مان، خستە سەر پاکبوونەوە ئـەوا کاتەکە زیـاتر دەبێـت، لەسێ (قُرْء)و، یا خود لێی کەم دەبێتەوە، واتە: کەم و زۆری دێتە ئاراوەو، ئەمەیش دروست نییـە، چـونکە ئەمـە پێچـەوانەی داواکردنـی دەقەکەیـەو، پێچـەوانەی حـوکمی خاصەکەیە، چونکە ئەو پاکبوونەوە(طُهْر)ـەی، کە پیاوەکە ژنەکەی تیـادا تـەڵاق دەدات، ئەگـەر سـەربە عیددەکـە ئـەژماری نەکـەین، ئـەوا کاتەکـە درێـژ دەبێتـەوە بـۆ سـێ پاکبوونەوەو، هەندێکی تری زیادەیش! و ئەگەر ئەژماریش بکەین، ئەوا عیددەکە دەبێتە دوو پاکبوونەوەو، هەندێکی تر واتە: ئەمجارەیان کەم دەکاو، هەروەك گوتمـان ئەمـەیش پێچەوانەی حوکمی دەقەکەیە، بەڵام ئەگەر (قُرْء) بەمانای بێ نوێژی (حیض) وەربگـرین، ئەوا ئەو کاتە عیددەکە بە سێ جار بێ نوێژی ئەژمار دەکرێـت، بـەبێ زیادوکـەم کـردن و، ئەمـەیش حـوکمی دەقەکەیـەو، داواکـراوە تایبەتەکەیـەو، کەواتـە دواجـار ڕوو لـەوە دەکەین، کە مانای (قُرْء) بریتییە لە بێ نوێژی، نەوەك پاکبوونەوە [2].

---

[1] البقرة (٢٢٨).

[2] أصول السوخسي، ب١، ل ١٢٨، شرح المنار، لأبن ملك، ل ٧٨.

## (( لقى يەكەم ))

## (( الـمطلق والـمقيد: ڕەهاكراوو كۆتكراو ))

٢٦٣- پێناسەی (المطلق)و (المُقَيَّد):

(المطلق): بريتيە لەو لەفزەی كە لەسەر شتێكی زۆرو گشتیو بلاو، لە هەمان جينسو نەژادی خۆيدا دەلالەت بكات،[1] و بەدەستەواژەيەكی تر، بريتييە لەو لەفزەی كە دەلالەت دەكات، لەسەر تاكێك، ياخود لەسەر چەند تاكێكی دياری نەكراوو، بێ بوونی پەيوەند (قيد)ێكی، لەفزی تيايدا[2]، وە (رجل)، (رجال)و، (كتاب)، (كتب).

- المُقَيَّد: بريتييە لەو لەفزەی كە لە لەسەر شتێكی زۆرو گشتیو بلاو، لەهەمان جينسیو نەژادی خۆيدا دەلالەت بكات، بەلام ئەوەندەهەيە، كە وەصفێك، لەوەصفو خەسڵەتەكانی پێوە پەيوەند دەكرێت، دەبەسترێت،[3] و بەدەستەواژەيەكی تر، بريتييە لەوەی كە سەر بەو لەفزانەيە كە دەلالەت لەسەر تاكێك دەكەن، ياخود لەسەر چەند تاكێكی ناديارى كراوە بەلام صيفەتێكی پێوە دەبەسترێت، كە ئەو وەصفەيە دەلالەت لەسەر ئەوە دەكات، كە بەستراوەو پەيوەند كراوە لەسەری. وەك (رجل عراقي: پياوێكی عێراقی) يان (رجال عراقين: پياوگەلێكی عێراقی)و (كتب قيمة: كتێب گەلێكە بەسوودو، بەپێز))، بەلام هەڵبەتە دەبێت سەرنجی ئەوە بدەين، كە موقەييەد، ئەگەر ئەو پەيوەندە (قيد)ـەی، پێوە نەبوو ئيتر بە موتلەق دێتە ئەژمار، بەومانايەی كە موقەييەد كاتێك بە موقەييەد

---

[1] الأمدي ب٣، ل٢، إرشادا الفحول، ل١٤٤.

[2] شرح مسلم الثبوت، ب١، ل، ٣٦٠.

[3] الأمدي، ب٣- ٤، إرشاد الفحول، ل ١٤٤.

تەماشا دەکرێت، بەو صیفەتەی کە وەك (قیـد) پێـوەی بەسـتراوەو، دروسـت نییـە بەبێ بەڵگە موقەییەد بکرێت، بەشتی ترەوە جا کـە گوتمـان (رجـل عراقـی)، تـەنها لەڕووی ڕەگەزی عێراقی بوونەوە کابرامـان موقەییـەد کـردووە، ئـیتر لەغـەیری ئـەو قەیـدە بـە موتڵـەق تەماشـا دەکرێـت، هـەموو پیـاوێکی عێراقـی دەگرێتـەوە، دەوڵەمەند بێت یان هەژار، شاری بێت یان لادێی‌و، هتد...

٢٦٤- حوکمی موتڵەق:

لەسەر ڕەوتی موتڵەقایەتی (ڕەهایەتی) خۆی دەڕواتو، دروسـت نییـە کـە هـیچ پەیوەند (قید)ێکی، پێوە ببەسترێتو، گرێ بدرێت، مەگەر بەڵگەیـەك پەیـدا ببێـت، لـە سـەر دروسـتی کۆتکردنی‌و، (قەیـد) پێـوە بەسـتنی‌و، دەلالـەت کردنـی لەسـەر ماناکـەی (قـەطعـي:یـەکلایی) دەبێـتو، حوکمێـك بـۆ ئەوشـتە دەردەکـات، کـە لـە پێناویدا بڕیاری لەسەر دراوە، چونکە سەر بەبەشەکانی (خـاص)ەو، هـەر ئەمـەیش حوکمی (خاص)ـەکەیە.

نموونـەی موتڵـەق، وەك فەرمایشـتی خـوای پـەروەردگار لەسـەر کـەفارەتی (ظیهـارە) کـە دەفـەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ﴾[1] واتـە: ئەوانـەی لـە ژنـەکانیان ظیهـار دەکـەنو، پێیـان دەڵێن: ئێوە لە جێی دایکمانن، یان وەك پشتی دایکمانن‌و، لەپاشـان دەگەڕێنـەوەو پەشیمان دەبنەوە لەقسەی خۆیانو، دەیانەوێت، بیانکەنـەوە بـەژنی خۆیـان ئـەوە دەبێت پێش ئەوەی بگەنەیەکو، تێکەڵی ژن‌و مێردی بکەن، بەندەیەك ئـازاد بکـەن، واتە: ئەگەر (ظیهار) کار ویستی هاورەسـەکەی بکاتـەوە بـەژنی خـۆی ئـەوە نابێـت نزیکی بکەوێتەوە تا کەفارەت دەدات.

---

[1] المجادلة (٣).

که ووشەی (رقبة) لە دەقەکەدا بە موتڵەقی هاتووەو هیچ کۆتێکی (قید)ێکی پێوەنییە، بۆیە هەر لەسەر ئەوپەوتی موتڵەق بوونەی تەماشا دەکرێتو، ئەژمار دەکرێتو، واجبە کە لەسەر شانی کابرا ئەوەیە کە هەر جۆرە بەندەیەك بێت ئازادی بکات، ئەگەر کابرای (ظیهار)کار ویستی بچێتەوەلای ژنەکەی.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك فەرمایشتی پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾[1] واتە: ئەو پیاوانەی کە لێتان دەمرنو، ژنەکانیان بەجێ دێڵن، ئیتر لە گەڵیاندا خەوتبن، یان نا... ئەوا دەبێت، ئەو ژنانە چوار مانگو دەشەو چاوەڕوان بن!.

که لێردا ووشەی (أزواجاً)، بە موتڵەقی هاتووەو، دروست نییە، پەیوەستو کۆی ئەوەی لەسەر دابنرێت، کە دەبێت ئەو ژنە سەرجێیی لەگەڵدا کرابێت، بۆیە دەقەکە ژنانی گوازراوەو نەگوازراوە دەگرێتەوەو بۆیە عیددەی مێردمردنیان بریتییە لە چوار مانگو دەڕۆژ.

ئینجا نموونەی ئەو موتڵەقەی کە بەڵگەیە، لەسەر پەیوەستو (قید)کردنی، وەك فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَآ أَوْ دَيْنٍ﴾[2] واتە: مافی میراتبەرەکان دوای دانەوەی قەرزو قۆڵەو پێکهێنانی وەسیەتی مردووەکە دەدرێت، کە لێرەداو لەدەقەکەدا ووشەی (وصیة) بەڕەهاییو موتڵەقی هاتووەو ئەمەیش ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی کە بڕی وەسیەتو، ئەندازەکەی هەرچەند بێت قەیناکا، بەڵام بەڵگە پەیدابووە، لەسەر کۆت کردنیو، (قید) لەسەر دانانی

[1] البقرة (٢٣٤).

[2] النساء (١١).

بەبڕی سێیەك (ثلث)و، بەڵگەی قەیدکردنەکەیش ئەو فەرمووده ناسراوەیە کە لە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)ەوە، گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لێ کرد، کە بە بڕی زیاتر لە سێ یەك (ثلث)، ئەندازەی وەسیەتەکەی دابنێت‌و، سوننەتی ناسراوو بڵاویش (المشهور) لەلایەن حەنەفیەکان‌و غەیری ئەوانیش دەتوانێت، مانا ڕەهاو موتڵەقەکانی قورئان سنوردار (مقید) بکات‌و، کۆتیان لەسەر دابنێت، بەڵام فەرموودەی: (ئاحاد) لەلای جەماوەری زانایان دەتوانێت، مانا موتڵەقەکانی قورئان (مقید) بکات بەڵام لەلای حەنەفیەکان ناتوانێت.

٢٦٥- حوکمی ((مقید)):

کار کردن پێویستە، بەپێی ئەو کۆتەی کە دانراوەو، چی داوادەکات پێویستە پێوەی پابەند بین‌و، کارپێ نەکردنی دروست نییە، مەگەر بەڵگەی لەسەر پەیدا ببێت‌و، نموونەیش وەك ئەو فەرمایشتەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: سەبارەت بە ژنانی نامەحرەم: ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ﴾[1] واتە: ئەو کچانەی کە خۆتان بە خێوتان کردوون، (زڕکچ - کۆڵەبەس) لەو ژنانە بن کە ئێوە چوونە لایان. حەرامن لەسەرتان، لەم ڕوانگەیەوە کچ، حەرامە لەو کەسەی کە دایکی کچەکەی مارەکردووەو، گواستویەتیەوە، واتە: لە گەڵی جووت بووە، و سەرجێیی لەگەڵدا ئەنجامداوە، چونکە حەرامی کچەکە بەستراوەتەوە بەمارەکردنی دایکەکەیەوەو، سەر جێیی لەگەڵدا کرانی، نەك تەنها بە گرێبەستی هاوسەرایەتی، بەڵام ووشەی (في حجورکم) واتە: بەخێوکردنی لەناو ماڵەکانتاندا، ئەمە پەیوەست کردن‌و کۆت کردنێکی پارێز لێکردن (إحتراز)ی نییە بەڵکو پەیوەست‌و (قید)ێکی، زۆرینەییەو، کاریگەری لەسەر حوکمەکە دروست

---

[1] النساء (٢٣).

ناکات، واته زۆرینەی ئەو زرِمندالأنەوان، کە لە ماڵی باوەپیارەدا گەورە دەکریت، نەك لەویّ بوونو لەویّ نەبوونی کاریکاتە سەر حوکمەکە، نەخێرکار ناکاتو لەویش پەروەردە نەکرابێت، مادام دایکی ژنی کابرا بووە ئیتر ئەم کچە لەو کابرایە حەرامە، بە بەڵگەی برگەی دواتری ئایەتەکە کە دەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾[1] واتە: خۆ ئەگەر لەگەڵیان نەخەوتبوون، ئەوە هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە کە کچەکانیان مارە بکەن، واتە: ئەگەر ئەو دایکە مارەکرا، بۆ باب، پاشانو بەر لەگواستنەوە تەڵاقدرا کابرا دەتوانیّ کچەکە مارە بکات، بەڵام پێچەوانەکەی نابێت، جا ئەگەر بوونی کچەکە لەژێر چاودێریو پەروەردەکرانی لەلایەن باوەپیارەوە بەمەرجو کۆت (قید) ئەژمار بکرایە بۆ حەرامی مارەکردنی کچەکە لەلایەن باوەپیارەکەیەوە، بێگومان لەم بەشەی ئایەتەکەداو، لە باسی حەڵاڵ بوونی کچەکە بۆ باوەپیارەکەی، لەکاتی نەگواستنەوەی دایکەکەیداو لابردنی کۆت (قید)ەکەدا، ئاماژەی پێدەکرا کەواتە: کچەکە لای باوەپیارەکەی (زڕ باوك) پەروەردەکرابێت، یان لەلای هەر کەسێکی تر ، هەر کە دایکی سەرجێیی لە گەڵکراو گوازرایەوە، ئیتر هەر لەو پیاوەی مێردی دایکی حەرامەو ناتوانن پێکەوە ببنە هاوسەر .

نموونەیەکی تر، وەك فەرمایشتی خوای پەروەردگار سەبارەت بە کەفارەتی (ظیهار) کە دەفەرموێت: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا﴾[2] واتە: ئەوکەسەی کە کۆیلەی نەبوو ئازادی بکات، لەجیاتی تاوانی (ظیهار) کردن ئەوە دەبێت دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت، بەرلەوەی بەیەك بگەنو، تێکەڵ

[1] النساء (٢٣).

[2] المجادلة (٤).

بن، كە لێرەدا بەرێژوو بوونی دوومانگ، بەستراوەتەوە بەوەوە کە (متتابعین: بەشوێن یەکداو بێ پچڕان) بێت.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك فەرمایشتی پەروەردگار سەبارەت بە کەفارەتی کوشتن بە هەڵە کە دەفەرموێت: (فتحرير رقبة مؤمنة)، کەفارەتەکەی ئازادکردنی بەندەیەکی ئیماندارە، کە ئەم کەفارەتەی لەسەر لا ناچێت، تا ئەم وەصفە لە بەندەکەدا نەبێت کە ئیماندار بوونە، واتە: هەر دەبێت بەندەیەکی ئیماندار ئازاد بکات، نەك غەیرە ئیماندار.

٢٦٦- ئەژمارکردنی موتڵەق لەسەر بابەتی موقەییەد:[1]

جاری وا هەیە کە لەفزێك لە دەقێکدا بە موتڵەق دێتو، هەرهەمان لەفز بە موقەییەدی دێت، لە دەقێکی تردا، ئایا لەم حاڵەتەدا ئەو موتڵەقە لەسەر بابەتی موقەییەدەکە ئەژمار دەکرێتو، دەخرێتە سەر ئەو بەومانایەی کە مەبەست لەو موطلەقە موقەییدەکەبووە، یاخود هەرکار بە موتڵەقایەتیەکەی خۆی دەکرێت، بەو شێوازەی کە لەسەری هاتووەو یان کاریش بە حاڵەتە موقەییەدەکە دەکرێت، لەسەر ئەو شێوازەیو ئەوشتەی کە تەقییدو پەیوەند بوونەکەی بۆ کراوە؟ وەڵامی ئەمەیش ئەوەیە کە پێویستە ئەو حاڵەتانە ڕوون بکرێنەوە، کە لەفزەکەی بەموتڵەق لە دەقەکەدا لەسەر هاتووەو، هەروەها لە وەشییاندا کە لەفزەکەی لە دەقەکەدا بە موقەییەدی لەسەر هاتووە، لەگەڵ حوکمی سەرجەم حاڵەتەکانداو، حاڵەتەکانیش ئەمانەن:

- یەکەم: ئەگەر حوکمی (موطلەق)و موقەییەدەکە یەکێك بوو، هەروەها فاکتەر (سبب)ی، حوکمەکەیش هەریەکێك بوو، ئەوا لەم حاڵەتەدا حوکمی

---

[1] الأمدي، ب٣، ل ٣و دواتر فواتح الرحموت بشرح مسلم الثبوت ب١، ل٣١٦، و دواتر المُسْوَدَّة، ل ١٤٥- ١٤٧، إرشاد الفحول، ل ١٤٥- ١٤٦، لطائف الأشارات، ل ٣٢- ٣٣.

موتڵەقەکە دەخەینە سەر موقەییەدەکە وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرمویت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ﴾[1] واتە: خواردنی گۆشتی مردارەوەبووو، خوێن، و گۆشتی بەرازتان لەسەر حەرام کراوەو، هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾[2] واتە: بڵێ لەو شتانەدا کە خوای گەورە بەسروش بۆی ناردووم، شتێك نابینمەوە کە خواردنی لە کەسێك حەرام بێت بێجگە لە مردارەوە بوو، یان خوێنێکی ڕژێندراو، یان گۆشتی بەراز.

کە لەفزی (دَم: خوێن) لە ئایەتی یەکەمدا بە موتڵەقی هاتووەو، لە ئایەتی دووەمدا بە کۆتو پەیوەنکراوی (مقید)ـی، هاتووە، کە (مسفوح: ڕژێندراو)ی، پێوە بەستراوەتەوەو، حوکمەکە لە هەردوو ئایەتەکەدا یەکێکە، کە حەرامی خواردنی خوێنەو هۆکارو سەبەبی حوکمەکەیش یەکێکە، کە ئەویش ئەو زیانانەیە کە لە خواردنی خوێن توشی مرۆڤ دەبێت، بۆیە لێرەدا موطلەقەکە دەخرێتە سەر موقەییەدەکەو (حمل) دەکرێتە سەری،و مەبەست لەو خوێنەی کە حەرامە بخورێت، خوێنی ڕژاوە نەك غەیری ئەو وەك جگەرو سپڵ،و ئەو خوێنەی کە بەگۆشتەوەو بە ئێسقان،و لەناو ڕەگەکاندا دەمێنێتەوەو، سەرجەم ئەمانە حەلاڵن،و حەرام نین.

– دووەم: ئەوەیە کە (مُطْلَق)و (مقید)، لە حوکمەکەو سەبەبەکەدا جیاواز بن، وەك فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا﴾[3] دەستی دزی پیاوو ژن ببڕن،و، هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت:

---

[1] المائدة (٣).

[2] الأنعام (١٤٥).

[3] المائدة (٣٨).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ﴾[1] واتـه: ئـەی بـاوەڕداران کـە هەسـتان بـۆ نوێـژکردن دەمووچـاوو دەسـتەکانتان تـا ئانیشـکەکان بشـۆن، کەووشـەی (أیدي) لـە ئایـەتی یەکەمـدا بـە موتلـەقی هـاتووەو، لـە ئایـەتی دووەمـدا بـە (موقەییەد)ـی، هـاتووە، کـە (إلـى المرافق)ـی، پێوە بەستراوەو سنوری ئانیشکی بۆ دانراوەو کۆتو بەندی لەسـەرەو حوکمەکانیش جیاوازن، چونکە لە ئایـەتی یەکەمـدا باسـی حـوکمی بڕینـی دەسـتی دزی پیاوو ژنەو، لە ئایەتی دووەمدا باسی حومکی پێویستی شۆرینی دەستەکانەو، هۆکـاری حوکمەکـە لـە ئایـەتی یەکەمـدا دزی کردنـەو، لـە دووەمـدا مەبەسـتی نوێژکردنە، جا لەم حاڵەتەدا موتلەقەکە ناخرێتە سەر موقەییەدەکە، بـەڵکو کـار بـە موتلەقەکە لە جێگای خۆیدا دەکرێتو، هەروەها کاربـە موقەییەدەکـە دەکرێـت، لـە جێگای خۆیـدا، چـونکە بـەهیچ شـێوەیەك پەیوەنـدیو کۆنتاکـت لـە نێـوان بـاس و خواسـی ئـەو دوو دەقـەدا نییـە، و داواکـاری موتلـەق بوونەکـە لـە ئایـەتی یەکەمـدا بریتییە لـەوەی کـە تێکـڕای دەسـتی دز ببڕدرێـت، بـەڕەهایی، بەڵام سـوننەت ئـەم موتلەق بوونەی، موقەییەد کردووە، کەوا هاتووە کە پێغەمبـەر (ﷺ) دەسـتی دزی لە مەچەکدا بڕیوەو ئەم فەرمودەیەش لەلای حەنەفیـەکان بـڵاوە (مشهور)ـە، بۆیـە دروستە کە بەهۆیەوە، بابەتەموتلەقەکانی قورئان موقەییەد بکرێن.

- سێیەم: ئەوەی کە حوکمەکان جیاوازبنو، سەبەبەکان یەکێك بن، ئـەوا لـەم حاڵەتەدا موتلەقەکە هەر لەسەر حاڵـەتی موتلـەق بـوونی خـۆی دەمێنێتـەوەو، لـەو شـوێنەیدا کـە بـۆی هـاتووە. کـاری پێـدەکرێت، وەك فەرمایشـتی قورئـان کـە دەفـــــەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ

---

[1] المائدة (٦).

وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ ﴾[1] و هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ﴾[2] واتە: جا کە ئاوتان دەست نەکەوت بۆ خۆشۆردن، یان بۆ دەستنوێژ، ئەو کاتە بەتۆزێکی پاك تەیەمموم بکەن، ڕومەتو دەستی خۆتانی پێ مەسح بکەن، دووجار دەست بە تۆزەکەدا بدەن بۆ هەردوکیان!.

کە حوکمەکە لەدەقی یەکەمدا، بریتییە لە واجب بوونی شۆردنی دەستەکان کە بە کۆتکراوی (موقەییەد)ـی، هاتووەو، حوکم لە دەقی دووەمدا بریتییە لە مەسح کردنی دەست کە ئەمیش بە موتڵەقی هاتووەو، هۆکاری هەردوو حوکمەکە یەکێکە، کە مەبەست بوونی کابرایە بە جێ بەجێ کردنی نوێژ، لەم حاڵەتەدا موتڵەقەکە ناخرێتە سەر موقەییەدەکە، بەڵکو کاربە هەردووکیان دەکرێت، بەپێی ئەو جێگایەی کە تیایدا هاتووە، موتڵەق بوو، بە موتڵەقی کاری پێدەکرێتو، موقەییەد بوو، بە موقەییەدی کاری پێدەکرێت.

- چوارەم: ئەوەیە کە حوکمی موتڵەقەکەو موقەییەدەکە یەکێك بێت، بەڵام سەبەبو هۆکاری حوکمەکە تیایاندا جیاواز بێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا، کار بە موتڵەقەکە دەکرێت بەو شێوازی موتڵەق بوونەی کە لە جێگاکەدا هاتووەو، هەروەها کار بە موقەییەدەکە دەکرێت، بەو شێوازەی موقەییەدبوونەی کە لە جێگاکەدا هاتووەو، بۆیە موتڵەقەکە ناخرێتە سەر موقەییەدەکە، ئەمە بەڕای حەنەفیو جەعفەرییەکان، بەڵام لەلای غەیری ئەوان وەك شافیعیەکان، موطلەقەکە دەخرێتە سەر موقەییەدەکە، واتە: (حمل) دەکرێتە سەری، نموونەیش وەك

[1] المائدة (٦).

[2] المائدة (٦).

ﻪﺭﻣﺎﻳﺸﺘﻰ ﭘﻪﺭﻭﻩﺭﺩﮔﺎﺭ، ﻟﻪ ﻛﻪﻓﺎﺭﻩﺗﺪﺍﻧﻰ (ﻇﻴﻬﺎﺭ)ﺩﺍ ﻛﻪ ﺩﻩﻓﻪﺭﻣﻮێت: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾[1] ﻛﻪ ﭘێﺸﺘﺮ ﻣﺎﻧﺎﻣﺎﻥ ﻛﺮﺩﻭ، ﻫﻪﺭﻭﻩﻫﺎ ﺩﻩﻓﻪﺭﻣﻮێت: ﺳﻪﺑﺎﺭﻩﺕ ﺑﻪ ﻛﻪﻓﺎﺭﺗﻰ ﻛﻮﺷﺘﻨﻰ ﻫﻪڵﻪ: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾[2] ﻟﻪ ﺩﻩﻗﻰ ﻳﻪﻛﻪﻣﺪﺍ ﺑﻪ ﻣﻮﺗڵﻪﻗﻰ ﻫﺎﺗﻮﻭﻩﻭ، ﻟﻪ ﺩﻩﻗﻰ ﺩﻭﻭﻩﻣﺪﺍ ﺑﻪ ﻣﻮﻗﻪﻳﻴﻪﺩﻯ ﻫﺎﺗﻮﻭﻩ.

ﺑﻪڵﮕﻪﻯ ﺧﺎﻭﻩﻧﻪﻛﺎﻧﻰ ڕﺍﻯ ﺩﻭﻭﻩﻡ: ﺋﻪﻭﻩﻳﻪ ﻛﻪ ﻣﺎﺩﺍﻡ ﺣﻮﻛﻤﻪﻛﻪ ﻳﻪﻛێﻜﻪﻭ ﻪﻓﺰﻩﻛﻪﻳﺶ ﻟﻪ ﺩﻩﻗﻪﻛﻪﺩﺍ ﺑﻪ ﻣﻮﺗڵﻪﻗﻰ ﻫﺎﺗﻮﻭﻩﻭ، ﻟﻪ ﺩﻩﻗێﻜﻰ ﺗﺮﺩﺍ ﺑﻪﻣﻮﻗﻪﻳﻴﻪﺩﻯ ﻫﺎﺗﻮﻭﻩ، ﺋﻪﻭﻩ ﭘێﻮﻳﺴﺘﻪ ﻣﻮﺗڵﻪﻗﻪﻛﻪ (ﺣﻤﻞ) ﺑﻜﺮێﺘﻪ ﺳﻪﺭ ﻣﻮﻗﻪﻳﻴﻪﺩﻩﻛﻪ، ﭼﻮﻧﻜﻪ ﻟﻪ ﺣﻮﻛﻤﻪﻛﻪﺩﺍ ﻳﻪﻛﺴﺎﻧﻦ، ﺗﺎﭘێﭽﻪﻭﺍﻧﻪ ﮔﻪﺭﻯ ڕﻭﻭﻧﻪﺩﺍﺕﻭ ﻫﻪﺭﻭﻩﻫﺎ ﺳﺎﺯﺍﻥﻭ ﭘێﻜﻪﻭﻩ ﮔﻮﻧﺠﺎﻥ ﻟﻪ ﻧێﻮﺍﻥ ﺩﻩﻗﻪﻛﺎﻧﺪﺍ ﺑێﺘﻪﺩﻯ.

ﺑﻪڵﮕﻪﻯ ﺣﻪﻧﻪﻓﻴﻴﻪﻛﺎﻥ ﺋﻪﻭﻩﻳﻪﻛﻪ ﺟﻴﺎﻭﺍﺯﻯ ﺳﻪﺑﻪﺑﻪﻛﻪ ﻫﯚﻛﺎﺭﻩ ﺑﯚ ﻣﻮﺗڵﻪﻕ ﺑﻮﻭﻥﻭ ﻣﻮﻗﻪﻳﻴﻪﺩ ﺑﻮﻭﻥ ﻟﻪ ﻳﻪﻙ ﻛﺎﺗﺪﺍ، ﺑﯚﻳﻪ ﻣﻮﺗڵﻪﻕ ﺑﻮﻭﻥ ﻟﻪ ﺟێﮕﺎﻯ ﺧﯚﻳﺪﺍ ﭘێﻮﻳﺴﺘﻪﻭ، ﺋﺎﺳﺎﻳﻴﻪﻭ ﺩﻩﺑێﺖ ﻭﺍﺑێﺖﻭ، ﻫﻪﺭﻭﻩﻫﺎ ﻣﻮﻗﻪﻳﻴﻪﺩ ﺑﻮﻭﻧﻴﺶ ﻟﻪ ﺟێﮕﺎﻯ ﺧﯚﻳﺪﺍ ﺋﺎﻣﺎﻧﺠﻪﻭ ﭘێﻮﻳﺴﺘﻪﻭ ﺩﻩﺑێﺖ ﻭﺍﺑێﺖ ﺑﯚﻳﻪ ﻟﻪ ﻛﻪﻓﺎﺭﻩﺗﻰ ﻛﻮﺷﺘﻨﻰ ﻫﻪڵﻪﺩﺍ ﭘﻪﻳﻮﻩﺳﺘﻪﻭ ﻛﯚﺕﻭ (ﻗﻴﺪ)ﻯ ﺳﻪﺭ (ﺑﻪﻧﺪﻩ: ﺭﻗﺒﺔ) ﻛﻪ ﺋﻪﻭﻩﻳﻪ ﻛﻪ ﺩﻩﺑێﺖ ﺋﻴﻤﺎﻧﺪﺍﺭ ﺑێﺖ، ﺗﺎ ﻛﺎﺑﺮﺍﻯ ﺑﻜﻮﮊ ﺯﻳﺎﺗﺮ ﺩﮊﻭﺍﺭﻯﻭ ﺳﻪﺧﺘﻰ ﺑﭽﻪﮊێﺖ، ﺑﻪڵﺎﻡ ﻟﻪ (ﻇﻴﻬﺎﺭ)ﺩﺍ ﻛﻪﻓﺎﺭﻩﺕ ﺩﺍﻧﺮﺍﻭﻩ، ﺑﻪﺋﺎﺯﺍﺩﻛﺮﺩﻧﻰ ﺑﻪﻧﺪﻩﻳﻪﻙ ﺑﻪڕﻩﻫﺎﻳﻰ (ﻣﻮﺳﻮڵﻤﺎﻥ ﺑێﺖ ﻳﺎﻥ ﻧﺎ....) ﺋﺎﺳﺎﻳﻴﻪ، ﺗﺎ ﺋﺎﺳﺎﻧﻜﺎﺭﻯ ﺑێﺖ ﻟﻪﺳﻪﺭ ﻛﺎﺑﺮﺍﻯ (ﻇﻴﻬﺎﺭ ﻛﺎﺭ)ﻭ ﻭﻩﻙ ﻫﺎﻭﺧﻪﻣﻰﻭ ﺑﻪﺩﻩﻣﻪﻭﻩ ﺑﻮﻭﻧێﻚ ﺑﯚ ﺑﻪﺭﺩﻩﻭﺍﻣﻰ ﮊﻳﺎﻧﻰ ﻫﺎﻭﺳﻪﺭﺍﻳﻪﺗﻰﻭ ﻧﻪﭘﭽڕﺍﻧﻰ، ﻫﻪﺭﻭﻩﻫﺎ ﺧﺴﺘﻨﻪﺳﻪﺭﻯ ﻣﻮﺗڵﻪﻗﻪﻛﻪ ﺑﯚ ﺳﻪﺭ ﻣﻮﻗﻪﻳﻴﻪﺩﻩﻛﻪ، ﺑﯚ ﻻﺑﺮﺩﻥ ﻭ ﻻﺩﺍﻧﻰ ﭘێﭽﻪﻭﺍﻧﻪ ﺑﻮﻭﻧﻪﻭﻩﻭ ﺩﮋﺍﻳﻪﺗﻴﻴﻪ، ﻟﻪ ﻧێﻮﺍﻥ ﺋﻪﻭ ﺩﻭﻭ ﺩﻩﻗﻪﺩﺍ، ﻟﻪﻛﺎﺕﻭ

---

[1] المجادلة (٣).

[2] النساء (٩٢).

حاڵەتێکدا کە ئەگەر نەدەکرا کاربەناواخنی هەردوو دەقەکە بکرێت و، بەبوونی جیاوازی لەسەبەبەکانیاندا ئیتر دژایەتی و پێچەوانە گەری نایەتە دی و ڕوونادات و، پاساو دروست نابێت و، دەکرێت کار بەهەردووکیان بکرێت لە جێگای خۆیداو بەو شێوازەی کە هاتووە و، قسەی ڕاستتر لەم پرسەدا، برییە لە ڕای حەنەفی و جەعەفەرییەکان.

## (( لقی دووەم ))

## (( باسی ئەمر ))

٢٦٨- ئەمر سەر بە بەشەکانی (خاص)ـە، کە بریتییە لەو لـەفزەی کـە دانـراوە، بۆ داواکردنی کردنی کارێك لە ڕووی زاڵیو باڵایـەتی لایـەنی داواکـاری کارەکـەوە[1] و، داواکردنی کارەکە دێتە جێ بەدەستەواژە ناسـراوەکەی فـەرمانکردن کـە بریتیـە لـە (أفْعَل) یاخود بەدەستەواژەی فیعلی موضاریع کە پیتی لامـی پیـادا لکابێـت یـاخود بـەو ڕسـتە خەبەرییانـەی کـە مەبەسـت پێیـان ئەمرداواکردنـە نـەوەك هەواڵـدانو هەروەها بە شێوازو دەستەواژەی تریش.

نموونـەی یەکـەم: وەك فەرمایشـتی خـوای پـەروەدگار کـە دەفـەرموێت: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ ﴾[2] واتە: بەلادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، نوێژەکـەت بکـە،و

---

[1] (التوضیع)، ب١ ، ل١٤٠، مرقاة الوصول، حاشیة الأزمـیري، ب١ ل ١٥٥- ١٥٦، والأمـدي، ب٢، ل١٠٤، لێرەدا دوو شت تێبینی دەکرێت، یەکەم: ئەو پەیوەندو کۆتەی لـە پێناسـەکەدا هاتووە کە بریتییە لە (علی سبیل الأستعلاء) واتە: دەبێت فـەرمانکار پلەکـەی بـالاتر بێـتو زاڵ بێت بەسەر فەرمان بەسەردا کراودا، ئەمە بۆ دەلالەت کردنە لەسەر ئـەوەی کـە بـەرزیو باڵایەتی لایەنی فەرمانکراو مەرج نییە، بەڵکو مەرج ئەوەیە کە فەرمانکراو خۆی بە بـالاتر، و زاڵـتر بزانێـت، ئـیتر لەواقیعـدا وابێـت، یـان نـا.. هەرچـوونیەکە دووەم شـت ئەوەیـە، کـە ئـەمرکردن، بـەکۆڕای زانایـانو جـەماوەری زانایـان حەقیقەتـە لـە قسـەی تایبـەت (القـول المخصوص)دا، و مەجازە لە فیعلدا، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ ﴾ (هود: ٩٧) ئەمر لێرەدا واتە: فیعل (کردەوە) واتە: کردەوەکەی فیرعەون ژیرانـە نـەبووە، و نەپێکابوو، و سەر بە بابەتی گشتاندنی سەبەبەکەیە، بەسەر سەبەبکارەکەدا، بڕوانە: إرشاد القبول، ل ٩١، المنار و شرحە، ل ١٠٨- ١٠٩، والأمدي، ب٢، ل ١٨٨و دواتر.

[2] الأسراء (٧٨).

هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾[1] واتــە: گوێرایــەڵی خــوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکەن.

نموونــە بـۆ دووەم: وەك فەرمایشـتی پـەروەردگار کـە دەفـەرموێت: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾[2]واتە: ئینجا هەر کەسێکتان مانگی ڕەمەزانی بەسەردا هاتو، ڕێبوارو نەخۆش نەبوو، و بڕوو بیـانووی شـەرعیش نـەبوو دەبێـت بـەڕۆژوو بێـت، و هەروەها وەك فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفـەرموێت: ((مـن کـان یـؤمن بـالله والیوم الأخر فلیقل خـیراً أو لیصـمت)) واتـە: هەرکەسـێك بـاوەڕی بـەخواو بـەڕۆژی دوایی هەیە، یان با قسەی چاك بکات یان با بێدەنگ بێت.

نموونــەی سـێیەم: وەك خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾[3] واتــە: دایکــان تادووســاڵی تــەواو دەتـوانن، شـیر بـە منداڵـەکانیان بـدەن، ئـەو دووسـاڵەیش بۆکەسـێکە کـە بیـەوێت دەورانی شیر پێدان تەواو بکات، دەنا دووساڵ شیر پێدان پێویست نییە!

– ئەوەی ((ئەمر)) داوای دەکاتو پێویستی دەکات[4]:

دەسـتەواژەی (ئـەمر) بۆمانـای زۆر بـە کـار دەهێنرێـت، لەوانـە (واجـب بـوون)و (مەندوب بوون)و (موباح بوون)و (ترساندنو هەڕەشـە)و(ڕێنموونیکردن)و (ئـەدەب دادان)و (دەستە وەستانی)و(نزاکردن)و (مانای تریش).[1]

---

[1] المائدة (٩٢).

[2] البقرة (١٨٥).

[3] البقرة (٢٣٣).

[4] بڕوانە الأمدي، ب ٢، ل ٢٠٧، ء دواتر.

[1] نموونــەی واجــب بــوون، وەك ئایــەتی: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ (النور: ٥٦) واتە: نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن‌و گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن. نموونە بۆ (مەندوب بوون)، وەك ئایــەتی: ﴿فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾ (النــور: ٣٣) واتــە: ئــەو بەندانەی کە دەیانەوێت، خۆ ڕزگار بکەن‌و، لە کۆیلایەتی ئازاد ببن، پسوڵەیان بۆ بنووسن‌و، بیکەنە مانگانە بە سەریانەوە، ئەگەر خێرو چاکەو توانایی کارکردن‌و خۆئازاد کردنتان لێ ببینن، واتە: دەتانزانی ئەمانەت‌و فامیان تێدایەو ناوەڕۆکی پسوڵەتان بۆ جێ بەجێ دەکەن.

– نموونە بۆ ((موباح بوون)) وەك ئایەتی: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ﴾ (المائدە: ٢) واتە: جا هــەر کــەخۆتان حــەڵاڵکردەوە واتــە: ئیحرامتــان شــکاند، و حــەرەمتان جێهێشــت ڕاوو نێچیرگرتننتان بۆ ڕەوایەو دەتوانن ڕاوبکەن.

– نموونە بۆ (هەڕەشە کردن) وەك ئایەتی: ﴿ٱعْمَلُواْ مَا شِئْتُمْ﴾ (فصلت: ٤٠) واتــە: دەســا حەز لەچی دەکەن، بیکەن ئەو جا خۆتان ئەبیننەوە!

– نموونە بۆ (ڕێنمــوونی کــردن) وەك ئایــەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ﴾ (البقرە: ٢٨٢) واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێنــاوە هــەرکات قەرزو قۆڵەی ماوەدارتــان لەگــەڵ یەکتریــدا کــرد وەیــان کڕین‌و فرۆشــتننتان بەقــەرز کــرد بــۆ ماوەیەکی دیاریکراو بینووسن.

– نموونە بۆ (پەروەردەکردن‌و ئەدەب دادان) وەك فەرمایشــتەکەی پێغەمبــەر (ﷺ) بــۆ عەبدوڵڵای کــوڕی عــەبباس (منــداڵ بــوو؟ پێــی فــەرموو: (کــل ممــا یلیــك) واتــە: لەبــەردەمی خۆتەوە بخۆو دەست بەخواردن بکە، نەوەك لەچوار دەورو جێگای ترەوە.

– نموونــە بــۆ (دەستەوســتانی)، وەك ئایــەتی: ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ﴾ (البقــرە/ ٢٣) واتــە: دەی ئەگــەر ئــازان‌و دەستەوســتان نــین ســورەتێکی هاووێنــەی قورئــان بهێــنن بــەڵام بێگومان دەسەوستانن.

– نموونــە بــۆ نزاکــردن، وەك ئایــەتی: ﴿رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ﴾ (نــوح/ ٢٨) واتــە: پێغەمبەر نوح نزای کردو فەرمووی: ئەی پەروەردگارم لەخۆم‌و دایك‌و باوکم خۆش ببە!

ئینجا لەبەر هاتنی (ئەمر) بەو ماناگەلە زۆرانـەوە، لـە دۆزینـەوەی ئەوەیانـدا کـە مەبەست پێی مانا حەقیقییەکەی ئەمرە، ڕاجیایی دروست بووە، لە نێوان زانایانـداو بەدەستەواژەیەکی تر زانایان ڕاجیاییان هەیە، لەسەر ئەو مانایەی کە دەستەواژەی ئەمری بۆ دانراوە، ئەمە لە کاتی داماڵرانی لەو نیشانانەی کە لە مانـا و مەبەستەکە دەگەین، کە ئەمر بوونەکەیە، و کۆکی هەیـە، لـە نێـوان زانایانـدا کـە دەستەواژەی ئەمر لەسەرجەمی ئەو مانایانەدا حەقیقەتی نییـەو، لەغـەیری (واجـب)و (مەنـدوب)و (مووباح بوون)دا، ماناکەی مەجازییەو، حەقیقی نییە کەواتە ڕاجیاییەکە لەسەر ئەم سێ دانە مانایەیە بەو مانایـەی کـە ئایـا ئـەمر لـە بنەڕەتـدا بـۆ ئـەوە دانـراوە، کـە دەلالەت بکـات لەسـەر ئـەو سـێ مانایـە؟ یـاخود لەسـەر هەنـدێکی؟ یـاخود لەسـەر دانەیەکی دیاریکراو یان؟!

هەندێ لەزانایان دەفەرموون: ئەمر هاوبەشە لە نێـوان ئـەو سـێ مانایـەدا، بـەڵام هاوبەش بوونی لەفزیو، مانا، بە مەبەستەکە تیایـدا دەرناکـەوێت، مەگـەر بـە هـۆی ئـامرازێکی یەکلاکـەرەوە (مُـرَجِّح)، هـەروەك بێگومـان حاڵـەتی هـەموو لـەفزێکی هاوبەش هەر بەم جۆرەیە.

---

– نموونە بۆ منەتباری کردن، وەك ئایەتی: ﴿كُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾ (الأنعام/ ١٤٢)، واتە: دەی بخۆن لەوەی کە خودا وەك ڕۆزی پێی داون!

– نموونەی ڕێزگرتن وەك ئایـەتی ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ﴾ (الحجـر/ ٤٦/ ق/ ٣٤) واتـە: هـەموو بەئاسودەیی و ئارامییەوە بچنە ناو بەهەشتەوە.

– نموونـە بـۆ (ریسـواکردن)، وەك فەرمایشـتی پـەروەردگار کـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا دەفـەرموێت: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾﴾ (الـدخان/ ٤٩) واتـە: پێـی دەگوترێت دەبچێژە ئەو سزایە چونکە بەڕاستی تۆ دەسەڵاتدارو پیاو ماقوڵو بـەڕێز بـووین، لەناو هۆزو گرۆهەکەتدا، یان بەلای خۆتەوە!!

هەندێکی تر لەزانایان دەفەرموون: هاوبەشایەتییە لەفزییەکەی ئەمرەکە تەنها لە نێوان (واجب)و (مەندوب)دا، هەیەو ڕووی داوەو، بێ پێچو پەنا پێویستیمان بە ئامرازێکی یەکلایی کەرەوە (مُرَجِّح) هەیە، بۆ دیاری کردنی یەکێکیان.

هەندێکی تر لەزانایان، لەوانە پێشەوا غەزالی دەفەرمون: نازانین کە ئایا ئەمر تەنها لە (واجب) بوونەکەدا حەقیقەتە، یان تەنها لە (مەندوب) بوونەکەدا حەقیقەتە، یاخود بە هاوبەشی لە هەردووکیاندا حەقیقەتە؟ بەم ڕیزبەندە، بەڕای ئەم گروپە ئەمری بێ ناونیشان (قرینة) هیچ جۆرە حوکمێکی نییەو، تەنها ئەوە هەیە کە سەبارەت بەماناکەی هەڵوێستە دەکەین، تاماناکەی ڕۆشن ببێتەوە، چونکە ئەمر بەهۆی ئەوەوە کە مانایی زۆری هەیە، بۆیە سەر بە (مجمل: نادیارەکان)ـە، و لە پێڕی ئەو ئەژمار دەکرێت.

بەڵام زانایان بە گشتی، دەڵێن، کە (ئەمر)، لە یەکێك لەو مانایانەدا، حەقیقی و بنچینەییە، و وەك خۆیەتی و هیچ هاوبەشیی و نادیارییەکی تیادا نییە، بەو مانایەی کە (ئەمر)، لە بنچینەدا دانراوە، بۆ گوزارشت کردن لە یەك مانا، لەو سێ مانایە، جا گوزارشتکردنی لەو مانایە، گوزارشتکردنێکی حەقیقییە، کە لە ئەسڵی دانانی خودی ئەمرەوە وەرگیراوە، و هەڵهێنجراوە، و هەرچی مانای تری هەن، جگە لەم تەنها مانایە، گشتیان بە (خوازراو : مەجاز)ـی، دادەنرێن.

جا ئەو زانایانە سەبارەت بەو تەنها مانا مەجازییە ڕاجیاییان هەیە بۆیە هەندێ لە هاوەڵانی پێشەوا مالیك دەڵێن: ئەوە بۆ موباح بوونەکەیانە، چونکە داوای هاتنەدی کردەوەکەی کردووەو، بەلایەنی کەمەوەی ئەندازەی ئاسودەبەخش لەو داواکردنە، بریتییە لە (موباح) بوونو ژمارەیەکی تر لە زانایان کە یەکێك لە ڕاکانی ئیمامی شافعیش تیادایە، لەسەر ئەوەن کە بۆ (مەندوب) بوونەکەیە چونکە ئەمر بۆ داواکردنی کردنی کارێك دانراوە، بۆیە هەردەبێت، ئەو لایەنە کە لایەنی

داواکردنەکەیە (طلب) بەسەر لایەنی وازلێهێنانیدا (ترك) پێش بخرێت‌و، لای کەمی لایەنی داواکردنیش (مەندوب) بوونە چونکە هەردوو لایەنەکە (طلب)و (ترك)، لە موباح بوونەکەدا یەکسانن، بۆیە ناتوانرێت بگوترێت، کە ئەو مانایە بۆ موباح بوونە.

جەماوەری زانایان دەڵێن : ئەمر بۆ (واجب) بوونە، واتەئەمری ڕەها بۆیە دانراوە، بۆ دەلالەت کردن لەسەر واجبێتی، بۆیە ئەمر لە واجبێتیدا حەقیقەتەو، لە غەیری ئەدا مەجازییەو ناکرێت ئەمر لا بدەین، بۆ غەیری واجب بوون مەگەر بە بوونی بەڵگەو نیشانە، بۆیە ئەگەر نیشانەکە دەلالەتی دەکرد لەسەر (مەندوب) بوون ئەوە داواکاری‌و ئەوەی ئەمرەکە پێویستی دەکات هەر (مەندوب) بوونیەتی‌و ئەگەر نیشانەکە دەلالەتی دەکرد، لە سەر موباح بوون، ئەوە ئەمەی کە ئەمرەکە خوازیارییەتی‌و داوای دەکات، (موباح)ەو، هتد....

و ئەم ڕایەش ڕای ڕاستە، و دەبێت هەر لەسەر بنەمای ئەم ڕایە لە دەقەکان تێ بگەین‌و ئەحکامی لێ دەربهێنین‌و بەڵگەیش لەسەر دروستی ئەم قسەیە زۆرن ئەمانەی خوارەوەیان لێ باس دەکەین[1].

---

[1] المسودة في أصول الفقه، لأبن تيمية، ل ٥، الأحكام، لأبن حزم، ب٣، ل٢٦٣، شرح مسلم الثبوت، ب١، ل٣٧٣- ٣٧٤، إرشاد الفحول، ل ٩٥ التلويح، ل ١٥٣- ١٥٤، كشف الأسرار، ب١، ل١٠٢و دواتر، حاشية الأزميري، و الآمدي، ب٢، ل٢٠٧- ٢١٢، ودواتريش شرح المنار، ل ١٢٣و دواتر، و لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە، ڕاجیایی زانایان سەبارەت بەو حاڵەتانەی کە بۆ ئەمری حەقیقی دانراوە بووەتە هۆکاری ڕاجیاییەکی فراوان بۆ تێگەیشتنی دەقەکان‌و ئەگەر یاساو ڕێسای دەلالەت کردنی ئەمر لەسەر واجبێتی‌و دانرانی بۆ ئەو حاڵەتە دابنێین‌و، بیکەینە یاسای پرسەکە ئەو ڕاجیاییەکە تا ئاستێکی زۆر بەرتەسك دەبێتەوە بەڵام هەر دەمێنێت‌و، لا ناچێت، چونکە کار کردن بەو یاساو ڕێسایە، بەمانای پشت گوێ خستنی ئەو نیشانانە نایەت کە ئەمرەکە لە واجب بوون لا دەبەن‌و دوور دەخەنەوەو، لەبەر ئەوەی کە تێگەیشتن‌و تەماشاکردنی تاکەکان لە هەڵوێست کردنیان‌و زانیاری بونیان لەسەر ئەو

١- لـه قورئـانى پـيرۆزدا هـاتووه: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾[1] واتە: دەبا ئەوانەی كە سەرپێچی لـە فـەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەكەن، بترسن، كە سەرەنجام تووشـی بـەڵاو نـەهاتێك بـبن، يـان تووشی سزايەكی بە ئێش ببـن، ڕەهەنـدی بـە بەڵگـە كردنـی ئـەم ئايەتـە پـيرۆزە ئەوەيە كە دەستەواژەكەی بـە جۆرێكـە، كـە دەبێـت پـارێز بكـەن، لـە گوێڕايـەڵی نەكردنی فەرمانـەكانی پێغەمبـەر (ﷺ)، چـونكە كەسـی ناگوێڕايـەڵ تووشـی بـەڵاو نەهامەتیو سـزای بـەئێش دەبێـتو، بێگومـانو شـتێكی بەڵگـە نەويسـتە كـە تـرس لەبەڵاو ئازار بۆ كارێكە، كە ئەو كارە (واجب) بێت، چونكە لەواز هێنان لەكارو باری غەيرە واجبدا هەڕەشەو ترساندنو تۆقاندن پێويست ناكاتو نييە !

٢- لە سـوننەتدا وەك فەرمايشـتی پێغەمبـەر (ﷺ) كـە دەفـەرموێت: (لـو لا أن أشق على أمتي، لأمـرتهم بالسـواك عنـد كل صـلاة) واتـە: ئەگـەر لەسـەر گەلەكـەم سەخت نەكردايە ئەوا فەرمانم پێدەكردن، كە لەگەڵ كردنی هەموو نوێژێكدا سيواك لە دەميان ڕابدەن، كـە ئەمـە بەڵگـەی واجـب بوونـە، چـونكە ئەگـەر ئەمرەكـە، بـۆ (مەندوب) بوايە، ئەوا ئەو كاتە سيواك كردن مەندوب دەبوو، و لە فەرمان كردن، بـە ئەنجامدانی هيچ سەختیو دژوارييەك ڕووی نەدەدا.

---

نيشانانەی كە لادەرو لابەری حاڵەتی واجبێتین لەئەمرەكەداو، هەروەها سەبارەت بە ئاستی بايەخدار پێيانو، سەرەنج لێدانيانو هەروەها سەبارەت بەو مانايەی كـە ئـەوان دەيگەيـەنن ڕاجياييـان هەيــە لــەم ڕوانگەيــەوە ڕاجيــايی لــە ڕاڤــەكردنی دەقەكانــداو، هــەڵێنجانی ئەحكامەكاندا، هەروەك خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام لە چوار چێوەيەكی تەسكدا ئـەو مانەوەيـە دەردەكەوێت.

[1] النور (٦٣).

٣- پێشینانمان له هاوەڵانو شوێنکەوتووان (خوا لێیان ڕازی بێت) ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، کە دەستەواژەی ئەمر بۆ (واجب) بوون، له چەندەها پێشهاتی بێ شوماردا ئەم ڕاستییان پەیڕەو کردووە مەگەر لە پێشهاتێکدا کە نیشانەیەك هاتبێتە ڕوو، کە له واجبێتی لایدابێت، ئیتر چونیەکە سەرچاوەی ئەمرەکە دەقی قورئانی پیرۆز بووبێت یان دەقی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)و بەبێ نکۆڵی کردن ئەم جۆرە بە بەڵگەکردنە لە ناویاندا زۆر بڵاوو ناسراو بووەو، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر کۆڕای ئەوان لەسەر ئەوەی کە ئەمری موتڵەق بۆ واجبێتی دەبێتو، داواکردنی ئەوشتەی له فەرمانەکەدا داواکراوە، بە پێداگیریو تۆبزی کردنەوەیەو، بۆ مەندووب بوون نییە.

٤- لەو شتانەیدا کە نیشانەی لادەری مانای ئەمرەکەی تیادانییە لە ئەمرەوە بۆنای تر ئەوە واجب بوون له هزری مرۆڤدا سەقامگیر دەکات.

٥- زانایانی زمانەوانی کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەر کەس ویستی داوای کردنی کارێك بکاتو ڕێگری بکات لەنکۆڵی ئەوە بەدەستەواژەی (ئەمر) داوای دەکاتو، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمر بە پێداگیری تەواوەتی دانراوە بۆ داواکردنی ئەنجامدانی کارێك کە ئەویش واجبێتییەو ئەم پرسە ئەو حاڵەیش ڕوون دەکاتەوە کە ئەمر گۆڕانکاری لە کردەوەو فیعلەکاندا دەکاتو، هەموو گۆڕانکارییەکانیش بۆ مانای تایبەتی دانراون، وەك ووشەکانی تری ، وەك ناوەکانو پیتەکان، بۆ نموونە: (رجل)، (زید)، چونکە مەبەست له دانانی قسەو ڕستە، حاڵی کردنی بیسەرە لەمەبەستێك جا کە مەبەستی قسەکەر هێنانەدی ئەو کارە بوو لەلای قسە لەگەڵ کراوو فەرمان پێکراو ، بەشێوەی تۆبزیو پێداگیری ئەمە هەر بەدەستەواژەی ئەمر دەبێتو دێتەدیو، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمر لە

بنەڕەتدا دانراوە بۆ دەلالەت کردن لەسەر ئەو مانایەو گەیاندنی ئەو مانایە بەبیسەر.

٦- زانایانی زمانەوان، کەسی ناگوێڕایەڵیان بۆ فەرمان، بە (العصیان: سەرپێچی کردن) ناوزەد کردووە، و (عصیان)و سەرپێچی کردنیش ناوێکی سەرزەنشت کارانەیەو تەنها لە پرسی واجبێتیدا بەکار دەهێنرێت.

٢٧٠- هاتنی ((ئەمر)) لەدوای ((نەهی: ڕێگرتن))

ئەوانەی کە ڕایان وایە، ئەمر بۆ واجبێتی دەبێت، ڕاجیاییان هەیە لەسەر ئەوەی کە حوکمی ئەمر کردن بە کارێك چییە؟ لەدوای نەهی لێکردنیو حەرام کردنی، بۆیە حەنبەلیو قسەی پێشەوا مالیكو هاوڕێیانیو، ڕای دیاری پێشەوا شافعی، لەسەر ئەوەیە کە لەو حاڵەتەدا دەلالەت دەکات، لەسەر موباح بوونو، لەسەر شتی زیاتر لە موباح بوون دەلالەت ناکاتو، بەڵگەیش بەوە دەهێننەوە، کە لە چەندەها دەقدا بەم شێوازە هاتووە: وەك فەرمایشتی پەروەردگار لە قورئانی کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا﴾[1] کە ئەم فیعلی ئەمری ﴿فَاصْطَادُوا﴾ لە دوای حەرامکردنی ڕاوکردن هاتووە بەو دەقەی قورئان کە فەرموویەتی: ﴿غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ﴾[2] واتە: کاتێك کە لە ئیحرام بەستندان ڕاوکردن بە حەڵاڵ نەزانن، واتە: حەڵاڵ نییەو، کۆکی هەیە، لەسەر ئەوەی کە فەرمان کردن بە ڕاوکردن تەنها دەلالەت لەسەر موباح بوون دەکاتو دەلالەت لەسەر واجبێتی ناکاتو، هەروەها وەك فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن

---

[1] المائدة (٢).

[2] المائدة (١).

﴿فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾[1] واته: لەدوای کردنی نوێژی جومعە بەسەرزەویدا بڵاو ببنەوە، و کارو کاسبی خۆتان بکەن‌و، ئەم دەقەیش لە دوای حەرام کردنی مامەڵە لەکاتی بانگی نوێژی جومعەدا هاتو، (الابتغاء من فضل الله) واتە: پەیداکردن‌و مامەڵەکردن‌و بازرگانییەکانی تر چونکە ئەمانی ڕزقی خودان، بەسەر بەندەکانیەوەو هەرچەندە لەدوای بڕیاری حەرام کردن هاتووە بەڵام هەر بەکۆکبوونی نێوان زانایان، ئیتر ئەومامەڵەیە لە غەیری ئەوکاتەدا موباحە.

زانایانی تریش لەناویاندا حەنەفییەکان بەگشتی ڕایان وایە کە هاتنی (ئەمر) لەدوای قەدەغەو حەرامکردنی بۆ (واجب) بوون دەبێت‌و وەك فەرمانکردن بەکارێك وایە کە هەر لەسەرەتایشەوە حەرام نەکرابێت‌و خاوەنی ئەم ڕایە بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە کە ئەو بەڵگانەی دەلالەت دەکەن لەسەر واجبێتی هیچ جیاوازییان نەکردووە لە نێوان ئەمرێکدا کە دوای حەرامکردنی هاتبێت‌و، ئەمرێکی دیکەدا کە هەر لە بنەڕەتەوە حەرامکردن لە پێشییەوە نەهاتبێت.

ئینجا ئەوەی کە گروپی یەکەم دەیکەنە بەڵگە بۆ ڕاکەیان ناتەواوە، چونکە بەدەستخستنی بەخششی خوداو، ڕاو کردن‌و هاوێنەکانیان کە بۆ بەرژەوەندی ئێمە شەرع بڕیاری لەسەر داون‌و هەر ئەمەیش دەبێتە ئەو نیشانەی کە حوکم لە واجبێتی دەگۆڕێت بۆ موباح بوون، چونکە ئەگەر ئەو کردەوەیە واجب بوایە ئەوا ئەم کاروکردەوانە دەبوونە بار بەسەر مانەوە، نەك ئاسانکاری‌و، بەنەکردنیان تاوانبار دەبووین‌و دواجار ئەم هۆکارە گرفت بۆ بابەتەکەی خۆی دروست دەکات، و ئەمەیش دروست نییە،و ناپەسەندە، بۆیە ئەمری داماڵراو لە نیشانەکانی (ئەمری ڕووت) بۆ واجب بوون دەبێت، ئیتر چونیەکە نەهی لە پێشیەوە هاتبێت، یان نا....

---

[1] الجمعة (١٠).

جا ئەگەر نیشانەیەکی پێوە لکا، کە ماناکەیی گۆڕی، بۆ ئەوەی کە نیشانەکە دەیەوێت ئاساییەو ئەمە هیچ ڕاجیاییەکی لەسەر نییە.

جا هەندێ لە حەنبەلییەکانو هەر ئەم ڕایەش لە لایەن (کەمالی کوڕی هەمام) لە حەنەفییەکان هەڵبژێردراوە، کە دەڵێن: ئەمر لەدوای یاساغ کردن، ئەو یاساغو حەرام کردنە لا دەباتو، حاڵەتە ئاساییەکەی فیعلە فەرمان پێکراوەکە دەگێڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش حەرامو یاساغ کرانەکەی ئەگەر موباح بوبێت هەر موباحی دەکاتەوەو ئەگەر واجب یان سوننەت بووبێت هەر حوکمی واجب یان سوننەتی بۆ دەگێڕێتەوە.[1]

بەڕای من ئەم قسەیەی کۆتایی نزیکترە لە قەبوڵ کردنو، وام بۆ ڕوون بۆتەوەو، ئەوەی بە پێی ئەزموونی هاتنی دەقەکان کە ئەمریان تیادەیەو، ئەمرەکەیش لەدوای نەهی هاتووە، ئەوە جێگیر بووەو سەلمێنەری ئەو ڕا و قسەیەی یەکەمە، جا ڕاوکردن موباح بووە، پێش حەرامکردنی، کە ئەمری لەسەر هاتووە، لەدوای لاچوونی هۆکاری حەرام کردنەکە دەگەڕێتەوە سەر موباح بوونەکەی خۆیو، هەروەها کاسپی کردن بە ئامڕازە دروستەکانی خۆی کارێکی دروستەو موباحە، پێش نەهی لێکردنی لە کاتی بیستنی دەنگی بانگی نوێژی هەینی جا کە ئەمری لەسەر هات، لەدوای لاچوونی ڕێگرەکە دەگەڕێتەوە بۆ موباح بوونەکەی خۆیو، هەروەها شەڕکردن لە غەیری مانگە حەرامەکاندا، واجب بووە لەسەر موسوڵمانان جا کە نەهی لەسەر هات، لە مانگە حەرامەکاندا، بۆیە حەرام بوو، و دواتر کە ئەمر هات بەدەست کردنەوە بە شەڕکردن، دوای تەواوبوونی مانگە حەرامەکان ئیتر حوکمی شەڕکردنەکە دەگەڕێتەوە بۆ واجب بوونەکەی پێش حەرام کرانەکە!

---

[1] شرح مسلم الثبوت، ب١، ل٣٨٠، الأمدي، ب٣، ل٢٦٠– ٢٦٢، المسودة في أصول الفقه لأبن تيمية، ل ١٨.

٢٧١- ئاستی دەلالەت کردنی ئەمر، لەسەر دووبارە کردنەوە: (دلالة الأمر علی التکرار):

(تکرار: دوبارە کردنەوە)، بەو مانایەیە کە کردەوەیەك لە دوای ئەنجام دانی سەر لەنوێو دووبارە ئەنجام بدرێتەوە، جا ئایا ئەو ئەمرکردنە داواکارو خوازیاری ئەوەیە، کە فەرمانپێکراوەکە بە دوبارە،و سەر لەنوێ ئەنجام بدرێتەوە؟ واتە: کارەکە لە دوای ئەنجام درانی. جار لەدوای جار دووبارەبکرێەوە؟ یان نا؟.....!

قسەی هەڵبژێردراو لەم بارەیەوە ئەوەیە کە (ئەمر) دەلالەت ناکات، لەسەر دووبارە کردنەوەی ئەمرپێکراوەکە، چونکە دەستەواژەی ئەمر، تەنها دەلالەت دەکات، لەسەر کردنی کردەوەکە بەرەهایی، بەبێ هەستککردن بەوەی جارێك بکرێت، یان چەند جار دووبارە بکرێتەوە، چونکە ئەمر هەر بۆ ئەو مانایە دانراوە، بۆیە دووبارە کردنەوەی کردەوە فەرمان پێکراوەکە، یاخود یەکجار ئەنجامی بدەیت، ئەمە لە دەرەوەی چوار چێوەی چییەتی (ماهیة)ـی، دەستەواژەی ئەمردایەو لە ڕووی دانانی بنەڕەتی ئەمرەوە، هیچ دەلالەتێکی تیادانییە لەسەر یەکێك لەودوو حاڵە تە، بەڵام ئەگەر هاتنەدی کارە فەرمانپێکراوەکە نەدەهاتەدی،و جێ بەجێ نەدەبوو، بە شتێکی کەمتر لە ئەنجامدانی بە یەکجار، ئیتر ئەو کاتە ئەنجامدانەکە بەیەکجاری تەواو دەبێتە شتێکی پێویست: تا شتە فەرمانپێکراوەکە حاڵەتی هاتنەدی بەسەردا بێ،و، جێ بەجێ ببێت، ئەمە مانای ئەوە نییە، کە دەستەواژەکە خۆی دەلالەتی لە سەر ئەمە کردبێت[1]!

---

[1] المسودة، ل ٢٠، الأحکام، لأبن حزم، ب٣، ل٣١٨، لطائف الأشارات، ل ٢٤، الأمدي، ب٢، ل ٢٢٥، ودواتر، هەندێ لە زانایان دەڵێن: دەستەواژەی ئەمر لە خودی خۆیدا دەلالەت دەکات لەسەر کردنی فەرمان پێکراوەکە تەنها یەکجار، الشوکاني، ل ٩٧.

ئەم ڕوانگەیەوە، ئەمری ڕەھا دەلالەت دەکات، لەسەر تەنھا داواکردنی ڕوودان و کردنی کردەوە فەرمان پێکراوەکەو، بۆ ھێنانەدی گوێڕایەڵی کردنی ئەو فەرمانە، حێ بەجێ کردنی داواکە تەنھا یەك جار بەسە، مەگەر نیشانەیەکی پێوە بێت کە دەلالەت بکات، لەسەر ویستی دووبارە کردنەوەی، وەك ئەوەی مەرجەکە ھەڵپەسێردرابێت، بە ئەمرەکەوە، یاخود صیفەتی پێوە بەسترابێتو، شەرع ئەو مەرجو صیفەتانەی بەسەبەب ئەژمار کردبێت، بۆ فەرمان پێکراوەکە وەك، ھەڵواسینی فەرمان کردن بە دەست نوێژگرتن، بە پرۆسەی ویستنی نوێژکردنەوە، ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگاردا کە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ﴾[1] کە دووبارە کردنەوەی گرتنەوەی دەست نوێژ پەیوەستە بە دووبارە بوونەوەی ھۆکارو سەبەبەکەیەوە کە کردنی نوێژە، نەوەك بە خودی ئەمرەکەوەو، ھەروەھا وەك ئایەتی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾[2] کە لێرەیشدا فەرمان کردن بەشەلاقدانی کەسی داوێن پیس پەیوەستەو پشتی بەستووە بە ھاتنەدی ھۆکارەکەوە کە داوێن پیسی کردنە، ھەر کە کردەوەی داوێن پیس کردنەکە دووبارە بوویەوە شەلاقدانەکەیش دووبارە دەبێتەوە بۆیە دووبارە کردنەوە لێرەدا لەسەر بنەمای دووبارە بوونەوەی ھۆکاری شەلاقدانەکە وەستاوە نەوەك بەخودی ئەمرکردن بە شەلاقدانەکەوە[3].

---

[1] المائدة (٦).

[2] النور (٢).

[3] الأمدي ب٢، ل٢٢٥– ٢٣٦، الشوكاني، ل٩٧.

له بەرامبەر ئەم رایە هەڵبژێردراوەدا، قسەی تریش هەر لە بەرامبەر ئەم رایە هەڵبژێردراوە، هەر گوتراون، لەوانە، کە ئەمر خوازیارو داواکاری دووبارە کردنەوەی کارەکەیە لەسەر جەمی تەمەنداو، بەپێی بۆ گونجان، مەگەر بەڵگەیەك پەیدا ببێتو، ڕێگری لە دووبارە کردنەوەی بگرێت، ئەمەیش ڕای هەندێ لە هاوەڵانی پێشەوا شافیعیو، زۆرینەی حەنبەلییەکانەو، هەر ئەمانەیش بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە هەر ئەمە تێگەیشتنی زمانەوانیانەی دەستەواژەی ئەمرەو، ئەمە مەفهومەکەیەتی، چونکە گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە خوای پەروەردگار حەجی لەسەر ئێوە واجب کردووە پیاوێك لە موسوڵمانان هەڵسایەوەو، گووتی: ئایا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو ساڵێکدا لەسەرمان واجبە؟ جا پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: ئەگەر بموتایە بەڵێ: ئەوا هەموو ساڵێ لەسەر شانتان واجب دەبوو، و ئەگەر واجبیش ببوایە، ئەوا کارتان پێ نەدەکردو، توانای ئەوەتان نەبوو، کە هەموو ساڵێك ئەنجامی بدەن بۆیە حەج کردن یەکجار واجبەو لە جارێك زیاتر خۆبەخشانەیە، و سوننەتە، و خێری زیادەیە بۆ ئەنجامدەرەکەی.

ڕەهەندی بە بەڵگەکردنی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە کابرای پرسیارکەر زمانی عەرەبی زانیوەو، دواجار ئەگەر ئەو ئەمر کردنە لە ڕووی زمانەوانییەوە خوازیاری دووبارەکردنەوەی نەبوایە بێگومان ئەم پیاوە ئەم پرسیارەی نەدەکردو، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیارەکەی بەهەڵە لە قەڵەم دەدا![1].

لە ڕاستیشدا ئەم بەڵگە هێنانەوەیە لاوازەو، نابێتە بەڵگە بۆ ڕاکەیان، چونکە دەکرێت کە بگوترێت کە ئەو فەرموودەیە دەبێتە بەڵگە لەسەر ڕای پێچەوانەی ئەو ڕایەی ئەوان، چونکە ئەگەر ئەمر کردن لە ڕووی زمانەوانییەوە دەلالەتی لەسەر

---

[1] شرح المنار، ودواتر، شرح مسلم الثبوت، ل ٣٨٤، المسودة ل ٢٠.

دووبارەکردنــەوە (تکــرار) بکردایــە ئــیتر بۆچــی ئــەو پرســیارە دەکــرا؟و ئایــا پرسیارەکەی ئەم کابرایە بەڵگە نییە لەسـەر ئـەوەی کـە مانـای زمانـەوانی (ئـەمر)، تەنها داواکردنی کارەکەیە، نەوەك دووبارە کردنەوەی، و کابرا ویستوویەتی جەخت لەسەر مانەوەی ئـەو مانـاو مەفهومـە بکاتـەوە سـەبارەت بـە حـەجکردن، و یـاخود گاندنی بە پەرستشە دووبارە بووەکانی تری وەك نوێژو زەکات؟! چونکە دەزانـین هەندێ پـەرستش هەن، وەك نوێژو ڕۆژووو، زەکات، بە دووبارە بوونـەوەی کاتـەکان ئەمانیش دووبارە دەبنەوەو، حەجیش بەستراوە بەکاتو شوێنەوەو لـەو پەرستشـە دووبارانە دەچێتو لێکچوون لە نێوانیاندا هەیـە، بۆیـە کارەکـەی لێ تێکـەڵ بـووەو، گرفتی تیادا دروست بووە کە ئایا لە ڕووی کاتەوە لەوان دەچێت چونکە ئەمیش بـە کاتەوە پەیوەستە یاخود لەوان ناچێت، بەهۆی ئەوەی کە پەیوەستە بـە شـوێنێکی تـرەوە؟ بۆیـە بـۆ ڕەواندنـەوەی ئـەم گرفـتو لێکچـونانە، پرسـیاری ئاراسـتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد.

٢٧٢- ئاستی دەلالەت کردنی ئەمر لەسەر ((زوو بـەجێ گەیانـدنی)) یـان لەسـەر ((بەشێنەیی)) جێ بەجێ کردنی: (دلالة الأمر، على الفورية، أو التراخي):

ئایا ئـەمر کـردن دەلالـەت دەکـات، لەسـەر کردنـی کـارە فـەرمان پێکراوەکـە بـە زوویی، یان لە سەرخۆییو هێواشی؟! ئەمـە لـە لای شـەرعزانان ڕاجیـایی لەسـەرە، ئەوانەی کە ڕایان وایە، ئەمر بۆ دووبارە کردنەوەیە، هەر ئـەوانیش ڕایـان وایـە، کـە ئەمر دەبێت بە زوویی جی بەجێ بکرێـت، بـەڵام غـەیری ئـەوان دەڵێن: ئـەمر، یـان بەستراوەتەوە بەکاتەوە، و یان نەبەستراوەتەوەو، ئـەوەیش کـە بەسـتراوەتەوە بـە کاتـەوە یـان، بـە کـاتێکی فراوانـەوە بەسـتراوەتەوە، یـان بـە کـاتێکی بەرتەسـكو سنوردارەوە، جا ئەوەیان کە بەکاتێکی فراوانەوە بەستراوەتەوە دروسـتە ئەمرەکـە تیایدا دوا بخرێت، بۆ کۆتایی کاتەکەی، واتە: دروستە دواخستنی جێ بەجێ کردنـی

واجبەکە، بۆ کۆتـایی ئـەو کاتـەی بـۆی دانـراوە بـەڵام ئـەو ئـەمرەی، کـە کاتەکـەی بەرتەسكو سنووردارە دروست نییە جێ بەجێ کردنی ئەمرەکەی دوابخرێـت، ئینجـا ئەو ئەمرەی کـە نەبەسـتراوەتەوە بـەکاتێکی دیـاریکراوەوە وەك ئـەمرکردن بـەدانی کەفارەتەکان، ئەوە تەنها بۆ داخوازی کردنی ئەنجامـدانی کارەکەیـە لـەداهاتوودا، دروستە دوابخرێت واتە: کردنی کارە فەرمان پێکراوەکە بە شێنەیی‌و هێواشـی هـەر وەك دروستە بەزوویی‌و ڕاستەوخۆیش ئەنجام بـدرێت‌و، ئەمـەیش ڕای ڕاسـتە لـەلای حەنەفی‌و جەعفەری‌و هاوڕاکانیان‌و، قسـەی لـە پێشـتر (ڕاجیح)ـە، لـەلای ئێمـەش، چونکە دەستەواژەی ئەمر تەنها دەلالـەت دەکـات، لەسـەر داواکردنـی کردنـی کـارە فەرمان پێکراوەکە لە کاتی داهاتوودا، لەهەر بەشێکی ئەو کاتەی ئاینـدەدا بکرێـت. ئاساییە‌و، بە بوونی نیشانە لە ئەمرەکەدا، (زوو کردنی) بڕیاری لەسەر درابێت، وەك ئەوەی کە کەسێك بەخزمەتکارەکەی خۆی بڵێت، ئـاوی خواردنـەوەم بـۆ بێنـە، کـە نەریت وایە، کە داواکردنی ئاو تەنها لە کاتی پێویستی تێنوێتیدا دەبێـت، کـە خـۆی لە خۆیـدا ئـەم ئـەمرە دەلالـەت دەکـات لەسـەر (زوو هێنـان)و جـێ بـەجێ کردنـی، چونکە نیشانە لە حاڵەتەکەدا هەیە، کە تینوویەتییە.

هەر چەندە ئەمر بـۆ هێواشـی‌و شـێنەیی دەبێـت‌و بـۆ (زووکـردن) نـەبێت، بـەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هەر بەزوویی جێ بەجێ کردنی‌و پەلەکردن لە کردنی ئـەو واجبـەدا باشترە لە دواخسـتنی، چـونکە گرفـت لـە دواخسـتندا دروسـت دەبێـت‌و نەهامـەتی بەدواوەیە‌و، بۆی هەیە کە مرۆڤـ، پێش ئەوەی بەکردنی واجبەکە ڕا بگات، بمرێـت، چونکە گۆڕانکارییەکانی داهاتوو نادیارن‌و، بەدەستی خودای پەروەردگارن‌و، لە بەر ئـەم هۆکارەیـە، زوو ئەنجامـدانیان باشـترە‌و سـوننەتێکی جوانـە، خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ

﴿تَخۡتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾﴾[1] واتە: بە پەلە بۆ کردنی کارەخێرەکان پێشبڕکێ بکەن‌و، ڕابن، چونکە سەرەنجامی هەمووتان بۆلای خوای گەورەیەو، بۆلای ئەو دەگەڕێنەوەو، ئەوەیش لەسەر ئەو شتانەی کە ڕاجیاییتان لەسەری هەبوو ئاگادارتان دەکاتەوەو، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾[2] واتە: بۆ لای لێخۆشبوونی خودا پەلە بکەن، ڕابن، کە لەفزی (فاستبقوا)و، (سارعوا) دەلالەت دەکەن لەسەر باشی‌و جوانی دەستپێشخەری کردن بۆ ئەنجامدانی کردەوە واجبەکان‌و، دەلالەت ناکەن لەسەر واجبێتی، چونکە بەکەسێك کە واجب لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدات، بە (مستبق: پێشبڕکێ کار) یان، (مسارع: خێرا جێ بەجێ کار) ناگوترێت![3].

٢٧٣- ئەو کارەی تەواو کاری کارێکی واجب بێت ئەویش دەبێتە واجب، (ما لا یتم الواجب إلا به، فهو واجب)[4].

پێشتر زانیمان، کە ئەمر بۆ واجب بوونی کارە فەرمان پێکراوەکەیە، واتە: بەدیهێنان‌و جێ بەجێ کردنی کارە داواکراوەکە، بەشێوەی تەواوو پابەندی ڕەهاوەو، ئەو کردەوە ئەمر پێکراوەیش سەبارەت بەکەسی فەرمان پێکراوو قسە لەگەڵ کراو (مخاطب) بووەتە کارێکی واجب، بەڵام جێ بەجێ کردنی کارە فەرمان پێکراوەکە، کە واجبیبەکەیە، جاری وا هەیە، پێویستی بەوە هەیە، کەشتێکی تری لەگەڵدا ئەنجام بدرێت‌و، ئەنجام دانی ئەم واجبە، لەسەر ئەو کارەی تر وەستاوەو

---

[1] المائدة (٤٨).

[2] آل عمران (١٣٣).

[3] شرح مسلم الثبوت، ب١، ل٢٨٨- ٢٨٩، شرح المنار، ل ٢٢٢و دواتر.

[4] تیسیر التحریر، ب٢، ل ٣٦٥و دواتر، المستصفی، الأمام الغزالي، ب١، ل ٧١- ٧٢، المسودة في أصول الفقه، ل ٦٥.

بێ ئەو ناکرێت، ئایا ئەو شتەی تریش دەبێتە واجب؟ بەهەمان ئەو ئەمرە یەکەمینەی کە واجبە بنەڕەتیەکەی جێگیر کردووە؟ یان نا...؟! بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستمان بە درێژە باسێك لەم بارەیەوە هەیەو، دەڵێین: ئەو شتەی کە هێنانەدی واجبەکەی لەسەر وەستاوە دوو بەشە:

– بەشی یەکەم: ئەوەیە کە لە توانای کەسی موکەللەفدا نییە، کە ئەنجامی بدات، وەك توانا بوون بۆ جێ بەجێ کردنی حەجی واجب‌و، گەیشتنی ئەندازەی سامان بەپلەی زەکاتدان‌و، کامڵ بوونی ژمارەی پێویست بۆ کردنی نوێژی هەینی‌و، هتد.. ئەم بەشە مرۆڤ نەخراوەتە ژێر بەندوباری جێ بەجێ کردنی‌و، نەکراوەتە ئەرك لەسەر شانی‌و، ئەمرەکەیش نایگرێتەوە، بۆیە لەسەر کەسی موکەللەف واجب نییە، کە بچێت (توانا) بهێنێتەدی، تاحەج بکات‌و یاخود ئەندازەی زەکاتدان دروست بکات تا زەکات بدات، یاخود ژمارەی پێویستی کردنی نوێژی هەینی دەستەبەر بکات، لەبەر خاتری دروستی جێ بەجێ کردنی نوێژی هەینی، واتە: ئەمانە دەبێت خۆرسك بن‌و دروستکراو نەبن.

– بەشی دووەم: ئەوەیەکە ئەوشتە لە توانای کەسی موکەللەفدا هەبێت، کە جێ بەجێی بکات‌و، ئەمیش دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: ئەوەیە کە سەبارەت بەواجب بوونی ئەمرێکی تایبەت هاتووە ئەمەیان قسەمان تیایدا نییەو، ناچێتە ناو بابەتی ئەم پرس و ڕاوێژەی ئێمەوە، و مەبەستی ئەم توێژینەوەیەی ئێستا، ئێمەیش نییە، نموونەی ئەم جۆرەیش وەك دەستنوێژ گرتن، بۆ نوێژ، کە بە فەرمانێکی سەربەخۆ لەسەر کەسی موکەللەف واجب کراوە، نەوەك بە ئایەتی: ﴿وأقیموا الصلوة﴾ بەڵکو بە فەرمانێکی سەر بەخۆ، کە بریتییە لە ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى

﴿ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾[1] كە تیایدا بە فەرمانێكی سەربەخۆ دەست نوێـژگرتن، واجـب كـراوە بـۆ بەرپاكردنی نوێژێكی دروست.

جۆری دووەم: ئەوشتەیە كـە جـێ بـەجێ كردنـی واجبێكـی لەسـەر وەسـتاوەو، ئـەمری تایبـەت لەسـەر واجـب بـوونی دەرنـەكراوەو، ئەمـەیش مەبەسـتی ئـەو پرسیارەمانە كە پێشتر كردمانو، زانایانی زانستی ئوصولّی فیقهـ، بڕیاریـان لەسـەر ئـەوە داوە كـە ئـەم جـۆرە واجبـە، بەهـەمان ئـەو ئـەمرەی یەكـەم: كـە واجبـە بنەڕەتیەكەی پێ واجب بووەو، نموونەیش لەسەر ئەمە زۆرن.

وەك فەرمان كردن بەحەج كردن، كە پێویستی بە گەشتكردن بۆ شاری مەككـەی پیرۆز هەیـە، بـۆ جـێ بـەجێ كردنـی ئـەو واجبـە، كەواتـە ئـەو گەشـتكردنە واجبـە، بەهەمان ئـەو ئـەمرەی كـە بـۆ حـەج دەرچـووە، چـونكە واجبـی حـەج بـەو گەشـتە نەبێت، ناكرێتو جێ بەجێ نابێتو، هەروەها فـەرمان كـردن بـە نوێـژی بـە كۆمـەڵ ((لەسەر ڕای ئەوانەی كە نوێژی بەكۆمەڵ بە واجب دەزانـن))، تـەنها بـەجۆرێك دێتـە جێ كە بچێت بـۆ مزگـەوت، كەواتـە ئـەو چـوونە بەهـەمان فـەرمانی واجبـی نوێـژی بەكۆمەڵ، ئەویش واجـب دەبێـتو هـەروەها فـەرمانی كـردن بـەئامادەكردنی هێـزی پێویسـت لەلایـەن گـەلی ئیسـلامەوە، بـەم ئایەتـە چەسـپاوە، كـە دەفـەرموێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾[2] واتــە: بــەپێی توانــای خۆتــان، هێــز ئامادەبكـەن، بـۆ دوژمنـانی ئیسـلام، بێگومـان ئـەم فەرمانـە بـەهۆی فێـر بـوونی ئامرازەكانی سەردەمەوە دەبێتو، دێتـە جـێ، كـە لـە بـواری پیشەسـازیو كیمیـاو فیزیاو هتد.... هەنو، دەبێت فێریان ببن، ئەگەر نا.. هاتنەدی فەرمانەكە فەراهەم

---

[1] المائدة (٦).

[2] الأنفال (٦٠).

نابێت کەواتە: فێر بوونی ئەو زانستانە واجبەو دەبێت ژمارەیەك لە موسولمانەکان خۆیانی فێر کەن، هەر بە هەمان ئەو فەرمانەی کە بڕیاری لەسەر ئامادەسازی جەنگی دابوو، و هەروەها فەرمانکردن بە دادپەروەری لە نێوان خەڵکیداو، لادانی ستەم لەسەریان ئەم حاڵەتە پێویستی بە دانانی دادوەر هەیە، تا هەڵسن بە ئەرکی پێویستی فەراهەم کردنی دادپەروەری، کەواتە دواجار دانانی قازییەکان، بەهەمان فەرمانی بڵاوکردنەوەی دادپەروەری ئەویش دەبێتە واجب، هتد...

پوختەی قسەکانی ڕابردوو ئەمەیە، کە ئەمرکردن بە شتێکی واجب، ئەمرە بۆ ئەو شتەیش کە کردنی ئەو واجبەی لەسەر وەستاوە، و بێ ئەو نایەتەدی، ئەمە ئەگەر فەرمانێکی تایبەتی لەسەر نەهاتبوو!

## ((لقى سێيەم))

## ((باسى بەرلێگرتن: النهي))

نەهى لەزمانى عەرەبيدا، بەمانانى (منع: ڕێ لێگرتن) دێتو عەقڵيش بە (نهية) ناوزەد كراوە، چونكە بەر گرىو ڕێگرى دەكات، لە خاوەنەكەى لە كەوتنەناو، ئەو شتانەى كە ڕاستو دروست نين.

لە زاراوەى ئوصولّدا، داواكردنى وازهێنانە لە كردەوەيەك لە ڕووى بالآيەتى داواكارەوەو، بەدەستەواژە گەلێك كە دەلالەت بكەن لەسەر ئەو بەر پێ گرتنە.

لە دەستەواژەكانى (نەهى)، ئەو دەستەواژەى ناسراوو بلآوەى (لاتفعل: مەكە)يە، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ﴾[1] و هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾[2] واتە: لەدواى سێ تەلآقە ژنەكەى بۆحەلآلّ نييە مەگەر شويەكى تر بكاتو تەلآق بدرێت، بە ئارەزووى خۆى ئينجا كابراى يەكەم دەتوانێت لەدواى تەواوكردنى عيددەكەى مارەى بكاتەوە ئەم باسە باسى (تەحليل)ى شەرعييە، كە قورئان باسى كردووە.

هەروەها دەربڕينى لەفزى وا كە لە خودى خۆيدا دەلالەت بكات، لەسەر نەهى كردنو حەرام كران، وەك ئايەتى: ﴿وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ﴾[3] واتە: لە كردنى كارە خراپو ناشيرينەكان ڕێگرى دەكاتو هەروەها پەروەردگار دەفەرموێن:

---

[1] الأسراء (٣٢.)

[2] البقرة (٢٣٠).

[3] النحل (٩٠).

﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمۡ أُمَّهَٰتُكُمۡ وَبَنَاتُكُمۡ ﴾[1] واته: ماره كردنی دایكو كچه‌كانتان له‌سه‌ر ئێوه حه‌رامن.

جاری وا هه‌یه كه (نه‌هی) كردن، به به‌كار هێنانی ده‌سته‌واژه‌ی ئه‌مر كه ده‌لاله‌ت بكات، له‌سه‌ر نه‌هیكردن ده‌رده‌كه‌وێت، وه‌ك فه‌رمایشتی په‌روه‌ردگار: ﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ﴾[2] واته: واز له گوناهه ئاشكراو په‌نهانه‌كانیش بهێنن.

٢٧٥- ئه‌وه‌ی ((نه‌هی)) ده‌یخوازێتو ده‌یهێنێته دی:[3]

ده‌سته‌واژه‌ی نه‌هی بۆ چه‌ند مانایه‌ك به‌كار هێنراوه، وه‌ك حه‌رامكردنو مه‌كروهـ بوونو، نزا، بێزاریو ڕێنموونی كردنو هی تریش، نموونه بۆ یه‌كه‌م، وه‌ك ئایه‌تی: ﴿وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ ﴾[4] واته: كه‌سێك مه‌كوژن، كه خودا حه‌رامی كردووه مه‌گه‌ر به‌هه‌ق بێت، بۆ نموونه كه‌سێكی به‌ده‌ست ئه‌نقه‌ست كوشتبێتو، نموونه بۆ دووه‌م: وه‌ك ئه‌م فه‌رمایشته‌ی كه ده‌فه‌رموێت: (لا تصلّوا في مبارك الأبل) واته: له گه‌وری حوشتره‌كاندا نوێژ مه‌كه‌نو، نموونه بۆ سێیه‌م وه‌ك فه‌رمایشتی خودا كه ده‌فه‌رموێت: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا ﴾[5] واته: په‌روه‌دگارا له‌دوای ڕێنموونی كردنمان، دڵه‌كانمان تووشی سه‌رگه‌ردانیو ژه‌نگی

---

[1] النساء (٢٣).

[2] الأنعام (١٢٠).

[3] منهاج الوصولَ الى علم الأصول، للأمام البيضاوي، ل ٤٩، المسودة، ل ٨٢، إرشاد الفحول ، ٩٦، الأمدي، ب٢، ل ٢٧٤- ٢٧٥.

[4] الأنعام (١٥١)- الأسراء (٣٣).

[5] آل عمران (٨).

تاوان نەکەیتەوەو، نموونە بۆ چوارەم: وەك ئایەتی: ﴿لَا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ﴾[1] واتە: ئەی بێ باوەڕان ئەمڕۆ پاساوو بیانو مەهێننەوە بۆ پێنجەمیش وەك ئایەتی: ﴿لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾[2].پرسیار لەشت گەلێکی وامەکەن، کە ئەگەر وەڵامەکەیتان بۆ ڕوون بوویەوە سەخت بێت لەسەر شانتان، و دوا جار بۆتان خراپ، و کێشەدار بێت.

بە هۆی ئەو مانا جیاوازانەوە کە (نەهی) هەیەتی، زانایان سەبارەت بە مانا حەقیقییەکەی (نەهی) ڕاجیاییان تێکەوتووە، دەربارەی ئەو شتەی کە (نەهی) پێویستی دەکات، و دەربارەی حوکمی (نەهی)، و هەروەها دەربارەی ئەو شتەی کە (نەهی) گوزارشتی لێوە دەکات، ئەگەر نیشانەی پێوە نەبوو، جا گروپێك لە زانایان گوتویانە،(نەهی) گوزارشت دەکات، لە (ناباشی:کەڕاهەت)، و هەر ئەمەیش مانا حەقیقییەکەیەتی، و گوزارشت ناکات، لە هیچ شتێکی تر، مەگەر بە بوونی نیشانە، و زانایانی تریش گوتویانە،کە (نەهی) هاوبەشە، لە نێوان (ناباشی:کەڕاهەت)، و (یاساغی:حەرامێتی)دا، و هەر ئەمەیش مانا ئەسڵییەکەیەتی، و نیشانە ئەو شتەیە کە ئاراستەی ئەو نەهییە، دەگۆڕێت، بۆ لای یەکێك لەو مانایانە، و جەماوەری زانایان گوتویانە، کە ئەو شتەی کە (نەهی) پێویستی دەکات، بریتییە لە(یاساغی:حەرامێتی)، و ئەمە هەمان ئەو مانا حەقیقییەیە کە لە بنەڕەتدا دانراوە بۆی، و لە بۆ غەیری ئەمە بەکار ناهێنرێت، مەگەر بەناڕاستەو خۆ (مەجاز)ی، و نیشانەیش ئەو شتەیە کە دەلالەت دەکات، لەسەر ویستنی ئەو ماناڕاستەو خۆو مەجازییە، بەڵام ئەگەر داماڵرابوو، لە نیشانەکان، ئەوە تەنها

---

[1] التحريم (٧).

[2] المائدة (١٠١).

حەرام بوونی لێ دافامرێتەوەو هیچی ترو، قسەی جەماوەری زانایانیش ڕای لە پێشتر (ڕاجیح)ـە، چونکە دەستەواژەی نەهی، بۆ دانراوە، تا دەلالەت بکات، لەسەر داواکردنی وازهێنان لەکردنی کارێك، بە داواکردنێکی پێداگیریانەو، عەقڵیش لەوە تێدەگات، کە تۆبزیو پێداگیری تەواو لەدەستەواژەی نەهی داماڵراو لە نیشانەکان دەفامرێتەوەو، هەر ئەمەیش کە مانای حەرام بوون دەگەیەنێتو، پاڵپشتی ئەم ڕایەش ئەوەیە کە پێشینەکانمان (هاوەڵانو شوێنکەوتووانو، شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان)، "خوا لێیان ڕازی بێت"، دەستەواژەی نەهی بێ نیشانەیان بە حەرام ئەژمار کردووە.

٢٧٦- ئایا نەهی کردن، داواکاری بەپەلە جێ بەجێ کردنی ئەو نەهییەیە؟و خوازیاری دووبارە کردنەوەیەتی؟ ((هل يقضي النهي الفور والتكرار))؟[1]

هەندێ لە زانایان ڕایان وایە، کە نەهی بەو دەستەواژەیەی خۆی دەلالەت ناکات، لەسەر زوو بەجێ گەیاندنی، یان دووبارە کردنەوەی، چونکە هەر سروشت ئەوە ناخوازێتو، بەڵکو ئەو حاڵەتە کاتێك دەبێت، کە ئامادەیەك لە دەرەوەی دەستەواژەکە پەیدا ببێت، واتە: نیشانەیەك هەبێت کە دەلالەت بکات لەسەر زوو کردنی و دووبارەکردنەوەی! و هەندێکی تر لە زانایان ڕایان وایە، کە نەهی لە بنەڕەتدا مانای زوو ئەنجام گەیاندنو دووبارە کردنەوەی تیادایە، واتە: دووبارە کردنەوەی واز هێنان، لە کارە نەهی لێکراوەکەو، بەردەوام: بوون لەم وازهێنانە لەسەرجەمی کاتەکاندا هەروەك خوازیاری واز هێنان لە کارەکەیە، بە زوویی‌و، ڕاستەو خۆ، جا کەشەرع نەهی کرد لە کەسی موکەللەف لەکردنی کارێك، ئەوە ئەو کەسە موکەللەفە لەسەر شانیەتیو پێویستە ڕاستەوخۆو بە بەردەوامی واز لەو کارە بهێنێت، چونکە فەرمانبەرداری لە پرۆسەی نەهیدا، بە دەسپێشخەری بە پەلە

[1] المسودة، ل٨١، لطائف الأرشارات، ل ٢٥، الأمدي، ب٢، ل ٢٨٤و دواتر.

لەنەکردنی ئەو کارەو، هەروەها بە بەردەوام بوون لەسەر نەکردنەکە دێتەدی‌و، هەروەها ئەو کردەوەیە بۆیە شەرع نەهی لێکردووە، چونکە خراپەو، لابردنی ئەو خراپەیەش تەنها بە دوورکەوتنەوە دەبێت لێی، بەپەلەو راستەوخۆو، بەهەمیشەیی‌و، ئێمەیش هەر ئەم رایە لە لەپێشتر دەزانین‌و پەسەندی دەکەین.

٢٧٧- ئایا نەهیکردن، نیشانەیە بۆ خراپی نەهی لێکراو؟[1]

هەروەك گوتمان، کە لەسەر رای لە پێشتر ((نەهی)) مانای حەرامکردن دەگەیەنێت، ئەگەر دەستەواژەکەی لە نیشانە داماڵرابوو، ئیتر بۆ کەسی موکەللەف دروست نییە، ئەو کارە نەهی لێکراوە ئەنجام بدات.

دەنا تووشی تاوان‌و سزای رۆژی پەسڵان دەبێتەوە، ئەمە پاداشتەکەیەتی لە رۆژی دواییدا، بەڵام ئایا نەهیکردن نیشانەیە بۆ خراپی نەهی لێکراو جا ئەگەر ئەونەهی لێکراوە سەربە پەرستشەکان یان مامەڵەکان بوو، ئەو نەهییە نیشانەو هۆکارە بۆ خراپی نەهی لێکراو، جا ئەگەر کارە نەهی لێکراوەکە بە شێوەیەکی دروست جێ بەجێ بکرێت، ئەوا شوێنەوارو بڕیارەکانی شەرع لەسەر نەهییەکە پەیوەندی پێیانەوە دروست ناکات؟ زانایان سەبارەت بەم پرسە راجیاییان هەیە، قسەکانیان پوخت دەکەینەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا:

- یەکەم: ئەگەر نەهی رووبەرووی شتێك کرایەوە، کە کاریگەری هەبێت، لەسەر حەقیقەتی فیعلەکەو چوار چێوە شەرعییەکەی وەك نەهی کردن لە فرۆشتنی بەچکەی ئاژەڵ، لە ناوسکی دایکیدا، یاخود فرۆشتنی شتی نادیارو، نەبوو، یاخود نەهی کردن، لە نوێژ، بە بێ دەستنوێژ، یان مارەکردنی دایکان، ئەوا نەهی کردن لەم حاڵەتەدا، فەراهەم هێنەری ئەو راستییەیە، کە نەهی لێکراوەکە خراپەو، بەتاڵەو، وەك شتێکی (نەبوو)، تەماشادەکرێت، بوون‌و نەبوونی یەکێکەو،

---

[1] لطائف الأشارات، ل ٢٥- ٢٦، إرشاد الفحول، ل ٩٨، الأمدي ب٢، ل٢٧٥و دواتر.

بێگومان شتی نادیارو نەبوویش هیچ ڕێو شوێنێکی شەرعیی لەسەر ناگیرێتەبەر، هەر وەك چۆن شتی نادیاریش، دروستیش بێت، هەر حسابی شەرعی بوونی بۆ ناکرێت جا ئەم جۆرەی نەهی لێکردن ئەوەیە کە هەندێ لە زانایان بەم جۆرە دەری دەبڕن کە: بریتییە لەو شتەی شەرع لەبەر خودی خۆی نەهی لێکردووە، واتە: لەبەر زاتیو خودی فیعلەکە یان بەشێکی نەهی لێ کردووە، نەوەك لەبەر شتی تر.

- دووەم: ئەگەر نەهی کردنەکە ڕووبە ڕووی خودی شتە نەهی لێکراوەکە نەبوبێتەوە، بەڵکو ئاڕاستەی کارێکی پەیوەست پێوەی یان هاوشانی کرابێت، بەڵام وەك پێویستی بۆ کردنی کارەکە نەبێت، وەك نەهی کردن لە مامەڵە کردن لە کاتی بانگی نوێژی هەینیداو، هەروەها وەك نوێژکردن لە زەوی داگیرکراودا، کە کاریگەری نەهییەکە لێرەدا، کەراهەتی کردەوەکەیە، نەك خراپیو بەتاڵی کردەوەکە، بەو مانایەی کە کردەوە ڕێو شوێنە شەرعییەکانی لەسەر دەگیرێتەبەر، کە شەرع بۆی داناوە، هەرچەندە کەراهەتیشی هەیە چونکە شەرع نەهی لێکردووەو، ئەمەش ڕای جەماوەری شەرعزانانەو، هەندێکی کەمیان وەك ظاهیرییەکان، ڕایان وایە، کە لەم حاڵەتەدا کردەوەکە خراپە، چونکە نەهی لەلای ئەمان بۆ خراپی نەهی لێکراوەکە دەگەڕێتەوە، ئیتر چونیەکە ئەو نەهی کردنە ئاڕاستەی خودی کردەوەکەو، بناغەکەی کرابێت، یان ئاڕاستەی کارێکی وا بەستە پێوەی!

- سێیەم: ئەگەر نەهییەکە لە حەقیقەتی خۆیدا، هەڵگری هەندێ لەو خەسڵەتانە بوو، کە پێویست بوون، بۆ بوونو هاتنەدی ئەو کردەوەیەو، ئاڕاستەی خودی کردەوەکەو حەقیقەتەکەی نەکرابوون، وەك نەهی کردن لە مامەڵەکردن بە نرخێك کە لە ئایندەدا نرخەکە بدرێتو، ئەو ئایندەیەیش دیاری نەکرێت، کە کەی؟ دەبێت، و هەروەها وەك کڕینو فرۆشتن بە مەرجی خراپو بەسەرچوو (فاسد)و هەروەها وەك، بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی جەژندا، جا جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە

ئەو کردەوەیە خراپو بەتاڵە، بەڵام حەنەفییەکان جیای دەکەنەوەو، دەڵێن ئەگەر کردەوەکە لە پەرستشەکان بوو، ئەوە خراپو بەتاڵەو، ئەگەر سەر بەبابەتی کڕینو فرۆشتن بوو، ئەوە خراپە، بەڵام بەتاڵ نابێتەوەو، لەلای ئەمان شتی خراپ (فاسد) هەندێ بڕیارو ڕێو شوێنی شەرعی لەسەر دەگیرێتە بەر، بە پێچەوانەی بەتاڵەوە، کە هیچ بڕیارو ڕێو شوێنێکی شەرعی لەسەر ناگیرێتە بەرو، بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە، پەرستشەکان بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکانو ئاستی گوێڕایەڵیانو بە دەمەوەچوونیان بۆ فەرمانەکانی پەروەردگارو ملکەچ کردنە بۆی، تا خودا لێی ڕازی بێتو، هیچ ڕێگایەکیش نییە، بۆگەیشتن بەم حاڵەتە جگە لە جێ بەجێ کردنیان بەو شێوازەی کە شەرع داوای کردووەو، ئەم جێ بەجێ کردنەیش بەو شێوازەی کە داواکراوە، کاتێك دێتەدی، کە نابێت هیچ جۆرە دژایەتیو پێچەوانەگەری نەلە خودی کردەوەکەداو، نەلە وەصفەکەیدا هەبێتو هەر لەبەر ئەمەیش حاڵەتی (فساد) لە پەرستشەکاندا، وەك بەتاڵ بوون وایەو، لەلای ئەمان (فاسد)، وەك (بەتاڵ) وایە.

بەڵام سەبارەت بە مامەڵەکردن (معاملات) مەبەست لەم مامەڵانە پراکتیزە کردنی بەرژەوەندی مرۆڤەکانەو ڕێو شوێنی مامەڵەکردنیش لەسەر پایەو مەرجەکانی وەستاوە ئەگەر ئەو پایانە هاتنەجێ، ئەوە مامەڵەکەیش جێگیر بووەو، کیانی خۆیی دەستکەوتووەو، ئەو کیان و بوونەیش کاتێك تەواوو کاملە، کەسەرجەم خەسڵەتەکانی بەکاملیو تێروتەسەلی تیایدا هاتبنەدیو، لەم حاڵەتەدا تەندروستەو تەواوەو، جاری وامەیە کە بوونەکەی ناتەواوە، چونکە ئەو خەسڵەتانەی کەمو کورییان تیادایەو، لەم حاڵەتەیشدا بۆی هەیە، هەر بەرژەوەندییەکی بە هۆوە بێتەدیو، بۆیە پێویستیشە کە هەندێ ڕێو شوێنی شەرعی لەسەر بگیرێتە بەرو، ئەمە مانای (فاسد)ـە، کە قۆناغێکە لە نێوان بەتاڵو دروست (صحیح)دا.

وەك بڵێی کە حەنەفییەکان لەسەر بنەمای بوون‌و کیانی کردەوەکە مافیان پێداوە لە ڕەچاوکردنیداو، مافی نەهی کردنیشیان واداوە، کە هەندێ لە خەسڵەتەکانی کردەوەکەی لەدەستداوە، بۆیە بڕیاری (فاسد) بوونیان لەسەر داوە نەك بەتاڵ بوونەوەی.

پێشەوا شەوکانی دەفەرموێت: ((هەق وایە کە هەموو جۆرە نەهی کردنێك، بەبێ جیاوازی لە نێوان پەرستشەکان‌و مامەڵەکاندا، خوازیاری حەرامکردنی شتە نەهی لێکراوە کە بێت، هەروەها خوازیاری خراپ (فاسد) بوونی، ئەو شەتەنەهی لێکراوەیەو ئەمەیش شەرع داوای کردووە، ئەو فەسادەی کە هاومانای بەتاڵ بوونەو، لەم مانایە لانادرێت، مەگەر بەڵگەیەك پەیدا ببێت، کە بیسەلمێنێت، داوای ئەمە ناکاتو، نموونەی بەڵگەی ئەم قسەیە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((كل أمر ليس عليه أمرنا فهورد)) واتە: هەرکردەوەیەك لەسەر ڕێ‌و ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت ئەوە بەر پەرچ دەدرێتەوەو، بێگومان شتی نەهی لێکراویش، لە سەر غەیری ڕەوت و ڕێ و ڕێبازی پێغەمبەرە (ﷺ)، بۆیە ڕەتکراوەیەو، بەر پەرچ دەدرێتەوەو، هەر شتێکیش بەر پەرچدراوە بوو، بەتاڵەو، ئەمەیش هەمان ئەو ماناو مەبەستەیە کە هەیە، لەوەدا کە نەهی کردن خوازیاری ئەو حاڵەتەیە، کە نەهی لێکراو شتێکی خراپەو فاسیدە.[1]

---

[1] إرشاد الفحول، ٩٧- ٩٨.

## (( مەبەستی دووەم ))

## باسی (( عام ))

٢٧٨- پێناسەی (عام: گشتی):

((عـام)) لـە زمـانی عەرەبیـدا، بـەمانای شـتی گشـتی دێـت، بـەڵام گشـتییەکی ژمێردراوو، قسەی عەرەبەکانیش کە دەڵێن: ((عمَّهم الخیـر)) مەبەستیان ئەوەیە کە خەیرو بەرەکەت ئەوانی گرتۆتەوە.

لە زاراوەی زایانانی زانستی ئوصوڵی فیقهـدا، ئـەو لەفزەیـە کـە سـەرجەمی ئـەو شـتانەی کـە دەگـونجێن بـۆی دەگرێتـە خـۆ، بەیـەك شـێوازی گرتنـە خـۆو، بـەبێ سنوور.[1]

مانـای ئەمـەیش ئەوەیـە کـە ((عـام)) لەفزێکـە لـە زمانـدا بەیـەك جـۆر، واتـە بەتەنهایی، نەوەك بە ژمێردراو، دانراوە تا سـەراپای ئـەو تاکانـەی کە لـە مـەفهومو مانای خۆیدا بەرجەستەن بگرێتـەوە، واتـە: سـەرجەمی ئـەو بوارانـەی کـە ماناکـەی بەسەریاندا جێ بەجێ دەبێت بگرێتەوە بەبێ سنوردار کردنـی بـەژمارەی دیـاریکراو واتە: نابێت لەفزەکە بە جۆرێك بێت کـە دەلالـەت بکـات لەسـەر سـنووردار کردنـی بـەژمارەی دیـاریکراو، هەرچـەندە لـە دەرەوەو، لـە جیهـانی واقیعـدا سـنووردارو دیاریکراو بێت، وەك بۆ نموونە ئاسمانەکانو، زانایانی وڵات.

لەم ڕوانگەیەوە، بۆ نموونە، ووشەی ((رجال)) لەفزێکی عامە، چـونکە لـە زمـانی عەرەبیدا، یەك جۆردانـانی بـۆ دانـراوە، بەمەبەسـتی دەلالـەت کـردن لەسـەر گرتنـە

---

[1] البیضاوي، ل٥٠، المحلاوي، ل٣٦، المسودة، ل٥٧٤، الأمدي، ب٢، ل٢٨٦- ٢٨٧.

خۆی سەرجەمی ئەو تاکانەی کە مانای ئەم لەفزەیان بەسەردا جێ بەجێ دەبێـتو، بەیەکجاریش![1]

- **لەفزەکانی ((عام))**:[2]

ئەو لەفزانەی کە دەلالەت دەکەن، لەسـەر (عـام) زۆرن، ناسـراوترینیان ئەمانـەی لای خوارەوەن:

- یەکەم: لەفزەکانی (کـل)و (جمیـع)، کـە لـەو شـتەیدا کـە دراوەتـە پاڵیـان، مانـای (عـام) بـوونو گشـتی بـوونی تیـادا بەرجەسـتە دەکـەن، وەك فەرمایشـتی پەروەردگار کە دەفەرموێت: (کل نفس ذائقة الموت) واتە: دەبێت هـەموو گیانـدارێك بەبێ جیاوازی، بمرێتو، تاڵاوی مەرگ بچـەژێتو، هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾﴾[3] واتـە: هـەموو کەسـێك بارمتـەی کـار و کـردەوەی خۆیـەتیو، گوناهی کەسی تر نادرێت بەسەریداو، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((کـل راع مسؤول عن رعیتە)) هەموو کاربەدەستو چاودێرێ بـەر پرسـیارە لـە ئـەحواڵی ژێردەستەکانی.

- دووەم: ئەو جەمعەی کە ئەلفو لامی ((الأستغراق: سەراپاگیر))ی چـووبێتە سەرو بە هۆیەوە بوبێتـە مەعریفـە (ناسـراو) یـاخود ئـەلفو لامـی ئیضـافـەی پێـوە لکابێتو بوبێتە مەعریفە.

---

[1] لـە پێناسـەی عامـەوە، جیـاوازی نێـوان عـامو (مطلـق: ڕەهـا) دەردەکـەوێت. کـە عـام، سەرجەم تاکەکانی خۆی دەگرێتەوە، بەڵام بە یەکجار، لـە کاتێکدا کـە موتڵـەق بـە یـەکجار تاکەکانی خۆی، یان چەند تاکێکی بڵاوو ناسراو بەگشتی دەگرێتە خۆی، نەوەك هەموویان.

[2] المحلاوي، ل٦٥، ودواتر، المسودة، ل ٨٩.

[3] الطور (٢١).

- نموونـەی یەکـەم: وەك ئایـەتی ﴿إن الله يحب المحسنين﴾ خـودا سـەراپای چـاکە کـارانی خـۆش دەوێـت واتـە: بەگشـتیو بـێ زیـادو کـەم، هـەروەها دەفـەرموێت:﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ ﴾[1] واتە: دایکان تا دووساڵی تەواو دەتوانن شیر بە منداڵەکانیان بدەن، واتە: نابێت لە دوو ساڵ تێپەڕێ، خۆ ئەگەر لەو ماوەیە کەمتر بێت، قەیناکات چونکە دەتوانن ئەویش بەپێی بارو نەریتی ناوچەکەو بەرژەوەندی خۆیان ڕەچاوی بکەن، ئەو دووساڵەیش بۆ کەسێکە کە بیەوێت دەورانی شیرپێدان تەواو بکات، ئەگینا دوو ساڵ شیر پێدان پێویست نییە، بەڵێ لەسەر باوك پێویستە شیردەرێك بۆ منداڵەکەی پەیدا بکات، ئیتر دایکی منداڵەکە خۆی بێت یان هەر ژنێکی تر بێت، دیارە هەر دایکەکەی خۆی چاکترە، هەر چەندە تەڵاقیش درابێت.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك ئەوەی کە قورئان دەفەرموێت: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ ﴾[2] واتە: لەو کەلەپورەی کە لەدوای باوكو دایكو خزمانی نزیك جێ دەمێنێ نێرینە بەشی خۆی هەیە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ ﴾[3] واتە: ئەو ژنانەی پاش چوونەلایان، تەڵاق دران تاسێ پاکیی دەبێت خۆیان بگرنو مێرد نەکەنەوە.

کە ئەو لەفزە جەمعانەی لەم دەقانەدا هاتوون، مانای گرتنە خۆی سەراپای تاکەکانی ئەو جەمعانە دەگەیەنن، بەڵام جەمعە نەناسراو (نەکیرە)کانی وەك

---

[1] البقرة (٢٣٣).

[2] النساء (٧).

[3] البقرة (٢٢٨).

(مسلمين)، (رجال)، ئەمانە مانای گشتی بوون (عموم) ناگەیەنن، بەڵکو لایەنی کەمی جەمع دەگرنەوە، کە (سێ)دانەیە[1].

نموونەی ئەوەی کە بەهۆی ئیضافەکردنەوە بوو بێتە موعریفە وەك ئایەتی: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمۡ أُمَّهَٰتُكُمۡ﴾[2] هەروەها ئایەتی: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةً﴾[3] واتە: زەکات لە سامانەکەیان وەربگرەو هەروەها ئایەتی: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾[4] ئیتر گرنگ نییە، کە ئەو جومعە موزەککەری سالم بێت، یان جەمعی مۆنثی سالم، یان جەمعی تەکسیر،و سەرجەمیان لەو لەفزانەن، کە مانای (عام) دەگەیەنن، ئەگەر بەهۆی ئەلفو لامی (إستغراق) یان بەهۆی ئیضافەکردنەوە بووبنە ناسراو (معرفة).

سێیەم: ئەو تاکو (مُفرَد)ەی، کە بەهۆی ئەو ئەلفو لامەوە کە مانای (إستغراق)ی، تیادا دەفامرێتەوە، بووبێتە مەعریفە (ناسراو). وەك فەرمایشتی پەروەردگار کە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣﴾[5] کە لەفزی (إنسان) لێرەدا، تەواوی تاکەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە هەروەها وەك ئایەتی: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ﴾[6]و، هەروەها وەك: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ

---

[1] المسودة، ل١٠٥.
[2] النساء (٢٣).
[3] التوبة (١٠٣).
[4] النساء (١١).
[5] العصر (١-٣).
[6] البقرة (٢٧٥).

﴿وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾[1] و هەروەها وەك: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾[2] ئەم ئایەتانە زۆر جار پێشتر کردوومانن بە کوردی بۆیە پێویست ناکات هەموو جارێك ماناکانیان دووبارە بکەینەوە هەروەها نموونەیەکی تر وەك ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ)، واتە، دواخستنی دانەوەی قەرز، یان داواکاری بۆ کەسی داراو توانا ستەمەو، تاوانەو، دەبێت ڕاستەوخۆ جێ بەجێی بکات.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە ئەو موفرەدەی کە بەهۆی ئەلف و لامەوە بووەتە مەعریفە، سەر بە لەفزەکانی گشتگیرییە، (عام)ـە، بەمەرجێك کە ئەو ئەلف و لامە، بۆ (عەهد)و (جینس) نەبێت، جا ئەگەر بۆ یەکێك لەم دووانە بوو ئەوا ئەوکاتە لەفزەکە، سەر بە لەفزەکانی عام نییەو، نابێت، نموونەی ئەلف و لامی عەهدی وەك. ووشەی (الرسول) لە ئایەتی: ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ﴾[3] واتە: هەر وەك چۆن بۆلای فیرعەونیش پەیامبەرێکمان کە (موسایە) ناردو ڕەوانە کرد، تا تێی بگەیەنێت، جا فیرعەون سەر پێچی کرد، لە پەیامبەرەکەو لە فەرمانی دەرچوو، و بڕوای نەهێناو داوای خوایەتی دەکرد!

نموونەی ئەلف و لامی جینسی، وەك لەفزی (الرجل)و (المرءة) لەم قسەیەدا کە دەڵێت: (الرجل خير من "المرءة")، واتە، پیاو لەژن باشترە، واتە: جنسی پیاو چاکترە لە جنسی ژن، کە لێرەدا ووشەی (الرجل)و یان ووشەی(المرءة) مانای گشتی بوون (عموم) ناگەیەنن، کە لێرەدا بە باشتر دانانەکە، کە بەگشتی وایە بە

---

[1] النور (٢).

[2] المائدة (٣٨).

[3] المزمل (١٥– ١٦).

گشتی پیاو له ژن باشتره، نهك بهتاك، چونكه ژنی وا ههیه، بهتاك له پیاو زۆر باشتره.

- چوارهم: ئهو موفرهدهی كه بههۆی ئیضافهركردنهوه بووهته مهعریفه، وهك فهرمایشتی پهروهردگار له قورئانی پیرۆزدا كه دهفهرموێت: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ﴾[1] واته: ئهگهر بتانهوێ نازو نیعمهتهكانی خوای پهروهردگار ئهژمار بكهن، ناتوانن، چونكه له ژماره نایهن، هێنده زۆرو فراوانن، ههروهها وهك فهرمایشتی پێغهمبهر (ﷺ) كه دهفهرموێت (هو الطهور ماؤه، الحل میتته)، واته: ئاوی دهریا پاكه، و مردارهوبوویشی حهڵاڵه، كه ماسی و نهههنگهكانن، كه ئهم فهرموودهیه دهلالهت دهكات لهسهر سهرجهمی جۆرهكانی مردووی ناو دهریا.

- پێنجهم: ئیسمه مهوصولهكان، وهك لهم ئایهته پیرۆزهدا كه دهفهرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾﴾[2] و ههروهها وهك ئایهتی: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ﴾[3] بێجگه لهوانه رێتان پێدراوه، كه به ماڵو دارایی خۆتان ئافرهتی تر تا چوار ماره بكهن بهشێوهی شهرعی.

كه ووشهی (ما) ههموو ژنێ دهگرێتهوه جگه لهوانهی كه حهرامنو پێش ئهم ئایهته باسی كردوون.

---

[1] إبراهيم (٣٤)، النحل (١٨٠).

[2] النساء (١٠).

[3] النساء (٢٤).

هـەروەها قورئـان دەفـەرموێت: ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾[1] و ئایـەتی: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ ﴾[2] و ئایـەتی: ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾[3]، ﴿وَٱلَّٰتِى تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ ﴾[4] واتە: جا ئەو ژنانەی کە ئێوە لەسـەر پێچـی کردنیـانو مـل نـەدانیان دەترسـن جـا لـەو حاڵەتـەدا بـۆ یەکـەمجار ئامۆژگارییان بکەنو، لە خودا بیانترسێنن.

شەشەم: ئەو ناوانەی کە بۆ پرسیار کردنو قوڵاخ کردن بە کار دەهێنـرێن، واتـە: (أسماء الأستفهام) وەك (من) لە فەرمایشتی خوادا کـە دەفـەرموێت: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾[5] واتە: کێ مـاڵی خـۆی بەقـەرز دەدات بـە خـودا؟ لـە پێنـاوی سەرخسـتنی دینـی خـوادا، بەخشـینێکی چـاكو پـاكو، بـەدڵو دەرونێکـی پـڕ لـە سۆزەوە؟!

حەوتەم: ((أسماء الشرط))، وەك (مـن)، و (مـا)، و (أیـن)، وەك ئایـەتی: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾[6] و ئایــــەتی: ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ﴾[7] و ئایــەتی: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴾[8] و

---

[1] النحل (٩٦).

[2] الطلاق (٤).

[3] النساء (٢٢).

[4] النساء (٣٤).

[5] البقرة (٢٤٥) الحدید (١١).

[6] البقرة (١٨٥).

[7] البقرة (١٩٧)

[8] النساء (٩٣).

ئایەتی: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ۝٨﴾[1] و ئایەتی: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾[2] واتە: دڵنیایش بن، لەهەر جێگایەکدا بن، مردن پێتان دەگات، ئەگەر لەناو کۆشكو قەڵای سەختو قایمیشدا بن، هەر دەمرن!

هەشتەم: ئەو ناوە نەناسراو (نەکیرە)یەی، کە لە دوتوێی (نەفی)و (نەهی)دا، هاتبێت وەك فەرمایشتی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا﴾[3] واتە: هەرگیز نوێژ لەسەر کەسێ لەو دووڕووانە مەکە، کاتێك کە دەمرن.

و پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لا يقتل والد بولود)، واتە: ئەگەر باوك کوڕەکەی خۆیی کوشت، ئەوا لە جیاتی ئەو کوشتنەی تۆڵەی لێ ناکرێتەوەو، ناکوژرێتەوەو، هەروەها فەرموویەتی: (لا وصية لوارث) واتە: وەسیەتی پەیوەندیدار، بە سامانەوە کاریگەری دروست ناکات، لەبەشی میراتبەرەکان، واتە: وەسیەت لە شەرعدا سنوری بۆ دیاری کراوەو، نابێت لەو سنورە زیاتر بێتو، هەروەها فەرموویەتی: (لا ضرر، وَ لا ضِرار)، واتە: کەس مافی زیان گەیاندنی بە خەڵکی نییەو، و قەرەبوو کردنەوەی زیان، بە زیان گەیاندن دروست نییەو نابێت، و ئەمەیش بە ڕووکەش (ظاهراً)، مانای گشتی بوون (عموم) دەگەیەنێت، ئەگەر تیایدا، لەفزی (من) بوونی نەبێتو، ئەگەر پیتی (من)ـی، چوبێتە سەر، ئەوا بەیەکلایی (قطعاً) مانای (عام)ی هەیەو، هیچ ماناو باسو خواسێکی تر (تأويل)

---

[1] الزلزلة (٧– ٨).

[2] النساء (٧٨).

[3] التوبة (٨٤).

کردن هەڵناگرێت، وەك ئەم ڕستەیەی تۆ کە دەڵێیت: (ما رأیت من رجل)، واتە: هیچ پیاوێکم بە قەطعی چاو پێ نەکەتووە، و یان (ما جاءنی من أحد) هیچ کەسێك بە قەطعی نەهاتووە، بۆ لای من[1].

بەڵام سەبارەت بەناوی نەناسراو (نەکیرە)یەك، کە لە دووتوێی چەسپاندنی ڕاستییەکدا (إثبات) هاتبێت ئەمە سەر بەلەفزەکانی (عام) نییە، وەك فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةً﴾[2] واتە: خودا فەرمانی پێکردوون، کە مانگایەك سەر ببڕن، جاری وا هەیە کە بە هۆی نیشانەیەکەوە دەلالەت دەکات لەسەر گشتی (عام) بوون وەك فەرمایشتی پەروەردگار سەبارەت بە نازو نیعمەتەکانی بەهەشتو دانیشتوانی بەهەشت، کە دەفەرموێت: ﴿ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ۝٥٧ ﴾[3] واتە: چیتان دەوێت لە میوەو چی دڵتان دەیخوازێت لەبەهەشتدا هەیە، کە (فاکهة: میوە) لێرەدا سەرجەمی جۆرەکانی میوە دەگرێتەوە بە نیشانەی ئەوەی کە مانای نازو منەت کردن بەسەر بەندەکاندا تیایدا دەفامرێتەوەو، هەروەها ئەگەر لە دوو توێی شەرتدا بێت، هەر گوزارشت و دەلالەت لە (عام) بوون دەکات وەك ڕستەی (من یأتني بأسیر فله دینار)، هەرکەس گیراوێکم بۆ بێنێ، دینارێکی دەدەمێ، کە هەموو گیراو (أسیر)ێك، دەگرێتەوە[4].

---

[1] المسودة، ل ١٠٣.

[2] البقرة (٦٧).

[3] یس (٥٧).

[4] المسودة، ل ١٠٣

٢٨٠- گرتنە خۆی مێینەکانیش لە چوار چێوەی ئەو فەرمان (خطاب)انەیدا، کە ئاراستەی نێرینەکان کراون:

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە لەفزەکانی جەمع، لە ڕووی دەلالەت کردنیان لەسەر نێرینەو مێینە، دەبنە چەند بەشێکەوە:

لەوانە، ئەوەیانە کە تایبەتە بە دەلالەت کردن تەنها لەسەر پیاوان، نەوەك ژنان، و بە پێچەوانەیشەوە هەیە، مەگەر بەڵگەیەکی دەرەکی لە لەفزەکە، ئەو ڕەوتەی پێ بگۆڕدرێت، وەك لەفزی (رجل) کە تایبەتە بە نێرینەو لەفزی (نساء) کە تایبەتە بە مێینە، و بە بەڵگەیەکی دەرەکی لە چوار چێوەی لەفزەکە نەبێت ناتوانین مانای هیچکامیان بدەینە پاڵ ئەوی تر.

بەشێکی تر ئەوەیە کە بەپێی دانانەکەی نێرینەو مێینەش دەگرێتەوە ئەویش ئەوەیە کە هیچ نیشانەیەکی نێرینە یان مێینە تیایدا دەرنەکەوتووە، وەك (الناس: خەڵکی) و(الأنس: مرۆڤەکان)و، (البشر: مرۆڤــ).

بەشێکی تریشیان ئەوەیە کە لە ڕووی ئەسڵی دانانی لەفزەکەوە نێر یان مێ یان هەردووکیان دەگرێتەوە، واتە: پەیوەستە بە مانا بنەڕەتیەکەیەوەو، بە ڕوونکردنەوە نەبێت. ناتوانرێت تایبەت بکرێت بە یەکێکیانەوەو، ئەمەیش وەك، (ما)و (من).

بەشێکی تریشیان ئەوەیە کە وەك (مسلمات) کە نیشانەی مۆنثی هەیەو، جەمعی مۆنثی سالمەو، هەندێکی تر وەك (مسلمون) کە نیشانەی موزەککەری پێوەیە، و خۆی جەمعی موزەککەری سالمە، بە کار هێنراون.

هەروەها وەك بەکار هێنانی پیتی (واو)، لە جەمعەکانی موزەککەرداو، پیتی (نون) لە جەمعەکانی مۆنثداو، نمونە بۆ یەکەم، وەك (فعلوا)و، نموونەی دووەم:

وەك، (فعلْنَ)، ئایا ئەم جەمعانە دوو جۆری نێرینەو مێیە دەگرنەوە؟ یاخود هەر جەمعەو تایبەتە بەوەی کە نیشانەی جەمعەکە دەلالەتی لەسەر دەکات؟!

جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە هەریەکەیانو تایبەتە بە گروپێکی دیاریکراوو، ئەو گروپەیان کە تایبەتە بەپیاوان، ئیتر ژنان ناگرێتەوە، مەگەر بەڵگەیەك پەیدا ببێت، هەر وەك ئەو گروپەیشیان کە تایبەتە بە ژنان، ئیتر پیاوان ناگرێتەوە، مەگەر دیسان بەڵگەیەك پاڵپشتی لێوە بکات.

چونکە ناوەکان بۆیە دانراون، تا دەلالەت بکەن، لەسەر ئەو شتانەی کە بوونەتە (ناو) بۆیانو، بەهۆی ئەم دانانەوەو ئەم جێگیر کردنەوە، هەموو جۆرێك بۆ خۆیو لە جۆرەکانی تر جیا کراوەتەوە، بەڵام جاری وا هەیە کە بەڵگە پەیدا دەبن، کە ئەو بەڵگەو نیشانانە پاڵپشتی دەکەن، لەسەر ئەوەی کە ئەو باسی تایبەت بە پیاوان، ژنانیش دەگرێتەوە، وەك ئەوەی کە نیشانەکان پاڵپشتی لەوە دەکەن، کە شەرع بۆ سەرجەمی مرۆڤەکان بە نێرو مێوە دانراوەو، جاری وایش هەیە، کە نیشانە لە ئارادا نییە، بەڵام هەر لەڕووی زاڵ بوونەوە، ژنانیش دەخزێنە ژێر ئەو خیطابەی کە ئاراستەی پیاوان کراوە، وەك لە ئایەتی: ﴿قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًا﴾[1] واتە: هەمووتان بەنێرو مێوە لە بەهەشت دابەزنە خوارەوەو هەندێ لە زانایان دەڵێن: کە جەمعە موزەککەرەکان لەڕووی ئەسڵی دانانو حەقیقەتەوە ژنانیش دەگرنەوە، بەڵام ڕای جەماوەری زانایان، ڕای لە پێشتر (الراجح)ەو، شایانی وەرگرتنە.[2]

۲۸۱- لای کەمیی جەمع:

زانایان سەبارەت بەلای کەمی جەمع ڕاجیاییان هەیە، کە ئایا دوو یان سێیە؟ جەماوەری زانایان دەڵێن: (دووە)و، لەسەر ئەم ڕایە بێت، دروستە کە (دوو)یش،

---

[1] البقرة (٣٨).

[2] المسودة، ل ٤٩، الأمدي، ب٢، ل ٢٨٦- ٢٩٢، إرشاد الفحول ل ١١٢.

لەفزی جەمع بوونی بۆ بەکاربهێنین، بەلاّم لەرووی حەقیقەتەوە، نەوەك لەرووی مەجازەوەو، هەندێك لە زانایان دەلێن: لای کەمیی جەمع (سێ)یەو، مەگەر لە رووی مەجازەوە دەنا، جەمع بۆ (دوو) بەکار ناهێنرێت، و هەر گروپەو کۆمەلێك بەلگەی هەن، بەلاّم رای لە پێشتر بریتییە لە راکەی جەماوەری زانایان.[1]

٢٨٢- ئایا ئەو بڕیارو خیطابانەی کە ئاڕاستەی گەلی ئیسلام کراون، پێغەمبەریش (ﷺ) دەگرێتەوە؟

ئایا خیطابو داواکارییەکانی قورئان بەگشتی، پێغەمبەریش (ﷺ) دەگرێتەوە؟ وەك ﴿یاأیها الذین آمنوا﴾ ﴿یاأیها الناس﴾ و ﴿یا عِبادي﴾، جەماوەری زانایان دەلێن: بەلێ دەیگرێتەوەو هەندێکیش دەلێن، نەخێر نایگرێتەوە.

رای لە پێشتریش رای جەماوەری زانایانە، چونکە ئەم دەستەواژانە گشتی (عام)ن، بۆ هەموو مرۆڤێكو بۆ هەموو باوەڕدارێکەو، پێغەمبەریش (ﷺ) گەورەی خەلکیو گەورەو سەرداری باوەڕدارانەو، لە چوار چێوەی ئەو داواکاریو خیطابانە ناچێتە دەرەوە، مەگەر بەلگەیەك پەیدا ببێت، و جیای بکاتەوە.[2]

٢٨٣- تایبەت کردنی لەفزی گشتی (تخصیص العام)[3]

گوتمان کە لەفزی (عام) سەراپای ئەو تاکانە دەگرێتەوە، کە لەو مەفهومەیدا هەن، کە دەری بڕیوەو، ئەو حوکمەی کە بەستراوە پێوەی بۆ سەرجەمی ئەو تاکانە جێگیر دەبێتو دەچەسپێت، بەلاّم جاری وا هەیە، کە بەلگەیەك پەیدا دەبێت، کە ئەوە دەردەخات کە مەبەستی شەرع لەو لەفزە عامە، هەر لەسەرەتاوە

---

[1] بۆ بەلگەی هەردوو گروپەکە بڕوانە کتێبی (الأحکام)ی ئامیدی، ب٢، ل ٣٢٤- ٣٢٥.

[2] الأمدي، ب٢، ل ٣٩٧- ٣٩٩.

[3] کشف الأسرار، ب١، ل ٣٠٦، شرح مسلم الثبوت، ب١، ل٣٠٠، المحلاوي، ل ٧٢، الأمدي، ب٢، ل ٤٠٧و داتریش.

مەبەستی پێی گشتی بوون (عموم) نەبووە، واتە، وای دەرنەبڕیوە کە سەراپای تاکەکانی ئەو مەفهومە بگرێتەوە کە دەری بڕیوەو، هەروەها نایەوێت حوکمەکە بەسەر سەرجەمی تاکەکانی پێکهاتەکەیدا بچەسپێتو بەڵکو هەر لەسەرەتاوە مەبەستی هەندێ لە تاکەکانی ئەو (عام)ە بووەو، هەروەها مەبەستی ئەوە بووە، کە حوکمەکە بەسەر هەندێکی تاکەکانیدا بچەسپێتو، ئەمەیش مانای تایبەت کردنی بابەتەگشتییەکانە، واتە: (تخصیص العام) کەواتە: (تخصیص: تایبەتکردن)، بریتییە لە کورتکردنەوەی

لەفزی (عام) بۆ چەند تاکێك لە پێکهێنەرەکانیو، ئەو بەڵگەیەی کە دەلالەت لەسەر ئەم کورت کردنەوەیەو تایبەت کردن دەکات پێی دەگوترێت: (المُخصِّص)، و هەندێ لە زانایانی وەك حەنەفییەکان ئەوەیان بەمەرج گرتووە، کە دەبێت، تایبەت کارەکە (المُخصِّص) هاوشانو هاوڕێی (عام) بێتو لەو کەلامەیدا کەتیایدا هاتووەو، دەرکەوتووە سەر بەخۆ بێتو ئەگەر هاوشانی (عام) نەبوو، ئەوا بە (ناسخ: سڕیار) ناوزەد دەکرێت، نەوەك بە تایبەتکارەکە(المُخصِّص)و هەروەها ئەگەر وەك (إستثناء) سەر بەخۆ نەبێت، لە لەفزە عامەکە ئەوە بە (المُخصِّص) ناو نابرێت، بەڵکو ئەوە لادەری بابەتەعامەکەیە، لەو حاڵەتە عامەی تیایدایە، بۆ حاڵەتێکی ترو کورت کردنەوەی بەسەر هەندێ لە تاکەکانی ئەو عامەدا،و بۆیە لەم حاڵەتەداو، لەم ناسەربەخۆییەدا، بە بەڵگەی کورت کردنەوەکە (دلیل القصر) ناوزەد دەکرێت.

بەڵام جەماوەری زانایان ئەوەی حەنەفییەکان سەبارەت بە (المُخصِّص) بە مەرجیان گرتووە، ئەمان بە مەرجیان نەگرتووەو، لەلای جەماوەری زانایان، تەخصیص بە هۆی بەڵگەی سەربەخۆو بەڵگەی ناسەر بەخۆ هەر دەکرێتو شایانی ڕوودانەو، هاوشان بێت، لەگەڵ دەقە گشتییەکەدا، یان نا.. هەر چونییەکە، بەڵام

بەو مەرجەی کەهاتن‌و پەیدابوونی، دوانەکەوتبێت، لە کاتی کارکردن پێی دەنا بە (ناسخ: سرپیار) ناودەبرێت‌و دادەنرێت، نەوەك بە (تایبەتکار: المُخصِّص).[1]

جا لەخوارەوە، باسی بەڵگەکانی تایبەتکردن (التخصیص) دەکەین، لەلای غەیری حەنەفییەکان، کە دەکاتە بەڵگەی ڕای جەماوەری زانایان.

٢٨٤- بەڵگەکانی تایبەتکردن، (التخصیص):[2]

بەڵگەکانی تەخصیص کردنی (عام) دوو جۆرن، (متصل: لکاو)و، (منفصل: جودا)، بەڵام موتتەصیلەکەیان، ئەوەیە کە لە خودی خۆیدا سەر بەخۆ نییە، بەڵکو لە گەڵ عامەکەدا باسکراوەو، ماناکەی بەستراوە بەو لەفزەوە کە لە پێشییەوە هاتووەو، هەروەها بەشێکە لەو کەلامەی کەمانای لەفزە عامەکەی لە خۆیدا بەر جەستە کردووە. بەڵام مونفەصیلەکەیان، ئەوەیە کە لە خودی خۆیدا سەربەخۆیەو، بەشێك نییە، لەو کەلامەی کە مانای لەفزە عامەکەی گرتۆتە خۆ، و لە خۆیدا بەرجەستەی کردووە.

٢٨٥- (المُخصِّص المنفصل) واتە: تایبەتکاری جودا، کە بریتییە لەو لەفزەی کە بە سەربەخۆیی، پرۆسەی تایبەت کردنەکە جێ بەجێ دەکات‌و، دەبێتە چوار جۆر:

---

[1] لە جیاوازییەکانی نێوان(نسخ: سرینەوە)و، (تخصیص: تایبەتکردن) ئەوەیە کە نەسخ بریتییە لەلابردنی حوکمێك، لە دوای چەسپاندنی، بەڵام تەخصیص، بریتییە لە ڕونکردنەوەی مەبەستی لەفزە عامەکەو، هەروەها تەخصیص تایبەت کردنی هەندێك لە تاکەکانی عامەکەیە بە پێچەوانەی نەسخەوە کە سەرجەمی تاکەکان دەگرێتەوە بڕوانە إرشاد الفحول، ل١٢٥.

[2] الموافقات، للأمام الشاطبي، ب٣، ل ١٨١، ودواتر تیسیر التحریر، ب١، ل ٣٧٥و دواتر، البیضاوي، ل ٥٤و دواتر ، الأمدي، ب٢، ل ٤١٦و دواتریش، شرح مسلم الثبوت، ب١، ل ٣٠٠و دواتر، المحلاوي، ل ٧٢، التوضیح، ب١، ل ٤٢، سُلَّم الوصول لعلم الأصول، ل ١٩١.

یەکەم: کەلامی سەر بەخۆی لکاو بە لەفزە عامەکەوە.

دووەم: کەلامی سەر بەخۆی جیا لە لەفزە عامەکە.

سێیەم: عەقڵ.

چوارەم: نەریت (عورف).

- یەکەم: کەلامی سەربەخۆی لکاو بە لەفزە عامەکەوە:

مانای (مستقل: سەربەخۆ) واتە: لە خودی خۆیدا تەواو کامڵ بێت، مانای (المتصل العام: لکاو بە لەفزە عامەکەوە).

واتە: لەگەڵ لەفزە عامەکەدا باس کرابێت وەك ئەوەی کە لە دوایەوە هاتبێت، نموونەیش، وەك ئایەتی: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾[1] کە ئەو عامەی لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە، هەموو کەسێ دەگرێتەوە، کە مانگی ڕەمەزانی بەسەردا هاتبێت، ڕۆژوو گرتنی لەسەر واجب دەبێت، بەڵام ئەم عامە، تایبەت کراوەو نەخۆش و ڕێبواری لێ دەرکراوە، بە بەڵگەی ئەو دەقەی تر کە لە دوایەوە هاتووە، لە کەلامێکی سەر بەخۆی لکاودا پێیەوە، کە ئەویش فەرمایشتی: ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ﴾ بۆیە نەخۆش و ڕێبوار گشتگیری (عموم)ـی، ئەو دەقە نایانگرێتەوە کە دەقەکەی وای دەخواست، هەر کەسێ مانگی ڕەمەزانی بەسەردا هات ڕۆژوو گرتنی لەسەرە، کە ئەمە عامە بەڵام بۆ نەخۆش و ڕێبوار تایبەت کرا.

- دووەم: کەلامی سەربەخۆی جودا:

ئەمەیش بریتییە لەو کەلامەی کە لە خودی خۆیدا کامڵ و تەواوە، بەڵام نەلکاوە بەو دەقەدا، کە لەفزە عامەکەی تیادا هاتووەو نموونەیش وەك ئایەتی:

---

[1] البقرة (١٨٥).

﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾[1] کـه لـەفزی، (مطلقـات) عامـەو، هەموو ئـافرەتێکی تەڵاقـدراو دەگرێتـەوە گوازرابێتـەوە، یـان نەگوازرابێتـەوە، هـەر عیددەی لەسەرە، بەپێی بەڕێ کردنی ئەو (قُرْءْ: پاکێتی، یان بێ نوێژی)یە، بـەڵام ئـەم دەقــە عامــە، ســەبارەت بــە ئافرەتــانی تەڵاقــدراوی گــوازراوە تایبــەت (تەخصیص)ــی، بـۆ کـراوە، واتـە: دەقەکـە سـەبارەت بـەئافرەتانی گـوازراوەو، سـەرجێی لـە گەڵـداکراو دەگوڕێـتو، دەخرێتـە سـەر ئـەوان، نـەوەك ئافرەتـانی نەگوازراوە، ئەمەیش بە پێی دەقی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە لێرەدا ڕۆڵی (تایبـەتکار-المُخصِّص) دەبینێـت، کـە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ﴾[2] واتـە: ئـەی ئەو کەسانەی کە بڕواتـان هێنـاوە، کاتێك ژنـانی بـڕوا دارتـان مـارە کـردنو، دواتـر تەڵاقتان دان، پێش ئەوەی بچنە لایان، ئەوا هیچ عیددەو ماوەیەکتان بەسەر یانەوە نییـە، ڕێگربێـت، بـۆ شـوو کردنـەوەیان، هـەروەها وەك ئایـەتی: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ ﴾[3] کـە هـەموو مـردارەوە بوویـەك دەگرێتـەوەو سـەرجەم مردارەوەبووەکـان حەرامن بەڵام مردارەوەبووی دەریا تایبەت کراوە، لە نێـو ئـەو لـەفزە عامـەدا، بـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە سـەبارەت بـەدەریا فەرموویـەتی: (هـو الطهـور ماؤە، الحل میتتـە) واتـە: ئـاوی دەریـا پاکـە، و مردارەوبـووی دەریـایش خـواردنی حەڵاڵە.

---

[1] البقرة (٢٢٨).

[2] الأحزاب (٤٩).

[3] المائدة (٣).

هەروەها وەك فەرمایشتی خوای پەروەردگار كە سەبارەت بە بوختان كردنو سزاكەی دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥﴾[1]، واتە: ئەوكەسانەی ژنانی داوێن پاك، یان پیاوانی داوێن پاك، تۆمەت باردەكەن بەزیناوە پاشانیش چوار شایەت ناهێنن بۆ چەسپاندنی داواكەیان، دەبێت ئەوانە هەشتا شەلاقیان لێ بدەن تا جارێكی تر بە ناهەقو ناڕەوا ناموسی خەڵك لەكەدارو بریندار نەكەن، تا هەتاهەتایشە نابێت، شایەتییان بۆ شتی تر لێ وەربگرن، ئا ئەوانەن لەسنور دەرچوانو، لای خوا بەفاسق دەدرێنە قەڵەم، مەگەر ئەوانەی كە دوای ئەو كارە درێوو ناشرینە پەشیمان دەبنەوەو كردەوەكانیشیان چاك دەكەنەوەو، جارێكی تریش ناگەڕێنەوە بۆ ئەو كارە، بێگومان خوای مەزنیش لێبوردەو میهرەبانە.

كە ئەم دەقە پیرۆزە، عامە (گشتییە)و سەرجەمی بۆختانكاران دەگرێتەوە چونكە لەفزی (الذين) عامە، هاوسەرەكانو خەڵكی تریش كە بوختان كار بوون. هەر دەگرێتەوە، هەر وەك گشتی بوونی لەفزی (المحصنات)، ژنە بوختانكەرەكانو ژنی تریش دەگرێتەوە، چونكە لەفزەكە عامە، بۆیە شەلاقدانی هەموو بوختانكارێك واجبە، هاوسەری بوختان بۆ كراو بێت، یان نا.... هەر چونیەكە، بەڵام ئەم گشتی بوونو (عام) بوونە، كە لەم دەقەوە دەفامرێتەوە تایبەت كراوە بە كەسێك كە هاوسەری بوختان بۆكراو نەبێت، چونكە حوكمی هاوسەری بوختان كاری جیا كردۆتەوە بە ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ

---

[1] النور (٤- ٥).

ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَـٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَـٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٩﴾﴾[1] واتــە: ئــەو کەســانەی کــە تۆمەتی زیناو داوێن پیسی دەدەنە پاڵ هاوسەرەکانیانو، بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نییە، کە شایەتیان بۆ بدەن، کە ئەو ژنە زینای کردووە چونکە چوار شایەت پێویستە بۆ چەسپاندنی تۆمەتی داوێن پیسی، جا بۆ ئەوەی کە ئەو هەشتا شەلاقەی لە کۆڵ بکەوێت (ئەگەر شایەت نەبوو) ئەبێ هەریەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بەناوی خوداوە شایەتی بداتو سوێند بخوات، بە خوداو بڵێت: بەڕاستی من لە ڕاستگۆیانم،کە دەڵێم ئەم زینای کردووەو، بەچاوی خۆم تاوانەکەیم بینیوە، پێنجەم جاریش بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێت، ئەگەر لە درۆزنانیش بم، جا سزا لەسەر ئەو ئافرەتە، تۆمەتبارەیش لا دەبرێتو، سزا نادرێت، کە ئەویش چوار جار شایەتی بداتو، سوێند بە خودا بخواتو، ئەشهەدو بیلا بکێشێ، کە مێردەکەی لە درۆزنەکانەو درۆیش ئەکات، کە زینای داوەتە پاڵمو، بۆ جاری پێنجەمیش ژنەکە بڵێت: خەشمو قینی خوام لەسەر بێت ئەگەر ئەو مێردەم لە ڕاستگۆیان بێت.

کە ئەم دەقە گشتی بوونی یەکەمی تەخصیص کردووەو، کورتی کردۆتەوە، لەسەر غەیری هاوسەرەکان کە ئەگەر بوختان بۆ یەکتری بکەن، بەڵام ئەگەر پیاوان بوختانیان بۆ ژنەکانیان کرد، ئەوا حاڵەتی دەقی دووەم: دەیانگرێتەوە، کە دەقەکە تایبەتکارەکەیەو، عامەکەی تایبەت کردووە، ئەمەیش لەسەر ڕای جەماوەری زانایان، چونکە بەمەرجیان نەگرتووە، کە دەبێت (المُخصِّص: تایبەتکار) هاوشانی (عام)ـەکە، بێت، بەڵام حەنەفییەکان ئەمە بەتەخصیص دانانێن، بەڵکو بە نەسخکردنەوەی لاوەکی (جزئي) ئەژماری دەکەن، واتە: دەقی دووەم: لە حوکمە

---

[1] النور (٦– ٩).

عامەکەدا ئەو بەشەی نەسخ کردۆتەوە، کە پەیوەستە بە بوختان کردنی پیاوانەوە، بۆ ژنەکانیانو، لە حوکمە عامەکەدا، ئەوەی پەیوەستە بەوانەوە بەتاڵی کردۆتـەوەو بـە حـوکمێکی تایبەتـەوە گرێـی داون، کـە بـەس بـۆ هاوسـەرەکانەو غـەیری ئـەوان ناگرێتەوە.

- سێیەم: عەقڵو ژیری[1]:

عەقڵ دەگونجێت کە ببێتە بەڵگە بۆ تەخصیص کردنی سەرجەمی ئـەو دەقانـەی کە باسو خواسی ئەرکـە شـەرعییەکانیان لـە خۆگرتـووە، بـە کورتکردنـەوەی ئـەو دەقانە لەسەر ئەوانەی کە ئەهلنو، شیاون بۆ ئەو ئەرکەو، ئەوانەی کە ئەرکەکـەیان لەسەر شان نییە، لە منداڵو شێتەکانو، شەرعیش پشـتیوانی عـەقڵی کـردووە وەك بەڵگەو، پێگەیشتن (بلوغ)و عەقڵی کردوونەتە دوو خەسڵەت بـۆ ئـەرك لەسـەر شـان دانان، هەروەك پێشتریش باسمان کرد.

نموونەی تەخصیص کردن بەهۆی عەقڵەوە وەك ئایەتی: (وأقیموا الصـلاة: نوێـژ بەرپا بکەن)و، (کتب علیکم الصـیام: ڕۆژوو گـرتن لەسـەرتان فـەرزکراوە) نموونـەی تری لەم شێوەیە لە دەقە گشتییەکانی تایبەت بەئەرکە شەرعییەکان کە هەموویان، تایبەت بە کەسانی ساغن، نەوەك شێت، و نابالغ، و منـداڵ، و ئـامرازی تایبـەتکردن (المُخصِّص) لێرەدا عەقڵەو، شەرعیش دەلالەت لەسەر ئەوشتانە دەکات، کـە عـەقڵ دەلالەتی لەسەر کردوونو، هەروەها دەقە گشتییەکان ئەوانەیان کە بـاسو خواسـی ئەرکە شەرعییەکان ناگرنە خۆ، بەڵام هەر عەقڵ بڕیـار لەسـەر تەخصـیص کردنیـان دەدات، وەك ئـەم فەرمایشـتەی پـەروەردگار کـە دەفـەرموێت: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ

[1] المسودة، ل ١١٨، الأمدي، ب٢، ل ٤٥٩– ٤٦٥.

﴿شَيۡءٖ﴾[1] كه تايبەته به هەموو دروستكراوێكەوه غەيرى خواى پەروەردگار چونكه خودا هەميشەيى و بەردەوامى هەتا هەتايى يەو، دورستكراو نييە، هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، كە ئەم توانايەى پەروەردگار، دروستكردنى خودى خۆى ناگرێتەوە لەبەر ئەو هۆكارەى كە ئێستا گوتمان.

**چوارەم: نەريت (العُرْف)[2]:**

نەريتيش دەكرێت كە ببێتە ئامرازى تايبەتكردن (المُخصِّص)ـى، لەفزى عام، ئەمەيش مەزهەبى مالكى يەكانە پێشەوا قەرافى دەفەرموێت: بە پێى مەزهەبى ئێمەى مالكى، نەريتو بەندو باوەكان دەتوانن ببنە (المُخصِّص: تايبەتكار)ـى، بابەتە عامەكانو نموونەى تەخصيص كردنى عام، بەهۆى نەريتەوە، ئەوەيە كە سەبارەت بەم ئايەتە پيرۆزە دەيلێن، كە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ﴾[3] كە گوتويانە، ئەم ئايەتە تايبەتە بە غەيرى ئەودايكانەى كە نەريتى شيردان بە منداڵيان نييەو، هەروەها ژمارەيەك لە زانايان ڕايان وايە كە لەفزى (طعام) كە لەم فەرمودەيەدا هاتووە: كە دەفەرموێت: (نهى رسول الله (ﷺ) عن بيع الطعام بجنسه متفاضلاً) واتە: پێغەمبەر (ﷺ) نەهى كردووە، لە مامەڵەكردن بەخۆراكى هاوشێوەو وەك يەك، يەكێكيان بڕى زياتر بێت، لەوى تريان، جا زانايان ئەم لەفزى (طعام)ـەيان، تايبەت كردووە، بەو خۆراكەى كە

---

[1] الزمر (٦٢).

[2] المسودة، ل ١٢٣– ١٢٤.

[3] البقرة (٢٣٣).

له سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، ئەم ناوی (طعام)ـەی، بەسەردا بڕدراوە، هەر وەك ژمارە یەك لە زانایان ئەم ڕایەیان دەربڕیوە.

هەروەها وەك ئەو فەرمایشتەی خوای پەروەرگار سەبارەت بەو(با) یەی کە هەندێ لە گەلەستەمکارەکانی لەناو برد، کە دەفەرمویت: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾[1] واتە: بەفەرمانی خودای خۆی هەموو شتێکی لەناو دەبرد، واتە: هەموو ئەوشتانەی کە بە نەریتو بەندو باو بە (با) تیا دەچن، لە ناوی دەبردن، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای پەروەردگار لە دواتر بەم دەستەواژەیەی خۆی ئەمەی دەر بڕیوە، کە دەفەرمویت: ﴿فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ﴾[2] واتە: جا ئیتر وایان بەسەردا هات شوێنەواریان نەدەبینرا، جگە لە خانووەکانیان، و بە فەرمانی خوای کارزان، هەموو شتێکیان تیادا چوو![3]

هەروەها وەك ئەو فەرمایشتەی کە خوای پەروەردگار سەبارەت بە پاشا ژنەکەی (سەبەء) دەفەرمویت: ﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾[4] واتە: درابوو پێی، لە هەمو ئەو شتانەی کە لەلای دەسەڵاتدارو سەرۆکەکان هەیە، واتە: هاووێنەی دەسەڵاتو موڵكو شتەکانی ئەوانی درابوویە، و پاشا ژنەکەی (سە بەء) هەیبوو، و لە هیچی هاووێنەی ئەو شتانەی کەم نەبوو.[5]

---

[1] الأحقاف (٢٥).

[2] الأحقاف (٢٥٩.

[3] الموافقات، للأمام الشاطبي، ب٣، ل١٧٢.

[4] النمل (٢٣).

[5] هەندێ لە زانایان بەڵگەی تەخصیص کردن، لەم نموونەیەوەو ئەوی پێشوودا ناوزەد دەکەن، بە (بەڵگەی هەستی: دلیل الحس) واتە: هەست بەو تایبەت کردنی شتە عامە

نموونەی تری، بابەتی تەخصیص کردن، بەهۆی عورفەوە وەك ئەوەی كە كەسێك سەبارەت بە ئاژەڵەكانی خۆی وەسیەتێك بكاتو لەناوچەی نیشتەجێ بوونی ئەم كابرایە نەریتو عورف وابێت كە ناوی (دابة: ئاژەڵ) تەنها بۆ ئەسپ بەكار بهێنرێت، بۆیە ئەم وەسیەتەی ئەم كابرایە تەنها بۆ ئەسپ بەكار دێتو هەر ئەو دەگرێتەوەو، ئاژەڵانی تری وەك، مانگاو مەڕو بزن ناگرێتەوە.

**٢٨٦- تایبەتكاری لكاوی ناسەربەخۆ:**

**((المُخصِّص المتصل، أي: غير المستقل))[١]:**

ئەمیش هەروەك گوتمان بەشێكە لە دەستەواژەی ئەو دەقەی كە لەفزی عام بوونەكەی گرتۆتە خۆ، كەواتە ئەمیش كەلامێكی كە لە خودی خۆیدا تەواوو كامڵ نییەو، چەند جۆرێكە:

- یەكەم: ((هەڵاوێركردن: الأستثناء)):

**الأستثناء**: بریتییە لەو لەفزەی كەلكاوە بەڕستەیەكەوە، بەڵام ئەم لەفزە لە خودی خۆیدا سەر بەخۆ نییە، بەڵكو بەهۆی پیتی (إلا)یان خوشكەكانی، لە ڕستەكە جیا كراوەتەوە، لەسەر ئەو بنەمایەی كە ئەو شتەی ئەم دەلالەتی لەسەر دەكاتو ماناكەی دەدات، ئامانجو مەبەستی ئەو ڕستەیە نییە، كە پێوەی لكاوە، و ئەم لەفزی ئیستثنایە، نە شەرتە و نە صیفەت، و نە ئامانجو مەبەست (غایة)ـە.

(إلا) لە دەستەواژەو ئامڕازە دیارەكانو ناسراوەكانی ئیستثنایە هەروەها (غیر)، (عدا)، (ماعدا)، (ماخلا)، (لیس)، و هتد.....

---

دەزانێتو پەی پێ دەبات، كە تایبەتە بە هەندێ لە تاكەكانی عامەكە، نەوەك هەموویان، بڕوانە كتێبی إرشاد الفحول، ل ١٢٨.

[١] الأمدي، ب٢، ل٤١٦و دواتر، لطائف الأشارات، ل ٣٠- ٣١، إرشاد الفحول، ل ١٢٩- ١٣٥.

ئینجا بۆ دروستی (الأستثناء) بەمەرج گیراوە، کە لکابێت بە (مستثنی منە) بەبێ بوونی جیاکاری لە نێوانیاندا، یاخود جیاکاری ناتەواویش واتە: شێوەیەك لە شێوەکانی جیاکاری کە بۆنی جودایی بدات هەر نابێت، لە نێوان (مستثنی)و (مستثنی منە)دا، هەبێت، هەروەها کوتویانە کە ئیستثنای مونفەصیل (جیا) هەر دروستە هەر چەندە ئاستی جیاوازیو لێك جودابیەکە مانگ زیاتریشی خایاندبێتو، ئەم رایە، رای لە پێشتر لەبەردەمیدا هەیەو، ئەم رایە خراوەتەوە دواتر (مرجوح)ەو رای لە پیشتر (راجح) ئەوەیە کە باسمان کردو، جەماوەری شەرع زانانیش هەر لەسەر ئەو رایەن.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَـٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَـٰنِ ﴾[1] واتە: هەر کەسێك لە دوای بڕواهێنانی بە خوای مەزن، کافرو بێ باوەڕ ببێتەوە، بێگومان سزای توند دەدرێتو دەکەوێتە بەر قارو تورەیی خوداوە، مەگەر کەسێك، کە لێرەدا (إستثناء) کردن، هاتووە، کە لەفزی (من کفر)ـە، بە عامی هاتووەو، دواتر کورتی کردۆتەوە، لەسەر ئەو کەسەی کە بە خواستی خۆی بێ باوەڕ دەبێتو، لەسەر رازی بوونی خۆی پاشگەز دەبێتەوە لە ئیسلام، بەلام ئەوەی کە بەزۆر کوفری پێ دەکرێت، ئەوە کافر نابێت.

هەروەها نمونەیەکی تر، وەك ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَـٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَـٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ

---

[1] النحل (١٠٦).

﴿ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾[1]

واتە: ئەوانەی کە وێڕای خوای گەورە هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن‌و، کەسیش ناکوژن کە خوای گەورە کوشتنی یاساغ کردبێت، مەگەر بەهەق‌و ڕەوا، وەك پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، داوێن پیسی کردن، کوشتنی خەڵکی بێ تاوان، و هەروەها شەڕواڵ پیسی ناکەن‌و، هەرکەسێك ئەو کارو کردەوە ناپەسندانە بکات، ئەوە لەدوا ڕۆژدا دەگات، بەسزای تاوانەکەی خۆی‌و، لە ڕۆژی قیامەتیشدا دوو بەرامبەر ئازار دەدرێت، چونکە لە لایەکەوە هاوەڵی بۆ خودا بڕیار داوەو، لە لایەکی تریشەوە ئەو گوناهە ناشیرینانەی کردووەو، بەسوکی‌و زەلیلی‌و ڕیسواییەوە بە هەتا هەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوە مەگەر کەسێك کە پەشیمان دەبێتەوەو، بڕوا بێنێ‌و، کاری چاك ئەنجام بدات ئا ئەو کەسانە خودا گوناهو، خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت، بە چاکەو، هەمیشە خودا گوناه پۆشەو میهرەبانە.

کە لەم ئایەتەدا ئەوە دەردەخات، کە هەر کەس ئەو کارە خراپانە ئەنجام بداتو، لەسەریان پەشیمان نەبێتەوەو، دواتر باوەڕ نەهێنێت‌و، دەست نەکات بە چاکەکاری. ئەوە تاوانبارو گوناهکارە.

ئەوەی جێگای سوودە کە لێرەدا ڕوونی بکەینەوە ئەوەیە کە ئەگەر (إستثناء) لەدوای ڕستە گەلێکی پێکەوە بەستراو (متعاطفة) هات، ئەوە بۆ سەرجەمیان دەگەڕێتەوە مەگەر بەڵگەیەك پەیدا ببێت‌و تایبەتی بکات بە یەکێك یان چەندێکیانەوەو، هەندێ لە زانایان ڕایان وایە، کە (إستثناء)ەکە، دەگەڕێتەوە بۆ دواین ڕستەیان، مەگەر بەڵگەیەك بەرپا بێت، کە دەلالەت بکات لەسەر ئەوەی کە گشتگیرەو، هەموویان دەگرێتەوە، نمونەی ئەمەیش وەك ئایەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ

---

[1] الفرقان (٦٨- ٧٠).

﴿ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾﴾[1] كە لێرەدا (إستثناء) دەگەڕێتەوە بۆ (الفاسقين)، نەوەك بۆ شەلاقدانەكە، لەسەر ڕای ئەوانەی كە دەڵێن: (إستثناء) بۆ دواین ڕستە دەگەڕێتەوە، و هەروەها لەسەر ڕای ئەوانەی كە دەڵێن: (إستثناء) بە گشتی دەگەڕێتەوە، بۆ سەرجەمی ڕستەكانو برگەكانی، ئەمانیش هەر دەڵێن: بۆ (الفاسقين) دەگەڕێتەوە، و بەڵگەیشییان ئەوەیە كە لەم جێگایەدا بەڵگە هاتووە، لەسەر ئەوەی كە (إستثناء)ـەكە، تایبەت كراوە بە دواین ڕستەوە.

هەروەها وەك فەرمایشتی پەروەردگار سەبارەت بە كوشتنی هەڵە كە دەفەرموێت: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ﴾[2] واتە: تۆڵەی كوشتنی باوەڕدارێك بە هەڵە بریتییە لە ئازادكردنی كۆیلەیەكی باوەڕدارو، هەروەها خوێنێك بە كەسو كارەكەی بدرێت، مەگەر بیكەنە صەدەقەو بیبەخشنو لێی خۆش بن!

كە لێرەدا (إستثناء) دەگەڕێتەوە بۆ خوێن دان (دية)، نەك ئازاد كردنی بەندەكە، چونكە خوێن دانەكە تەنها لە كۆتایی ڕستەكەدایە، یا خود لەبەر ئەوەی كە بەڵگە هەیە لەسەر تایبەتو تەخصیص كردنی (إستثناء)كە، بە تەنها خوێن دانەكەوە، ئەمە لەسەر ڕای ئەوانەی كە دەڵێن، (إستثناء) دەگەڕێتەوە، بۆ سەرجەمی ڕستە پێكەوە گرێدراوەكان.

---

[1] النور (٤– ٥).

[2] النساء (٩٢).

- دووەم: ((الصفة: خەسڵەت و، ئاوەڵناو)):

هەر وەك پێشەوا شەوكانی دەفەرموێت، مەبەست لە صیفەت لێرەدا صیفەتی مەعنەوییە، نەك ئەو صیفەتە ڕووتەی کە لە زانستی ڕێزمانی عەرەبیدا (نەحو) باسی لێوە کراوە، وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ ﴾[1] واتە: دایکتان کە دایکی خۆتانو دایکی باوكو دایکی دایك دەگرێتەوەو حەرامنو، کچانتانو خوشکانتان، کوڕەزاو کچەزایش... ئیتر خوشکی باوكو دایکیی بن، یان هەر باوکی، یان دایکی بنو، پورتان (خوشکی باوك)و پورتان (خوشکی دایك)و، کچی براو کچی خوشكو(برازاو خوشکەزا)و، ئەو ژنانەی بە ساوایی شیریان پێداون (دایکی شیریتان)و ئەو کچانەی کە هاوشیرتان بوونو، دایکی ژنانتان (خەسوتانو، ئەو کچانەی خۆتان بە خێوتان کردوون (زڕ کچ، کۆڵە بەس)، لەو ژنانە بن، کە ئێوە چوبنە لایان، بەڵێ ئەگەر ژنان پێش چوونەلایان تەڵاقدران، ئەگەر کچەکانیان مارە بکەن، قەیدی نییە.

کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، حەرامی مارە کردنی (زڕکچ، کۆڵەبەس) کورت کراوەتەوە لەسەر کچی ئەو ژنانەی کە گوازراونەتەوە، و سەرجێییان لەگەڵدا کراوەو، کابرای زڕباوك بۆی نییە، پرۆسەی هاوسەرایەتییان لەگەڵدا ئەنجام بدات، و هەروەها دەبێت ئەوەش بگوترێت کە صیفەت لەدوای چەند ڕستەیەکەوە، هات باسکردنو تاووتوێ کردنی ئاستی گەڕانەوەی ئەو صیفەتە بۆ هەموو ڕستەکانە،

---

[1] النساء (٢٣).

یان بۆ هەندێکیانە، هەروەك پرسی گەڕانەوەی (إستثناء) وایە، کە بۆ هەموو ڕستەکان دەگەڕێتەوە، یان بۆ هەندێکیان، کە کەمێك پێشتر قسەو باسمان لەسەر ئەم پرسەکرد.

- سێیەم: ((شرط: مەرج)):

هەروەك ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: شەرت: ئەوەیە کە شتە بە مەرج گیراوەکە (مَشروُط)، بەبێ ئەم شەرتە نایەتەدی، بەڵام هەر پێویستیش نییە، کە بە هاتنەدی مەرجەکە، ئیتر ڕاستەو خۆ مەرج بۆ گیراوەکە (مَشروُط)ـەکەیش، بێتەدی، و شەرت دەستەواژەی زۆری هەن، وەك (إن)ـی، شەرتیە، (إذا)، (مَنْ)، (مهما)، (حیثما)، (أینما)، وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ﴾[1] واتە: هیچ گوناهێکتان ناگات، بەمەرجێك بەپێی داب و نەریتی ڕۆژ کرێیان بدەنێ، مەبەست ئەو ژنانەیە کە بە کرێ دەگیرێن، بۆ شیردان بە منداڵ، کە لێرەدا (گوناهبار نەبوون) عامە، چونکە نەکیرەیەو لە دوتوێی نەفیدا هاتووەو، ئەو مەرجەی لە ئایەتەکەدا هاتووە، تیایدا بەمەرج گیراوە، واتە: گوناهبار نەبوون کورت کراوەتەوە لەسەر ئەو حاڵەتە، کە پابەند بوونە بەکرێ دانی سەردەمییانە، هەروەها وەك ئەم ئایەتەی تر کە دەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ﴾[2]، واتە: لەو میراتەی کە ژنانتان بەجێی دەهێڵن، ئەگەر منداڵیان نەبێ کوڕ، یان کچ، لە دووبەش، بەشێکتان هەیەو، ئەگەر منالّیشیان هەبوو، ئێوە ئەی مێردەکان،

---

[1] البقرة (٢٣٣).

[2] النساء (١٢).

چواریەکتان ئەکەویّ، لەو کەلەپورەی ئەو ژنانەتان بە جێتان هێشتووە، ئەوی تریش بۆ میرات بەرەکانی تر دەبێت، ئەمانەیش لە دوای ئەنجامدانی وەسیەتێك کردوویانە، یان دانەوەی قەرزو قۆڵەیەك کە لەسەریانەو، هەروەها ژنەکانتان چوار یەکی میراتتان دەگرن، بەمەرجێ منداڵتان نەبیّ، جا ئەگەر تەنها یەك ژنتان هەبوو، هەموو ئەو چوار یەکە بۆ ئەو ئەبێت، خۆ ئەگەر لە ژنێك زیاتر بوون، ئەوا بەیەکسانی دابەش دەکرێت، لە نێوانیاندا،

کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، بەشە میراتی (نیوە)و (چوار یەك) بەستراوەتەوەو کورت کراوەتەوە لەسەر حاڵەتی نەبوونی منداڵ واتە: دەبێت مردووەکە، کە میراتدەرەکەیە، بیّ منداڵ بێت!

– چوارەم: ((الغاية: مەبەستو ئامانج)):

((الغاية)) بریتییە لە کۆتایی ئەو شتەی کە خوازیاری چەسپاندنی حوکمەکەیە، بۆ پێشی خۆیو، لادەری حوکمەکەیە لەسەر ئەو شتەی کە لە دوایەوە دێتو، دەستەواژەکانی بریتین لە، (إلى)و (حتى)، دەبێت ئەو حوکمەی کە لەدوایەوە دێت، پێچەوانەی ئەو حاڵەتە بێت، کە لە پێشییەوە هاتووەو، هەروەها ئەوەیشی هەیە، کە یان لە دوای تەنها ڕستەیەکەوە دێت، و یان لە دوای چەند ڕستەیەکەوە دێت، ئەگەر لەدوای تەنها ڕستەیەکەوە هات، ئەمە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە ئەو شتەی لە دوای مەبەست (غاية)ـەکەوە، هاتووە لە ناو بازنەی گشتی لەفزەکەدا دەری هێناوەو، کردویەتییە دەرەوەو، حوکمەکەی تایبەت کردووە، بە پێش (غاية)ـەکەوە، وەك ئەوەی کە بڵێین (أنفق على طلاب الكلية إلى أن يتخرجوا) تا ئەو قوتابیانەی کۆلیج کۆتایی بە خوێندنەکەیان دەهێنن، ئەرکو مەسرەفیان لە ئەستۆ دەگرم، کە هەرچەندە مەبەستەکان زۆرنو، لە دوای تەنها ڕستەیەکەوە هاتوون، لەم کاتەدا سەنج دەدەین، کە ئەگەر مەبەستەکە گشتییەو بۆ هەموویانەو، لەدوای

هەموو ڕستەکانەوە هاتبێت، واتە: بە (واو)ـی، عـەطفـەوە هاتبێت ئـەوا حوکمەکـە تایبەتە بە پێشی ئـەو دووانـەوەو، ئەگـەر بـە پیتـی سەرپشـککردن (التخـییر) یـان (البدل) هاتبوو، ئەوا حوکمەکە تایبەتە بە پێشی یـەکێك لـەو دوو مەبەسـتەوە وەك ڕسـتەی: (أنفـق علـى طـلاب الكليـة إلى أن يتخرّجـوا، ويسـافروا إلى بلادهـم)، واتـە: مەسرەفی ئەو قوتابییانەی کۆلیج بکێشە، تـا کۆتـایی بـە خوێندنەکـەیان دەهێـنن‌و دەگەڕێنەوە بۆ شارەکانی خۆیان، کـە لـەم نموونەیـەدا حوکمەکـە تایبەتـەو کـورت کراوەتەوە لەسەر ئەو قوتابییانە پێش تەواوکردنی خوێندنەکەیان‌و گەڕانەوەیان بـۆ ناوچەکانی خۆیان‌و، تەنها تەواو کردنی خوێندن بەس نییە، بـەبێ گەڕانـەوەیان بـۆ شـارەکانی خۆیـان، تـا کـابرا مەسـرەف کێشـانەکەیان ڕابگرێـت‌و، ئـەم ڕسـتەیەی ڕابردوو، پێچەوانەی ئەم ڕستەیەیە کە ئێستا دەینووسـین، کـە دەڵێـت: (أنفـق علـى طلاب الكلية إلى أن يتخرّجـوا، أو يسـافروا إلى بلادهـم)، مەسـرەفی ئـەو قوتابییانـەی کۆلێج بکێشە، تا کاتێك کـە خوێندنەکـەیان تـەواو دەکـەن، (یـان) دەگەڕێنـەوە بـۆ شـارەکانی خۆیـان، کـە لێـرەدا (أو) کـە پیتـی سەرپشـککردن (تخيير)ـە، بـەکار هێنراوەو، لەم ڕسـتەیەی دواییـدا مەسـرەف کێشـانەکە کـورت کراوەتـەوە، لەسـەر قوتابییەکان لەپێش کۆتایی هێنانیان بـە خوێنـدن، یـان لـە پـێش گەڕانـەوەیان بـۆ شارەکانی خۆیان، جا ئەم مەسرەفکێشانە لە کاتی هاتنـەدی یـەکێك لـەم مەبەسـت (غاية)ـانە، ئیتر ڕادەگیرێت.

سەرەڕای ئەمـەیش، زانایـان سـەبارەت بـە خـودی (غايـة) لـەو ڕووەوە، کـە ئایـا دەچێتە چوار چێوەی حوکمی پێشـترەوە (مغيـاً) لـەم بارەیـەوە ڕاجیاییـان هەیـەو هەندێکیان گوتویانە، کە دەچێتە چـوار چێوەی حـوکمی پێشـترەوەو، هەنـدێکیش گوتویانە، کە ناچێت، وەك ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە کـە دەفـەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ

ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ ﴾[1] کە ئایا (المرافق: ئانیشکەکان) دەچنە ناو چوار چێوەی شۆردنەکەوە؟ ئەمە لەسەر ڕای هەندێ لە زانایان ناچن‌و، لەسەر ڕای هەندێکی تریان دەچن‌و، ڕایان وایە دەبێت ئەوانیش بشۆردرێن، بەڵام وەك وەرگرتنی ئەگەرەکان، لەم حاڵەتەدا بڕیار دراوە.

لەسەر ئەوەی کە ئانیشکەکانیش دەچنە چوار چێوەی پرۆسەی شۆردنەوە، بۆ دەستنوێژ گرتن‌و دەبێت بشۆردرێن.

٢٨٧- ئاستی دەلالەت کردنی عام، یاخود (عام: دەلالەت لەسەر چی دەکات)؟[2]

عام: دەلالەت دەکات لەسەر سەراپای ئەو تاکانەی کە عامەکەیان پێکهێناوە، هەروەك چەند جارێکیش ئەمەمان گوتووە، بەڵام زانایان ڕاجیاییان هەیە، لەسەر دەلالەت کردنی عام بەو گشتگیرییە، کە ئایا ئەو گشتگیربوونەی یەکلاکەرەوە (قطعي)یە، یان گوماناوی (ظني)یە؟ زانایان لە سەر ئەم پرسە دووڕایان هەیە.

هەندێك لە زانایان لەوانە حەنەفییەکان وای بۆ چوون، کە دەلالەت کردنی عام لەسەر تاکەکانی ئەو عامە، (قطعي)یە، ئەگەر تایبەت (تخصیص) نەکرابێت، جا ئەگەر تەخصیص کرابوو، ئەوا دەلالەت کردنی لەسەر ئەو تاکانەی کە ماونەتەوە (ظني) دەبێت، نەوەك قەطعي، و مانای ئەو (قطعي)بوونەیش، کە ئەم گروپەی زانایان بۆ (عام) چەسپاندوویانە، بریتیە لە ڕەواندنەوەی ئەگەری ئەوتەخصیصەی کە لەیەك بەڵگەدا بەرپاکراوە،نەوەك ڕەواندنەوەو لابردنی ئەگەری تەخصیص کردن بە ڕەهایی (المطلق)ـی، (واتە: لە بەڵگەکەوە دەرکەوتبێت‌و وەرگیرابێت، یان نا....))و لەسەر ئەم بنەمایە ئەگەر بەڵگەیەك لەسەر تەخصیص کردنەکەی

---

[1] المائدة (٦).

[2] إرشاد الفحول، ١١٧ ودواتر، أصول السرخسي، ب١، ل١٣٢- ١٣٤، فواتح الرحموت، ب١، ل٢٦٥و دواتر، (الموفقات)، للشاطبي، ب٣، ل ١٦٦، ودواتر، المحلاوي، ل ٧٠- ٧١.

دەلالەتی نەکرد، ئەوا دەلالەت کردنی بەسەر هەموویدا، بەشێوەیەکی (قەطعي) دەمێنێتەوە.

جەماوەری زانایان دەڵێن: کە دەلالەت کردنی (عام) لەسەر گشتگیری سەرجەمی تاکەکانی، چ لە پێش تەخصیص کردنەکە دەبێت، یان لەدوایەوە، هەر دەلالە تێکی (ظني)یەو، (قەطعي) نییە.

٢٨٨- گروپی ڕای یەکەم بەڵگەیان ئەوەیە کە لەفزی عام، لە ڕووی زمانەوە، بۆ گرتنەوەی سەراپای تاکەکانی دانراوە، و ئەمەیش مانای حەقیقی لەفزی (عام)ـە، و پێویستە لە کاتی دەربڕیندا بە ڕەهایی بە پێی ئەو مانایەی گوتمان مانا بکرێت‌و، دروست نییە لەو مانایە لا بدەین مەگەر بەڵگەیەك پەیدا ببێت، کە تەخصیصی بکات‌و، کورتی بکاتەوە، لەسەر هەندێك لە تاکەکانی.

بەڵام سەبارەت بە ئەگەری تەخصیص کردن، بەبێ بوونی بەڵگەیەك لەسەر ئەم ئەگەرە (إحتمال)ـە، جێگای بایەخ نییەو،گوێی پێ نادرێت، هیچ بڕیارێکی لەسەر بنیات ناکرێت‌و، بۆیە دەلالەت کردنی (عام)، لەسەر تەواوی تاکەکان (قەطعي)یەو، ئەگەری تەخصیص کردنی بێ بەڵگە بەتەنها خۆی، هیچ جۆرە کاریگەرییەکی لەسەر دروست ناکات، چونکە ئەم جۆرە ئەگەرە گومانبردنەو، سەر بە بابەتی خەیاڵی بێ بنەمایەو کاریش بە بابەتی گومان‌و خەیاڵ‌و خەیاڵ پڵاو ناکرێت.

٢٨٩- گروپی دووەم: کە جەماوەری زانایانن، بەڵگەیان ئەوەیە کە پرسی (عام)، لایەنی تەخصیص کردن بەسەریدا زۆر زاڵەو ئەزموونی ئەو دەقە بێ شومارە شەرعییانەی کە لەفزی عامیان تیادا هاتووە، ئەم قسەیەی تیادا چەسپاوەو، بۆیە مەگەر بە دەگمەن، دەنا هەموو (عام)ێك، تەخصیصی تیادا کراوە، تەنانەت لەناو ئەهلی عیلمیشدا وا بڵاوە، کە هەموو عامێك بڕێکی تیادا تەخصیص کراوە جا کە تەخصیص کردنی عام، پرسێکی زۆرو بڵاو بوو، بۆیە

ئەگەری تەخصیص کردنی ئەگەرێکی نزیکەو، پرسێکی گوماناویو خەیاڵاوی نییە، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەلالەت کردنی (عام) لەسەر سەراپای تاکەکانی، دەلالەت کردنێکی (قەطعي) نییە.

٢٩٠- بەرهەمی ئەم ڕاجیاییەی کە سەبارەت بە دەلالەت کردنی (عام) هەیە:[١]

سەبارەت بە هێزو توانای دەسەڵات کردنی (عام) لەسەر پرسەکانو لە دەرەنجامی ڕاجیایی زانایان لەسەر ئەم بابەتە، واتە: لە ڕووی (قەطعي) بوونو، (ظني) بوونەوە هۆکاری ئەم ڕاجیاییە لە دوو پرسدا چڕ بۆتەوە:

- پرسی یەکەم: تەخصیص کردنی بابەتێکی (عام) لە قورئانی پیرۆزدا، بەهۆی بابەتێکی (خاص)، لە فەرموودەی ئاحاد، زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەو لەفزە عامەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، دەکرێت هەر بەدەقی قورئان، یان سوننەتی موتەواتیر تەخصیص بکرێت، بەڵام سەبارەت بە دروستی تەخصیص کردنی بەهۆی سوننەتی ئاحادەوە ڕاجیاییان هەیە، چونکە قورئان لە ڕووی جێگیر بوونی دەقەکانییەوە هیچ گومانێکی تیادانییەو (قطعي الثبوت)ـە، بەڵام سوننەتی ئاحاد، لە ڕووی جێگیر بوونی دەقەکانییەوە هێشتا گومانی تیادایەو، (ظني الثبوت)ـە، بۆیە بابەتی (ظني) توانای تەخصیص کردنی بابەتی (قطعي) نییەو، ئەمەیش ڕای حەنەفییەکانەو، لەلای ئەمان تەخصیص کردنی بابەتی (عام)ـی، قورئانی پیرۆز، بە سوننەتی ئاحاد دروست نییەو، ناکرێت، مەگەر ئەو بابەتە عاممەی قورئانی پیرۆز، بەهۆی بابەتێکەوە تەخصیص کرابێت، کە لە توانای هێزدا لە ئاستی خودی قورئاندا بێت، وەك دەقێکی قورئانی، یان سوننەتێکی موتەواتیر،

---

[١] المسودة، ل ١١٩- ١٣٤، الأمدي، ب٢، ل ٤٧٢، ودواتر، فواتح الرحموت، ب١، ل ٢٦٥، أصول السرخسي، ب١، ل ١٣٣، ١٤٢، التوضيح والتلويح، ب١، ل ٤١، أصول الفقه، للأستاذ أبو زهرة، ل١٧١، و دواتر.

چونكه له دواى پرۆسەى تەخصيص كردنەكەى دەبێتە بابەتێكى وا كە دەلالەت كردنى لەسەر پرسەكان گومانـاوى بێت، واتە: (ظـني الدلالـة) دەبێت، بۆيە لەم حاڵەتەدا شتێك كە هەر وەك خۆى (ظني) بێت، دەتوانێت تەخصيصى بكات، وەك فەرمودەى ئاحاد، كە (ظني)يەو دەتوانێت بابەتێكى (ظني) تەخصيص بكات.

هەروەها حەنەفييەكان گوتويانە، كە تەخصيص كردنى عام، سەر بەبابەتى ڕوونكردنەوەى مەبەستەكانە، بۆيە پێويستە كە خودى ڕوونكەرەوە (مُبَيِّن) لە ڕووى هێزو تواناوە يەكسان بێت، لەگەڵ ڕونكراوە (مُبَيَّن)، كە لەفزە عامەكەيە، ياخود لەو بەهێزتر بێت!

بەڵام لەلاى غەيرى حەنەفييەكان، كە جەماوەرى زانايانن دروستە كە ئەو لەفزە عامەى لە قورئانى پيرۆزدا هاتووە بە هۆى لەفزى (خاص)ـى، ناو سوننەتى ئاحادەوە تەخصيص بكرێت، چونكە فەرموودەى ئاحاد هەر چەندە لە ڕووى جێگير بوونەوە گوماناوييەو، (ظني الثبوت)ـە، بەڵام كە (خاص) بوو، ئيتر دەلالەت كردنى يەكلاكەرەوەيە، واتە: (قطعي الدلالة)يە، و بابەتى عامى قورئانى پيرۆز هەر چەندە لەڕووى جێگير بوونەوە يەكلاييە (قطعي الثبوت)ـە، بەڵام لە ڕووى دەلالەت كردنەوە گوماناوييە واتە: (ظني الدلالة)يە، و كەواتە، دواجار يەكسانن بۆيە دروستە كەبابەتى عامى قورئانى پيرۆز بەهەۆى بابەتى (خاص)ـى، فەرموودەى ئاحادەوە، تەخصيص بكرێت.

لە نموونەى تەخصيص كردنى بابەتە عامەكانى قورئانى پيرۆز بە فەرموودەى ئاحاد، وەك تەخصيص كردنى ئەم ئايەتە پيرۆزە كە دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ﴾ كە مردارەوەبوو، حەرام دەكات، بەڵام بە فەرموودەى پێغەمبەر (ﷺ) كە دەفەرموێت: (هو الطهور ماؤه، الحل ميتـه)، ئاوى دەريا پاكەو مردارەوبوويشى حەڵاڵە، تەخصيص كراوە.

هەروەها فەرموودەی (لا يتوارث أهل ملّتين شتى) واتە: ئەو کەسانەی کە ئاینیان جیاوازە، میرات لەیەکتری نابەن، کە ئەم فەرموودەیە، ئەو بابەتە عامانەی میراتبەرانی تەخصیص کردووە، کە لە ئایەتەکانی میراتدا هاتوونو، هەروەها فەرموودەی (لا يرث القاتل: بکوژ میرات نابات) عام بوونی میرات بردنی تەخصیص کردووە، هەروەها ئەم دەقە عامەی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا﴾ بەم فەرموودەیە تەخصیص کراوە، کە دەفەرموێت، (لا قطع في أقلّ من ربع دينار: لە دزینی کەمتر لە چارەکە دینارێك دەست نابڕدرێت).

هەروەها فەرموودەی: (لا تنكح المرءة على عمتها، و لا على خالتها: ژن لە گەڵ پوری (خوشکی باوکی، یان خوشکی دایکی نابێت پێکەوەکۆ بکرێنەوەو، لە یەك کاتدا هەردووکیان ژنی یەك پیاوبن)، ئەم فەرموودەیە ئەو دەقە عامەی قورئانی پیرۆزی تەخصیص کردوە، کە دەفەرموێت: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾[1] واتە: بێجگە لەوانەی سەرەوە کە باکسکران ڕێتان پێدراوە کە بە ماڵو دارایی خۆتان ئافرەتانی تر تا چوار مارە بکەن، بەشێوەی شەرعیو بە داوێن پاکی، نەوەك بە داوێن پیسیو ناجوامێرانە.

بۆیە ڕودانی تەخصیص کردنی (عام)ـی، قورئانی پیرۆز بە سوننەتی ئاحادو هێنانەوەی وەك بەڵگە، ئەمە نیشانەو بەڵگەیە لەسەر دروستی ئەم پرۆسەیە.

حەنەفییەکان وەڵامی ئەم بەڵگەیەی جەماوەری زانایان بەوە دەدەنەوە، کە تەخصیص کردن بەم فەرمودانەلەبەر ئەم دوو هۆکارەیە:

---

[1] النساء (٢٤).

– یەکەم: یان ئەوەیە، ئەو (عام)ـەی، قورئـان بـەهۆی بەڵگەیـەکی (قـەطعـي) تەخصیص کـراوە، دواجـار دەلالـەت کردنـی لەسـەر ئـەو تاکانـەی کـە ماونەتـەوە، دەلالـەت کردنێکـی (ظـني)یـە، بۆیـە دروسـتە کـە لەوانەیـدا کـە ماونەتـەوە، بـە بەڵگەیەکی (ظني) تەخصیص بکرێت، وەك ئایەتی: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾[1] چونکە (ما) لەفزێکی عامەو، بـەهۆی عـام بـوونو، گشـتگیری بوونییـەوە ئافرەتـە هاوبـەش پەیداکـەرەکانو هـی تـریش دەگرێتەوە، بەڵام بەهۆی ئەم ئایەتەوە تەخصیص کـراوە، کـە دەفـەرموێت: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ﴾[2]واتە: ژنانی هاوبەش پەیداکەر مارە مەکەن، بۆیە لـەدوای ئـەم تەخصـیص کردنـە، ئـیتر تەخصـیص کردنـی بـە بەڵگەیـەکی (ظـني) وەك ئـەو فەرموودەی ئاحادەی کـە گوتیـان دروسـتە کـە بریتییـە لـە: (لا تـنكح المـرءة علـى عمتها، ولا على خالتها)، کە پێشتر مانامان کرد.

بەڵام ئەو فەرمودانەی تـر، کـە دەیانکەنـە بەڵگـە، ئـەوە لـە فـەرمودەی ناسـراوو بڵاوەکانو، فەرموودەی ناسراو (مشهور)یش، دروستە کە بابەتی عامی قورئـان بـە هۆیەوە تەخصیص بکرێت.

لە ڕاستیشدا، تەخصیص کردنی قورئانی پیرۆز، بە هۆی فـەرموودەی ئاحـادەوە ڕوویـداوەو، زانایـان کردویانەتـە بەڵگـەو، ئـەوەی کـە حەنەفییـەکان لـەم بـارەوە دەڵێن، کە ئەوانە فەرموودەی مەشـهور بـوون، ئـەم قسـەیان وەرناگیرێـت، چـونکە بەڵگەیان پێ نییە، بۆ قسەکەیانو، ئەگەر ڕاستو دروسـت بێـت، کـە پلـەی هەنـدێ

[1] النساء (٢٤).

[2] البقرة (٢٢١).

فەرموودەی ئاحاد بەرزبۆتـەوە، بـۆ (مەشـهور) بـوون، ئـەوا هەندێکیشـیان هـەر بـە ئاحادی ماونەتەوە، هەر وەك زانایانی فەرموودە ڕونیان کردۆتەوە.

بەهـەرحاڵ، ڕاجیـایی نێـوان حەنەفییـەکانو جـەماوەری زانایـان، بەرتەسـك دەبێتەوە، کە زانیمان یەکێك لە جۆرەکانی فەرموودە، بەپێی تێڕوانینی جەماوەری زانایان بریتییە، لە فەرموودەی مەشهور، (هەر وەك لـە بابـەتی سـوننەتدا، باسمـان کرد)، بێگومان حەنەفییەکانیش تەخصیص کردنـی عـامی قورئـانی پـیرۆز، بـەهۆی فەرموودەی مەشهورەوە بە دروست دەزانن.

٢٩١- پرسی دووەم:

لە کاتی بوونی ڕاجیایی لە نێوان حوکمی عامو حـوکمی خاصـدا، بـۆ نموونـە کـە سەبارەت بە پرسـێکی دیـاریکراو، هەریەکـەیان حـوکمێکی جیـاواز تـر لـەوی تریـان لەسەر ئەو پرسە بدات، خاوەن ڕاکانی گروپی یەکەم: کە ڕایان وایە، دەلالـەتی عـام (قەطعي)یە، ئەمانە لە نێوان عـامو خاصـەکەدا، پێچـەوانەگەرییان جـێگیر کـردووە، چونکە ئەم دووانە لەوەدا کە هەردووکیان دەلالـەتی (قـەطعي)ییـان، هەیـە، لەگـەڵ یەکتریدا یەکسانن‌و، لەم حاڵەتەیشدا ئەگەر سەردەمی هاتنی ئەم دووانە زانرا، ئەوە ئـەو خاصـە، عامەکـە تەخصـیص دەکـاتو، ئەگـەر خاصـەکە لـەدوای عامەکـەوە هاتبوو، ئەوا ئەو خاصـە هەنـدێ لـە تاکـەکانی عامەکـە نەسـخ دەکاتـەوەو، ئەگـەر مێژووی ئەم دووانە نەزانراو بوو، ئەوا بەپێی یاسـاکانی بەلایەکداخسـتن (الترجـيح)، کار بە لە پێشترەکەیان (الراجح)ـەکەیان، دەکـەین، لـە نێـوان عـامو خاصـەکەداو، ئەگـەر (الترجـيح)یش، هەرنـەکرا، ئـەوا هـەردووکیان وەلا دەنـرێن‌و هیچـکامیان بـۆ بەڵگە هێنانەوە بەکار ناهێنرێن، بەڵام خاوەن ڕاکانی گروپی دووەم: کـە ڕایـان وایـە دەلالەتی عام لەسەر ئەو گشتگیرو (عموم) بوونە، دەلالەتێکی (ظني)یە، ئەمانـە لـە نێوان عامو خاصەکەدا، پێچـەوانەگەری (التعـارض) جـێگیر ناکـەن، چـونکە خـاص

دەلالەتی (قەطعي) هەیەو، عامیش دەلالەتی (ظني) هەیەو (قەطعي)یش، دەخرێت، بە سەر (ظني)دا، بۆیە دواجار کار بە (قـەطعـي) دەکرێت نـەوەك بـە (ظـني) واتـە: عامەکەی پیێ تەخصیص دەکرێت، ئیتر چونیەکە بزانین کامیان لە ڕووی مێـژووەوە کۆنترن یاخود نەزانین‌و، ئەمەش ڕای حەنبەلی‌و شافیعی، و هاوڕاکانیانە.

نموونـەی ئـەم پرسـە، وەك ئـەوەی لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) گێڕدراوەتـەوە کـە دەفەرموێت: (ما سقته السماء ففيه عشر)، واتـە: زەکـاتی بەرهەمـە کشـتوکاڵییە دێمییەکان، دەیەکەو، هەروەها دەفەرموێت: (ليس فيما دون خسمة أوسق صدقه) واتە: لەو بەروبومانەی کە کەمتر لە پێنج ویسق (٦٠ صاع)ـن، زەکات دان نییە، کـە فــەرموودەی یەکــەم عامــەو بەرهــەمی کشــتوکاڵی کــەم بێــتو زۆر بێــت هــەر دەیگرێتـەوە، کـە زەکاتەکـەی دەیەکـەو، بـەڵام دەقـی دووەم: کـە خاصـەو تـەنها ئەوەنـدە زەکـات دەیگرێتـەوە کـە دیـاری کـردووە کـە پێـنج ویسـقەو، کـەمتر لـەو ئەندازەیە زەکات نایگرێتەوەو، جەماوەری زانایان کاریـان بەدووەمینەکـە کـردووە، چونکە خاصەو، دەلالەت کردنەکەیشی (قەطعي)یەو، کاریان بـە یەکـەم نـەکردووە، چـونکە عامـەو، دەلالـەت کردنەکـەی (ظـني)یـە، بۆیـە لـە کـەمتر لـە پێـنج ویسـقدا زەکاتیان واجب نەکردووە.

حەنەفییەکانیش، کە سەر بە گروپی ڕای یەکـەمن کاریـان بـە فـەرمودەی یەکـەم کـردووە، هـەر چـەندە عامـە، چـونکە دەلالـەت کردنەکـەی وەك دەلالـەتی خـاص (قطعـي)یـەو، هـەروەها بـە پێچـەوانەی دووەمـەوە، زەکـات لەکـەمو زۆردا واجـب دەکاتو، لەبەر ئەوەی کە دووربینی کـردن (الأحتيـاط) لـەواجب بـوونی شـتەکاندا، کارێکی واجبە بۆیە کار کردن بە فـەرموودەی یەکـەم لـە پێشـترە، لـە کـارکردن بـە فــەرموودەی دووەم:و هــەروەها فــەرموودەی یەکــەم ناســراو تــرو بڵاوتــرە لــە فەرموودەی دووەمو، کار کردن پێی بۆ هەژاران سوودی زیاترە، و باشترە.

## ٢٩٢- جۆرەکانی عام:[1]

عام سێ جۆرە:

- یەکەم: ئەو عامەی کە دەلالەت کردنی لەسەر گشتگیریو عام بوون دەلالەتێکی (قەطعي)یەو، لەسەر نەبوونی ئەگەری خاص بوون پێی، بەڵگە هەیە، وەك فەرمایشتی خوای مەزن کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾[2] واتە: چی گیانەوەر هەیە، لەسەر زەویدا، ڕۆزی لەسەر خودایە.

- دووەم: ئەو عامەی کە بە (قەطعي) مەبەست پێی خاص بوونە نەوەك عام بوون، بەهۆی بوونی بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لەو عامە، هەندێ لە تاکەکانییەتی نەوەك هەموویان، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗا﴾[3] واتە: خودا حەجی کەعبەی بڕیار داوە لەسەر خەڵکی، لەسەر ئەوەی کە توانای ڕێگای هەبێتو، هەروەها وەك ئایەتی: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾و ئایەتی: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ﴾[4] کە لێرەدا (الناس)و ئامرازی، کۆ لە (أقيموا)داو، (مَنْ) سەر بە لەفزەگشتییەکانن (عموم)ـن، بەڵام مەبەست پێیان هەندێ لە مرۆڤە موکەللەفەکانن، نەوەك هەموویان، چونکە هەر عەقڵ بڕیار لەسەر ئەوە دەداتو، ئەوە دەزانێت، کە شێتەکانو هەندێ لەوانەی کە ئەهلییەتی تەکلیفیان نییە، واتە: هیچ ئەرکێکی شەرعییان لەسەر نییە ئەمانە ناگرێتەوەو، لە چوار چێوەی حوکمەکە دەچنە دەرەوە، هەر وەك فەرموودە

---

[1] الرسالة، للأمام الشافعي، ل ٥٨، وو دواترو کتێبی خلاف، ل ٢١٧- ٢١٨.

[2] هود (٦).

[3] آل عمران (٩٧).

[4] البقرة (١٨٥).

هەیـە کـە پـاڵ پشـتـەو، ئـەو جـۆرە کەسـانە، لـە حوکمـەکان دەردەکـات وەك دەفەرموێت: (رفع القلم عن ثلاث، عن الصبي حتى يحتلم، و عن المجنون حتى يفيق، وعم النائم حتى يستيقظ) کەواتە: منداڵو شێتو، زۆر لێکراو هیچیان لەسەر نییەو، لە پرۆسەی تەکلیفەکە دەچنە دەرەوەو هەروەها نموونەیەکی تر ، وەك ئەو ئایەتەی کە سەبارەت بە ئـاگری دۆزەخ، دەفـەرموێت: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾[1] واتە: مرۆڤەکان (خەڵکی)و بەرد، دەستەچیلکەو هەڵگیرسێنەری ئـاگری دۆزەخـن، کە مەبەست لە (خەڵکی)، هەندێ لە مرۆڤەکانن، نەوەك هەموویان بـە بەڵگـەی ئـەم ئایەتە پیرۆزە، کـە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾﴾[2] واتـە: بێگومـان کەسـانێك لـە پێشـدا لـە لایـەن ئێمـەوە بـە هـۆی کاروکردەوە چاکەکانیانەوە، بەڵێنی پاشە ڕۆژی چاکتریان پـێ درابـوو، ئەوانـە لـەو ئاگرە دوور ڕادەگیرێنو گەرماو ناڕەحەتیش ناچێژن.

- سـێیەم: عـامی تایبـەتکراو (مخصـوص)، کـە بریتییـە لـەو عامـە ڕەهـا (موتڵەق)ـەی، کە هیچ نیشانەیەکی پێوە نییە، کە ئەگـەری تەخصـیص کردنەکـەی ڕەت بکاتەوەو، هەروەها نیشانەیشی لەسەر نییە، کە دەلالەت کردنی لەسەر (عـام) بوونەکەی دیسان ڕەت بکاتەوە، وەك فەرمایشتی خوای پەروەردگار، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾[3]

---

[1] التحريم (٦).

[2] الأنبياء (١٠١).

[3] البقرة (٢٢٨).

٢٩٤- گشتگیری لەفزەکان بایەخدارە، نەوەك تایبەتمەندی هۆکارەکان: ((العبرة بعموم اللفظ، لا بخصوص السبب))[1]:

ئەم دەستەواژەیە، لەسەر زمانی زانایانی ئوصولو، شەرعزانانەکان بڵاوەو، مەبەستیان ئەوەیە کە (عام)، لەسەر گشتگیریو عام بوونی خۆی هەردەمێنێتەوە، هەرچەندە بەشێوەی هۆکارێکی تایبەتی، وەك پرسیار، یان پێشهاتێکی دیاریکراو هاتبێتو، لەم ڕوانگەیەوە دەقەکانو ئەحکامەکان لەژێر سێبەری گشتگیری دەقەکاندا، بایەخدارو موعتەبەرنو، بایەخدار بوونیان پەیوەست نییە، بەو فاکتەرانەوە کە دەقەکەی لە پێناودا هاتووە، جا کە دەقێك بە شێوەیەکی گشتی (عام) هات، ئەوا پێویستە هەر بەو شێوە عامەی خۆی کاری پێ بکرێت، بەبێ گوێدان بەو هۆکارەی کە دەقەکەی لە پێناودا هاتووە، ئیتر ئەو هۆکارە پرسیار بووبێت، یان پێشهاتێك ڕوویدابێت، هەر چونیەکە، چونکە دەقەکە بە شێوەیەکی گشتی (عام) هاتووە، واتە: شەرع ویستویەتی حوکمەکەی عام بێتو، بەهۆی فاکتەرەکەیەوە تایبەت نەکرێت، واتە: ئەمەیش مەزهەبی حەنەفیو حەنبەلیو خەڵکی تریشە.

- نموونە لەسەر ئەم بابەتە زۆرن، لەوانە:

- یەکەم: کابرایەك هات، بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە دەچینە سەر دەریاو، ئاوێکی کەم لە گەڵ خۆمان دەبەین ((بۆ خواردنەوە)) ئەگەر بەو ئاوە دەستنوێژ بگرین، بەشی خواردنەوەمان نامێنێتو، تینومان دەبێت ئایا بەئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟ جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئاوی دەریا پاکەو، مردارەوە بووشی حەڵاڵە، جا دەقی ئەم برگەیەی کە فەرمووی: ((ئاوی دەریا پاکە))، عامەو بۆ کاتی ئاسایيو ناچاری دەبێتو،

---

[1] المسودة، ل ١٣٠، إرشاد الفحول، ل ١١٧- ١١٨.

تایبەتمەندی پرسیارەکە لێرەدا بایەخدار نییە، کە پرسیاری کرد، دەربارەی دروستی دەستنوێژگرتن بەو ئاوە چونکە کابرای پرسیارکەر پێویستی بەو ئاوە هەبوو، کە لەگەڵ خۆیدا بردبووی! هەروەها حوکمەکەیش تایبەت نییە تەنها بە کابرای پرسیارکەرەوەو، بەڵکو گشتییەو هەموو لایەك دەگرێتەوە.

– دووەم: پێغەمبەر (ﷺ) دای بەلای مەڕێکی مردارەوەبووداو فەرمووی: بۆچی پێستەکەی لێ ناکەنەوەو، دەباغو خۆشەی بکەنو، سودی لێ وەربگرنو، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر پێستێك دەباغو خۆشە بکرێت، پاك دەبێتەوە)) جا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) (عامەو (خاص) نییە، بەو مەڕەوە کە دیویەتی مردار بووەتەوەو، هەروەها تایبەت نییە، بە پێستی تەنها ئەو مەڕە مردارەوە بووە، و بەڵکو هەموو پێستێك دەکرێتەوە، لەم ڕووەوە کە بە دەباغو خۆشەکردن پاك دەبێتەوە.

– سێیەم: لە فورمووەدا هاتووە، کە خێزانەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیع، (خوا لێی ڕازی بێت) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)و پێی گوت: ئەمە دوو کچەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیعن، کە باوکیان لەگەڵ تۆدا لە شەڕی (ئوحود) شەهید بووەو، مامەکەیان موڵكو سامانەکەی بردوون، جا پێغەمبەر (ﷺ) بە مامی دوو کچەکەی گوت: سێیەك بدەن، بەو دووکچەو، هەشت یەکیش بدەن بە خێزانەکەیو، ئەوەی مایەوە بۆتۆ، جا ئەم بڕیارەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەم پێشهاتە، تایبەت نییە تەنها بەم پێشهاتەوە، بەڵکو سەراپای خەڵکی دەگرێتەوە، لەهەر پێشهاتێکی هاووێنەی لەم جۆرەداو، پرسەکە لەو ڕووەوە کاری پێ ناکرێت، کە باوکی ئەم دووکچە، لە پێناوی خوادا شەهید بووەو، یاخود ئەوەی کە ئەو دوو کچە موڵكو ماڵیان نییەو، دواجار پرسەکە گشتییە، (عام)ە.

- چوارەم ئەو ئایەتەی کە سەبارەت بە نەفرەت کردنی ژن و پیاو لەسەر خۆیان هاتووە، لە بابەتی بوختان بۆ یەکتری کردندا (اللعان)، هەر چەندە سەبارەت بە پێشهاتێکی دیاریکراو هاتۆتە خوارەوە، کە بەبەتی بوختان کردنی (هیلالی کوڕی ئومەییە)یە بۆ خێزانەکەی، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش، هەر پرسێکی گشتی (عام)ەو، سەرجەم ئەو هاوسەرانە دەگرێتەوە، کە بوختانی داوێن پیسی بۆ هاوسەرەکانیان دەکەن.

هەر بەم شێوازە، هەموو (عام)ێك، کە بەهۆکاری پرسێکی تایبەت (خاص) هاتبێت، وەك پرسیار کردن و پێشهاتەکان، ئەوە هەر کار بەگشتی بوون (عموم)ەکەی دەکرێت و، تایبەتمەندی هۆکارەکە بایەخدار نییە، چونکە هەروەك پێشەوا شافیعی دەفەرموێت: هۆکار (سبب) هیچ دروست ناکات، بەڵکو تەنها لەفزەکانن کە کارەکان دروست دەکەن و، شەرعزانە موسوڵمانەکان لەسەر دەمی پێغەمبەر (ﷺ) هەر بەم شێوازەیان کردووەو، هەروەها لەسەردەمەکانی دوای ئەویشدا هەروایان کردووە، بۆیە وەك ئیجماعی لێهاتووە، و کەس نکۆڵی لێ نەکردووە، بۆیە شایەنی باسە ، کە زۆرینەی پرسە گشتییەکانی قورئان و سوننەت بەهۆی پرسیاری خەڵکەوە ڕوویانداوە، یاخود بەهۆی پێشهاتەکانەوە بووەو، سەرەڕای ئەمەیش شەرعزانەکان بە بێ نکۆڵی کردن کاریان بەلایەنە گشتگیرەکەی (عموم)ـەکەی، کردووە، هەروەك گوتمان.

هەروەها لە یاسا دەسکردەکاندا، بەهەمان ئەم ڕەوتە کارکراوەو، لەفزەکان جێگای بایەخن، نەوەك ئەحکامەکان، هەرچەندە دانانی حوکمەکان لەبەر هۆکاری تایبەت بوبێت، یاخود لەبەر هۆکاری پێشهاتی دیاریکراو بووبێت، کە دانراین.

## (( مەبەستی سێیەم ))

## (( المشترك[1]: هاوبەش ))

٢٩٥- پێناسەکەی:

المشترك، لەلای زانایانی ئوصولی فیقه، بریتییە لەو لەفزەی کە چەند تاکێکی جیاوازی سنوردار دەگرێتە خۆ، واتە: لە جیاتی هەر یەکە لەو تاکانە، بەکار دەهێنرێت، یاخود بە دەستەواژەیەکی تر ((المشترك)) بریتییە لەو لەفزەی کە بۆ دوو مانا، یان زیاتر، و بەشێوە دانانی جیاواز، دانراوە، کەواتە وا دانراوە، کە بەیەك شێواز دەلالەت بکات، لەسەر ئەو ماناو شتە جیاوازانە، بەڵکو هەر یەکە بەپێی دانانی خۆی، واتە: بۆ هەموو مانایەك لە ماناکانی بە گوێرەی سنووری خۆی لەفزەکەی بۆ دانراوە، وەك بڵێی یەکجار بۆ ئەو مانایە دانراوەو، دواتر بۆ مانای دووەمو، بەم جۆرە...

نموونەی ئەو لەفزە (مُشْتَرَك)ـەی، کە تەنها بۆ دوو مانا دانراوە، وەك لەفزی (قُرْءْ)، کە هەم بۆمانای (طُهر: پاکێتی)و، هەم بۆ مانای (حَیض: بێ نوێژی) دانراوە.

نموونەی ئەو لەفزە موشتەرەك (هاوبەش)ـەی، کە بۆ دوومانا زیاتر دانراوە، وەك لەفزی (عَیْن)، کە بۆ چەندەها مانا دانراوە، لەوانە (عین الباصرة: چاوی بینین)و، (عین الماء: سەرچاوە ئاو)و، هەروەها بە مانای (سیخوڕ)و، (کالآ) هاتووەو، دانانی ئەم لەفزە بۆ ئەو مانا گەلە، شێوەدانانێکی ژمێراوو چەندایەتی بووە، واتە: دانانی ئەم لەفزە بۆ ئەو ماناگەلە دانانێکی سنووردارو جیاواز لەوی تریان بووە هەر یەکە

---

[1] شرح المنار، ل ٣٣٩، المحلاوي، ل ٨١- ٨٢، أصول الفقه، للأستاذ أبو زهرة، ل ١٦٠و دواتر، أصول التشريع الأسلامي، للأستاذ علي حسب الله، ل ٢١٧و دواتر، علم أصول الفقه، للشيخ عبد الوهاب خلاف، ل ٢٠٧-و دواتر.

بە پێی خۆی وەك لەفزی (مَوْلی) کە هەم بۆ ئازاد کەرەکەو، هەم بۆ ئازادکراوەکە بە کار هێنراوە.

٢٩٦- هۆکارەکانی بوونی ((مشترك) لە زمانی عەرەبیدا:

ئەو لەفزە هاوبەشانەی کە لەزمانی عەرەبیدا هەنو، بلاون، هیش ڕێگایەکمان نییە بۆ نکۆڵی کردن لێیانو، زانایانیش چەندەها هۆکاریان باس کردوون، بۆ بوونی ئەم لەفزە موشتەرەکانە کە گرینگترینیان بریتین لەمانەی خوارەوە:

- **یەکەم:** جیاوزی هۆزە عەرەبەکان ، لە دانانی لەفزەکان بۆ مانا مەلگرەکانیان کە هۆزێك لەفزێکی بۆ مانایەك داناوە، لە کاتێکدا کە هۆزێکی تر هەمان لەفزی بۆ مانایەکی ترداناوەو، سێیەم جار هۆزێکی تر هاتووە، بۆ مانایەکی جیاواز تردایناوە، بۆیە دانانەکان زۆرن، و هەریەکە بەپێی خۆیو بەمانای جیاوازی خۆی بۆیە کە گوازاراوەتەوە بۆ ئێمە لەفزەکە هەلگری ئەو ماناگەلە جیاوازە بووەو، لەو ماناگەلە جیاوازەدا بەکار هێنراوە، بەبێ ئەوەی کە زانایانی زمانی عەرەبی هیچ زانیارییەکیان دابێت، لە سەر ئەم دانانە، و جیاوازانەی لەفزانە، یاخود لەسەر دانەرەکانیان!

- **دووەم:** جاری وا هەیە کە لەفزێك بۆ یەك مانا دانراوە، بەڵام بۆ مانای تر بەناڕاستەو خۆیی (مجاز) بەکار هاتووەو دواتر ئەو بەکار هێنانە مەجازییە بڵاو بۆتەوە، بەناو خەڵکیدا تا ئەو پلەیە کە خەڵکی بیری چۆتەوە، کە ئەو مانایە مانای مەجازی لەفزەکەیە، بۆیە وا دەگوێزرێتەوە بۆ ئێمە کە ئەو لەفزە دانراوە، بۆ هەردوو مانا حەقیقیو مەجازییەکە.

- **سێیەم:** ئەوەیە کە لەفزەکە دانرابێت، بۆ مانایەکی هاوبەش لە نێوان دوو مانادا، کە لەم حاڵەتەدا، دروستە لەفزەکە بۆ هەردووکیان بەکار بهێنینو، دواجار خەڵکی ئەم مانا هاوبەشەی کە هۆکار بووە، بۆ دروستی بەکار هێنانی لەفزەکە بۆ

هەر دووماناكە، بیریان دەچێتەوەو، وا گومان دەبەن، كە لەفزەكە سەر بەجۆری هاوبەشی لەفزییە وەك لەفزی (قُـرْءْ) كە لـەزمانی عەرەبیـدا بـەكار دەهێنرێـت، بـۆ هەركاتێك كە تیایدا نەریت وایە شتێكی دیاریكراو ڕوو بداتو، هـەر بـەم هۆیـەوە بـە (تا گرتن) دەگوترێت. (قُرْءْ)، واتە: ئەو كاتەی كە خولی ئاسایی ئەو تایە تیایـدا ڕوو دەداتو، بە ئافرەتیش دەگوترێت، (قرْاءْ)، واتە: ئەو كاتەی كە تیایدا دەكەوێتە بێ نوێژییەوەو، هەروەها ئـەو خولـەی تـر كـە تیایـدا پـاك دەبێتـەوە، و هـەروەها وەك لـەفزی (نیكـاح)، كـە بـۆ مانـای پێكـەوە ئاوێتـە بـوون، و پەیوەسـت بـوون بـەكار دەهێنرێت، و هـەروەها بـۆ خـودی گرێبەسـتەكەیش بـەكار دەهێنرێـت، چـونكە لـە گرێبەستەكەیشـدا پێكـەوە بەسـتنو ئاوێتـەكردنی لـەفزەكانی (إیجـابو قبول)ـــی، تیادایە، كە لە دەمی هـەردوو لایەنەكـەوە دەردەچـێتو، هـەروەها ئـەم لـەفزە، بـۆ پرۆسەی سەرجێی كردنیش بەكار دەهێنرێت، بەڵام زیاتر واناسراوەو، بڵاو بۆتـەوە، كە بۆ خودی گرێبەستەكە بەكار دەهێنرێت، بۆیە هەندێك وا گومانیـان بـردووە، كـە لەفزی (نیكاح) لە گرێبەستەكەدا حەقیقییەو بۆماناكانی تری، مەجازییەو، هـەروەها گـروپێكیش وا گومانیــان بــردووە، كــە بــۆ مانــای پرۆســەی ســەرجێیی كــردن، حەقیقییەو، بۆ گرێبەستەكە مەجازییە.

- **چوارەم:** ئەوەیە كـە لەفزەكـە لـە زمانـدا بـۆ مانایـەك دانرابێـتو، دواتـر لـە زاراوەدا بۆمانایەكی تر، وەك لەفزی (صلاة)، كە لەزمانی عەرەبیدا بۆمانـای (دعـاء: نزاكردن) دانراوەو لەزاراوەی شەرعدا، بۆ ئەو پەرستشـە ناسـراوە دانـراوە كـە نوێـژ كردنە.

**٢٩٧- حوكمی (موشتەرەك):**

ئەگەر لـە دەقێكـی شـەرعی قورئـانو سوننەتدا، لـەفزێكی هاوبـەش ((مشـترك)) هـات، ئـەوا سـەرنجی لێ دەدەیـنو، تەماشـای دەكـەین، ئەگـەر لـە نێـوان مانـا

زمانەوانیو مانا زاراوەیی شەرعییەکەدا هاوبەش بوون ئەوا مانای دووەمی بۆ دادەنێین، کە زاراوەییەکەیەو، ئەگەر لە زماندا لە دوو مانا یان زیاتردا، هاوبەشی هەبوو، ئەوا لەسەر یەکێك لەو مانایانە ڕایدەگرینو دای دەنێین، بەڵام بەپێی بەڵگەیەك کە دەلالەت بکات لەسەر ئەو دانانە، بۆ ئەو مانایەیان.

**٢٩٨- نموونە گەلێکی ئەم باسە:**

**یەکەم:** لەم فەرمایشتەی پەروەردگاردا، کە دەفەرموێت: (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ) کە لێرەدا، (تەلاق) لەسەرمانای زاراوە شەرعییەکەی مانا دەکرێتو، دادەنرێت، کە بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییە هاوسەرایەتییە دروستەکانو، بە گوێرەی مانا زمانەوانییەکەی مانا ناکرێت، کە بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەو کردنەوەی ڕەهای گرێکانو، هەروەها لە ئایەتی: (أقيموا الصلاة)دا، کە مەبەست لە لەفزی (الصلاة: نوێژ) بریتییە، لە مانا زاراوەییە شەرعییەکەی، کە دەکاتە ئەو پەرستشە ناسراوەی کە شێوازو پایەی تایبەتی خۆی هەن، نەوەك مانا زمانەوانییەکەی کە بریتییە ، لە (الدعاء: نزاکردن).

هۆکاری مانا کردنی لەفزی موشتەرەك (هاوبەش) بەمانا زاراوەییەکەی نەوەك مانا زمانەوانییەکەی، ئەوەیە کە شەرع ئەم لەفزەی لە مانا زمانەوانییەکەیەوە، بۆ مانا زاراوەییە شەرعییەکەی گواستۆتەوە، و تیایدا مانا شەرعییەکەی بەکار هێناوە، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە لەفز، لە نەریتی شەرعدا، دەلالەتێکی دیاریکراوو ڕۆشنی هەیە، لەسەر ئەو شتەی کە شەرع بۆیی داناوەو، کارکردنیش بێگومان لەسەر ڕەوتی شەرع واجبەو پێویستە.[1]

---

[1] لەو لەفزانەیدا، کە لەدەقە یاساییە دەستکردەکاندا هاتوون، هەر بەم شێوازە مامەڵە دەکرێتو، ئەگەر لەفزێك لەم یاسایانەدا هاتو دوومانای زمانەوانیو زاراوەیی یاسای هەبوو، ئەواکار بەمانا زاراوەییە یاساییەکەی دەکرێت، نەوەك بەمانا زمانەوانییەکەی.

- **دووەم:** لـه فەرمایشـتی پـەروەردگاردا کـه دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾[1] کـه لێـرەدا لـەفزی (قُـرْءٌ) بۆمانـا زمانەوانییەکـەی بەکار هاتووە، کە یـان پـاکێتی (طهر)ـه، و یـان بـێ نوێـژی (حَـيْض)ـه، بۆیـه لـه سەرکەسـی موجتەهیـد پێویسـته، کـه هـەوڵی خـۆی بخاتـەکار، بـۆ زانینـی مانـای مەبەسـت تیایـدا، چـونکه شـەرع تـەنها یـەك مانـای مەبەسـت بـووە، بـەڵام موجتەهیـدەکان سـەبارەت بـه ڕونکردنـەوەی مانـای مەبەسـت تیایـداو، هەریەکـەو بەپێی ئیجتیهاد، و تێڕوانینـی خـۆی، و هـەر یەکـه بـه پێـی ئـەو پێـوەری تـەرجیح دانەی کە هەیانە، وەك نیشانە بۆ دەلالەت کردن لە هەرکام لەو مانایانـەی کـه پێـی ڕازین، ڕاجیاییان هەیـه، بۆیـه دەبیـنین کـه لەسـەر مانـای (قُـرْءٌ) ڕای جیاوازیـان لێ دەرکەوتووە، و هەندێکیان دەڵێن، کە بۆ (پاکبوونەوە)یە هەندێکی تریشـیان ڕایـان وایە، کە مەبەست پێی (بێ نوێژی)یە.

ئەوانـەی کـه ڕایـان وایـه، کـه مەبەسـت پێـی (پاکبونەوە)یـه، چـەند بەڵگـەو نیشانەیەکیان لایە، لەوانە کە لەفزی (ثلاثة) بە پیتی (تاء)ـی، تـەئنیثـەوە هـاتووە، و تـەئنیـثـیش دەلالـەت لەسـەر ئـەوە دەکـات، کـه شـته ژمێراوەکـه موزەککـەرەو، لێرەیشدا موزەککەر (طهر: پاکبوونەوە) کەیە، نەوەك بێ نوێژییەکە (الحيضة) بۆیـه ئەوە مەبەستەکەیە، لە لەفزی (قُرْءٌ).

گروپەکەی تریش، ژمارەیەك نیشانەو بەڵگـەیان لایـه، لەوانـه ئەوەیـه کـه لـەفزی (ثلاثة) تایبەتەو، بە شێوەیەکی (قـەطعـي) دەلالـەت دەکـات، لەسـەر ئـەو تایبـەتی بوونەو کەواتە ماوەی عیـددە بریتییـه لەسـێ جـار (قُـرْءٌ) بـه بـێ زیادوکـەمو، هـیچ ڕێگایەکیشمان نییە، بۆ گەیشتن بەو ئەندازەیـه، مەگـەر بەتـەنها دانـانو مانـاکردنی

---

[1] البقرة (٢٢٨).

(قُرْءٌ) به (الحيضة: بێ نوێژی) دەبێتو، ئەو شتەی کە جەخت لەسەر ئەم مانایە دەکاتەوەو، بە لەپێشتری دادەنێت، ئەوەیە کە مەبەست لە (عیددە)، بریتییە لە بوونی زانیاری، لە خاڵی بوونی سکی ئافرەتەکە لە منداڵو، ئەم پرۆسەیەش (حیض:ماوەی بێ نوێژی) فێرمانی دەکات، و زانیاریمان لەسەری دەداتێ!

نموونەیەکی تری، ئەم باسە وەك ئایەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ﴾[1] واتە: خۆ ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك مرد، و (باوكو باپیرو منداڵی) نەبوو! کە لێرەدا لەفزی (كَلَٰلَةً )، لەفزێكی هاوبەشە، بۆ ئەو كەسانە بەكار دەهێنرێت، کە لە دوای مردنی خۆی باوكو باپیرو منداڵ بەجێ ناهێڵنو، بۆ ئەو میرات بەرانەیش بەكار دەهێنرێت، کە نەباوكنو نە كوڕ لە پرۆسەكەداو، هەروەها بەكار دەهێنرێت، بۆ ئەو خزمانەی کە لە ڕێی غەیری باوكو كوڕەوە، بوونەتە خزم، كەواتە: لەسەر كەسی موجتەهید پێویستە کە بەگەڕانەوەو سەرنجدان لەنیشانەكانو دەقە هاتووەكانی ناو ئەم بابەتی میراتە، مەبەستی تەواوی ئەم مانای (كَلَٰلَةً )یە، ڕۆشن بكاتەوەو، جەماوەری شەرعزانان لەدوای ئەوەی کە ئەو ڕاستییەیان لا جێگیر بوو، لە دەقەكانی بواری میراتەوە، ئەم مانایەیان بەلە پێشتر داناوە، کە مەبەست لە(كَلَٰلَةً )، مانای یەكەمە واتە: ئەو كەسەی کە لە دوای مردنی خۆی، نە باوكو باپیرو، نەدایكو بەرەوژووتری، و نە منداڵی بەجێ نەهێشتووە.

---

[1] النساء (١٢).

### ٢٩٩- ئاستی گشتگیری لەفزی ((موشتەرەك: هاوبەش))[1]:

مەبەست لەم دەستەواژەی سەراپاگیری‌و گشتگیرییەی لەفزی موشتەرەك ئەوەیە کە، مەبەست لە بەکار هێنانی لەفزی موشتەرەك (هاوبەش) بریتی بێت، لە بەکار هێنانی بۆ سەرجەمی ئەو مانایانەی کە بۆی دانراوەو، زانایانی زانستی ئوصولی فیقهیش لەسەر ئەم پرستە ڕاجیاییان هەیەو، لە چەند گوتەیەکدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەریان بڕیوە:

- **گوتەی یەکەم:** جەماوەری زانایانی ئوصولی فیقە، ڕایان وایە، کە ناتوانرێت سەرجەمی ماناکان لەو لەفزە موشتەرەکەدا بەر جەستە بکرێتو، بەکارهێنانی موشتەرەك تەنها لەیەك ماناداو بۆیەك مانا دروستەو، بۆ ئەو فرەمانابیە دروست نییە، کە بۆی دانراوەو، نابێت بەیەك مانا بۆی بەکار بهێنرێتو، بەڵگەی ئەم گروپەیش ئەوەیە کە لەفزی موشتەرەك بۆ ئەو هەمووە مانایە، دانە نراوە کە بەیەك شێوە دانان دەلالەت لەسەر هەموویان بکات، بەڵکو دەبێت بەشێوەی دانانی جیاجیا هەر جارەو دەلالەت لەسەر مانایەك لەو مانا و مەبەستانە بکات، واتە: هەر یەکێك لەو مانایانە لەفزی موشتەرەکی تایبەت بە خۆیی بۆ بەکار دەهێنرێت، کە لە چوار چێوە و سنووری خۆیدا دەلالەت لەسەر ئەو مانا و مەبەستە بکات، کە بۆی دانراوەو، بۆیە بەکار هێنانی سەر جەمی ئەو مانایانە پێکەوەو، بەیەك شێوە دانان، دروست نییەو، کارێکی لەم جۆرە پێچەوانەی ڕیشەی دانانی لەفزەکەیە، بۆیە بزانە کە لەفزی موشتەرەك دەلالەت دەکات لەسەر ئەو مانایانەی کە بۆی دانراوە، بەڵام هەر یەکە بە پێی خۆی‌و بەگوێرەی خۆی، نەوەك بەگشتگیری‌و سەراپاگیری، واتە: دەلالەت لەسەر مانایەك لە ماناکان دەکات، بەڵام

---

[1] الأمدي، ب٢، ل٣٥٢و دواتر، شرح المنار، ل٤٣١و دواتر فواتح الرحموت بشرح مسلم الثبوت، ب١، ل ٢٠٠.

بەیەكجار دەلالەت ناكات، لەسەر هەمووی ماناكان، چونكە هەر پرۆسەی دانانی لەفزەكە لە بنەڕەتدا ژمێردراوەو، یەك كەرەت نییەو، ئەمەیش جیاوازی نێوان لەفزی موشتەرەكو بابەتی (عام)ـە، چونكە (عام) دەلالەت دەكات لەسەر سەرجەمی ئەو تاكانەی كە لەفزەكەی دەیدات بەدەستەوەو، ئەم پرۆسەیەش بەگشتگیریو گرتنەوەی سەرجەمی تاكە پێكهێنەرەكانی ڕوو دەدات، نەوەك بە جیاجیا، یاخود یەكێكیان بگرێتەوەو، یەكێكیان نەگرێتەوە.

- گوتەی دووەم:

لەفزی موشتەرەك، هەر چەندە لە بنەڕەتدا بۆیەك مانا دانراوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش هەردوو ڕستەكە مەبەست پێی سەرجەمی ماناكانی بێت، لەیەك كاتداو، لێرەدا وەك (عام) وایە، لە گشتگیری كردنیدا، بۆ دەلالەت كردن لەسەر ئەو شتانەی كە بۆی دانراوەو، بەڵگەی ئەم ڕایەیش ئەوەیە كە لە قورئانی پیرۆزدا شتی لەم بابەتە، هاتووە وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾[1] واتە: ئاخۆ نەتزانیوە،كە هەرچی لە ئاسمانەكانو، لە زەویدایە، سەرجەمی هەموویان سوجدە بۆ خوا دەبەن؟ خۆرو هەیڤو ئەستێرەو كێوەكانو درەختو گیانەوەرانیش هەر سوجدە بۆ خودا دەبەن، هەروەها زۆرێكیش لە خەڵكی بە ئارەزووی خۆیانو، پێخۆشبوونی خۆیان هەر سوجدە بۆ خوای پەروەردگار دەبەن. (سوجدە)، واتە: دانای ناوچەوان لەسەر زەوی، ئەمە سەبارەت بە مرۆڤ، و سەبارەت بە غەیری مرۆڤە كانیش بەمانای ملكەچیو وا بەستەیی بە تۆبزی دێتو، هەر وەك تێبینی دەكرێت، ئەم دوو مانایە مەبەست جیاوازن، كە لە لەفزی (یسجد)دا، هاتوون، كە لەدەقە قورئانییەكەدا دەركەوتووەو، لێرەیشدا بەڵگە

---

[1] الحج (١٨).

لەسەر ئەوە دروست دەبێت، کە دروستە ئەو لەفزە موشتەرەکە بەکار بهێنرێتو، لە بەکار هێنانەکەیشدا مەبەست پێی سەرجەمی ماناکانی بێت.

بەڵام هەوادارانی گروپی یەکەم، ئەم بەڵگە هێنانەوەیە بەوە بەرپەرچ دەدەنەوە، کە مانای سوجدە لە ئایەتە پیرۆزەکە، بریتییە لە ویستی ملکەچیو فەرمانبەرداری کردن، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئایا بەویستی خۆی کردوویەتی، یان بەزۆر پێی کراوە.

وە ئەم مانایەش لە مرۆڤو غەیری مرۆڤیشدا پراکتیزە دەبێتو، ئەم پرسە سەر بە بابەتی موشتەرەکی مەعنەوەییە، نەوەك لەفزی، بەڵام هێنانی دەقی (کثیر من الناس) لە ئایەتە پیرۆزەکەدا، ئاماژەیەکی تیادایە، بۆ ملکەچیکردن بە ویستی خودی مرۆڤەکە.

- **گوتەی سێیەم:**

ئەم گروپە بەلایانەوە دروستە، کە مانای لەفزی موشتەرەك سەراپاگیر بێت، بەڵام درێژە باسێکیان لەم بارەیەوە هەیە، بەوەی کە دروستە مەبەست لە لەفزەکە گشتگیری بێت، بەڵام لە بابەتی نەفی کردندا، نەوەك جێگیر (إثبات) کردندا، وەك ئەوەی کە سوێند بخوات لەگەڵ کۆیلەکانی فلانەکەس قسە ناکات، ئەوە ئەگەر لەگەڵ کۆیلەو خزمەتکارە باڵادەستو ژێردەستەکانیدا قسە بکات، هەر چونیەکەو سوێندەکەی دەکەوێت.

هەروەها ئەگەر کەسێك سێیەکی ماڵەکەی خۆی بکاتە وەسیەت، بۆ خزمەتکارەکانی، یان بۆ گەورەکەی خۆی ئەوە وەسیەتەکەی بەتاڵە، چونکە لێرەدا مانای لەفزی کابرای وەسیەت بۆکراو دیار نییەو، یەکلایی نییە چونکە ناوی (المَوْلی: بەندەو کۆیلەو خزمەتکار) هاوبەشە،و بۆ کەسی ئازاد کەری کۆیلە، و

هەروەها خودی کۆیلەی ئازاد کراویش بەکار دەهێنرێت، بەڵام لە بابەتی جێگیر کردن (إثبات)دا، سەراپاگیری لەفزی موشتەرەك بوونی نییە.

لەم پرسەدا، ڕای لە پێشتر (الراجح) بریتییە لە گوتەی جەماوەری زانایانو، بۆیە مەبەست لە لەفزی موشتەرەك تەنها یەکێك لە ماناکانیەتیو، دواجار بە نیشانەو بەڵگەی بایەخدار ئەو مانا مەبەستو داواکراوە لەناو هەموویاندا دەدۆزرێتەوەو، یەکلایی دەکرێتەوە.

## ((بەشە باسی دووەم))

## دابەش کردنی لەفز، لە ڕووی بەکار هێنانییەوە بۆ ماناکان:

### یەکەم: حەقیقەت:[1]

لەفز لەڕووی بە کار هێنانییەوە، بۆ ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، یان بۆ هەر مانایەکی تر، دەبێتە چوار بەشەوە، کەبریتین لە، بەشەکانی (الحقیقة)و، (المجاز)و، (الصریح)و، (الكناية)، کە بەکورتی لەسەر هەر یەکەیان دەدوێین:

٣٠١- حەقیقەت، بریتییە لەو لەفزەی کە بەکار هێنراوە، بۆ هەمان ئەو شتەی کە بۆی دانراوەو، جاری وا هەیە، کە ئەم حەقیقەتە زمانەوانییەو، جاری وا هەیە کە حەقیقەتێکی شەرعییەو، جاری وا هەیە کە ڕاستییەکی نەریتییە، واتە: (الحقیقة العُرْفِيَّة)، جا حەقیقەتی زمانەوانیی، دەدرێتە پاڵ دانەری زمان، و حەقیقەتی شەرعیی، دەدرێتە پاڵ شەرعدانەر، و حەقیقەتی عورفیش دەدرێتە پاڵ عورفی تایبەت (خاص)، و عورفی گشتی (عام).

---

[1] اصول السرخسي، ب١، ل ١٧٠- ١٧١، منهاج الوصول إلى علم الأصول، للبيضاوي، ل ٢، المحلاوي، ل ٩١- ٩٢.

– حەقیقەتی زمانەوانی: بریتییە لەو لەفزەی کە بەکار هێنراوە بۆ هەمان ئەو مانا زمانەوانییەی خۆی کە بۆی دانراوە، وەك (خۆر)و، (مانگ)و، (ئەستێرەکان)، کە ئەم لەفزانە لە زماندا بۆ ئەو پێکهاتە ڕووناکە ناسراوانە دانراون، کە دەیانبینین.

– حەقیقەتی شەرعیی: بریتییە لەو لەفزەی کە بەکار هێنراوە بۆ خودی مانا شەرعییەکەی، واتە بۆ ئەو مانایەی کە شەرع دانەر ویستویەتی، وەك (نوێژو، حەج کردنو، زەکات)، لەو پەرستشانەی کە تایبەتنو ناسراونو، هەروەها وەك ژنهێنانو ژن تەڵاقدانو، پرۆسەی (خولع)[1] کە سەرجەمیان دانراون، بۆ ئەو مانایانەی کە شەرع مەبەستییەتی تیایاندا.

– حەقیقەتی عورفی (نەریتی): بریتییە لەو لەفزەی کە لە مانا عورفییەکەی خۆیدا بەکار هێنراوە، واتە: ئەو مانایەی کە عورفو نەریت ئەو جۆرە لەفزەیان بۆ بەکار هێناوە، ئیتر ئەو عورفە، عورفێکی گشتی بێت، یان عورفێکی تایبەت بەخەڵکی خاوەن پیشەیەکی دیاریکراو یان زانستێکی تایبەت، هەر چونیەکە، وەك (سیارة: ئۆتۆمبێل)، کە عورفی گشتی لەسەر ئەوەیە کە بەکار دەهێنرێت، بۆ ئەو ئامێرە ناسراوەی گواستنەوە کە دەیبینینو، هەروەها وەك لەفزی (دابة) کە بۆ (چوار پێ) بەکار دەهێنرێتو، هەروەها وەك ئەو لەفزە زاراوەییە بەکار هێنراوانەی کە لە عورفی خاوەن پیشەکاندا هەن، یاخود لە زانستێك لە زانستەکاندا هەن، وەك لە ڕەفع پێدانو نەصب پێدان لە عورفی زانایانی زمانداو، سنور (الحد)و چییەتی (ماهیة) لەلای زانایانی لۆژیك (منطق)و، لەفزی (فقه)لەلای زانایانی شەرعو، ووریاکردنەوە (إنذار)و هەڵوەشاندنەوە (الفسخ)و، لە کار خستن (إقالة) لەلای زانایانی یاساو، هتد....

---

[1] ((خُلْع: داماڵین)) بریتییە لە وازهێنانی پیاو، لە ژنەکەی خۆی، بەدانی (برێتی)ییەك، لەلایەن ژنەکەوە، تا لە پیاوەکەی دا بماڵرێتو ڕزگاری ببێت.

**٣٠٢- حوكمی لەفزێك بەدیوە ڕەسەنەکەی خۆی (حەقیقەت) بەکار هێنرابێت:**

حوکمی سەرجەم جۆرەکانی حەقیقەت ئەوەیە کە ئەو مانایەی کە بۆ لەفزەکە دانراوە لەلای لایەنەکانی ئەو گفتوگۆو دیالۆکە، بە سەریدا جێگیر دەکرێتو، ئەم لەفزە جیانابێت، لەو مانایەی کەبۆی دانراوەو پڕ بە پێستی یەکترینو، حوکمەکەیش هەر پەیوەستە پێیەوەو، لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر پیاوێك وەسیەتی کرد بۆ کوڕەکەی (زەید)، کە هەزار دینار لە میراتەکەی پێ بدرێت، ئەوا وەسیەتەکە بۆ ئەو کوڕەی (زەید) دادەنرێتو، ناخرێتە سەر کەسی تر، چونکە ناتوانرێت کە بەو کوڕەی (زەید) بگوترێت، کە کوڕی (زەید) نییەو، هەروەها وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾[١] واتە: کەس بەناهەق مەکوژن، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا لەفزی (قتل) بە مانای کوشتنو گیان لێ سەندنەوەی حەقیقیی لە مرۆڤێك، و نەهییەکەیش ئاڕاستەی ئەم حەقیقەتە کراوە، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە وە ناتوانین کە بە ناڕەوا کردەوەو، تاوانێکی لەم جۆرە ئەنجام بدەین.

هەروەها حوکمی حەقیقەت ئەوەیە، کە زاڵ دەکرێت بەسەر شتی ناحەقیقی (مجازی)دا، واتە: حەقیقەت لە پێش مەجازەوەیە، بۆیە هەر کات گونجا، کە لەفزێك بەپێی مانا حەقیقییەکەی خۆی مانا بکەین، ئەوە حوکمەکە بە گوێرەی حەقیقەتەکە دەردەکەین، نەك ڕەهەندە مەجازییەکەی، بۆیە هەرکەس وەسیەتی پێدانی هەر شتێکی کرد بۆ کوڕەکەی (زەید)، ئەوە ئەووەسیەتە جێگیر دەبێت بۆ کوڕەکەی ((زەید)) نەوەك بۆ کوڕی کوڕەکەی (زەید)، و لەفزەکە لەسەر مانا حەقیقییەکەی هەژمار دەکرێت، نەوەك مانا مەجازییەکەی، چونکە هەرکات بوارو

---

[١] الأنعام (١٥١).

دەرفەت هەبوو، دەگونجا کار بە مانا حەقیقییەکەی بکرێت، ئەوا مانا مەجازییەکەی وەلا دەنرێت، چونکە مانای مەجازی دەرهاویشتەو جێگری حەقیقەتو بنەڕەتەکەیە، شتی جێگرەوەیش نابێت پێچەوانەو دژی بنەڕەتی خۆی (أصل) بێت.

## دووەم: ((المجاز))[1]:

٣٠٣- مەجاز بریتیەە لەو لەفزەی کە بەکار هێنراوە، لە غەیری ئەو شوێنەیدا کە بۆی دانراوە، بەهۆی بوونی کۆنتاکتو پەیوەندییەك لە نێوان لەفزەکەو، ئەو جێگایەدا کە تیایدا دانراوەو، هەروەها بە هۆی بوونی نیشانەیەکەوە کە ڕێگرە لە دەرخستنو ویستنی مانا حەقیقییەکەی لەفزەکە، وەك بەکار هێنانی لەفزی (شێر)، بۆ (کەسی ئازاو چەلەنگ)و، پەوەندی نێوان ئەم دوانەیش بریتییە لەو مانایەی کە کۆکەرەوەی نێوان مانا ئەسڵییەکەی لەفزەکەو ئەو مانایەیە کە لەفزەکەی تیادا بەکار هێنراوە، کە (ئازایەتی)یە.

مەبەستیش لە بوونی نیشانە (قرینة)، بریتییە لەو نیشانە گونجاوەی کە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی کە کابرای قسەکەر لەو لەفزەیدا کە دەری بڕیوە، مەبەستی پێی مانا حەقیقییەکەی لەفزەکە نەبووەو، بەڵکو مەبەستی مانا مەجازییەکەی بووە.

- **جۆرەکانی پەیوەندی:**

١. لێکچوون (المشابهة)، واتە: هاوبەشی بوون، لە وەصفێکی دیاریکراودا لە نێوان مانا حەقیقییەکەی لەفزەکە، و ئەو مانا مەجازییەدا، کە بۆی بەکار

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل١٧١و دواتر، شرح التلويح على التوضيح ل ٧٣و دواتر، هەروەها ل ١٦٩، پاشان المحلاوي ل ٩٧- ٩٤، محاضرات في اصول الفقه، للأستاذ بدر المتولي عبدالباصط ب٢، ل ٢١و دواتر.

هێنراوە، وەك لەو گوتەیەی خەڵکی شاری مەدینەدا دەر كەوتووە، كە لەكاتی تەشریف هێنانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ شارەكەیان دەیانگوت: (طلع البدر علينا: وا مانگ لێمان دەركەوت)، كە ئەم لەفزە كۆكەرەوەی ڕووناكییە لە نێوان ئەو مانگەی كە بەئاسمانەوەیەو لە نێوان دەمو چاوی پێغەمبەری ئازیزدا (ﷺ)، كە ئەو ڕۆشناییەصیفەتە هاوبەشەكەیە، و هەروەك گوتمان: (ئازاد شێرە) مەبەست ئەوەیە كە هەردووكیان لە صیفەتی ئازایەتیدا هاوبەشن، و كاتێكیش كە كەسێكی فێڵباز و تەڵەكەباز بە (ڕێوی) دەشوبهێنین، و ناودەبەین، مەبەست ئەوەیە كە هەردووكیان لە فێڵ و حیلەبازیدا هاوبەشن، و هتد .....

٢- كَوْن: واتە: ناونانی هەرشتێك بەو شێوازەی كە لەسەریەتی، واتە: ناونانو ناوزەدكردنی بەو حاڵەوەی كە پێشتر پێوەی وەصف كراوە، وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار كە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ﴾[1] واتە: ئەو مرۆڤە باڵغ بووە، خاوەن ئاوەزانەی كە بێ باوكن، چونكە ڕادەست كردنەوەی موڵكو سامان بۆ كەسی بێ باوك (اليتيم)، واتە: ئەو منداڵەی كە باوكی مردووە، دەبێت ئەم كارەو ئەم پێدانەوەیە لەدوای باڵغ بوونو عەقڵو ئاوەزكرانەوە بێت، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾[2] واتە: هەتیوان بخەنە ژێر تاقیكردنەوەوە، هەتا ئەگەنە تەمەنی بلوغ بوونو، ژن خواستنو توانای ژنو مێردی، واتە: بەجارێ ماڵو موڵكەكە هەمووی مەكەنەوە مشتیان، بەڵكو جارو بار شتێكیان بدەنێو چاودێریان بن، ئاخۆ ئەزانن؟ خەرجی بكەن؟! ئینجا ئەگەر

---

[1] النساء: (٢).

[2] النساء: (٦).

بینیتان بە فامو ژیرن، و خاسو خراپ لەیەکتری جیادەکەنەوە، ئەوسا ئێوەیش بێ دواکەوتن ماڵو سامانەکەیان بدەنەوە.

٣ – (أوْل)، واتە: ناونانی شتێك بەو حاڵەتەی کە لە ئایندەدا دەچێتە سەری، وەك ئەو ئایەتەی کە سەبارەت بە پێشهاتی دۆستانی پێغەمبەر یوسف (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَعۡصِرُ خَمۡرًا﴾[1] واتە: یەکێك لە هاوڕێکانی یوسف گوتی: کە لە خەونمدا دیتم ترێ ئەگوشم بۆ شەراب! واتە: مەبەستی ئەو ترێیەیە، کە دواتر دەبێتە ئارەق.

٤– ئامادەکاری کە بریتییە لەوەی کە شتێك وا ناوزەد بکرێت، کە هێزو تواناو ئامادەسازی وای تیادایە کە دەتوانێت کاریگەریو شوێنەوارێکی دیاریکراو پێش بهێنێت، وەك ئەوەی کە دەڵێن: (ژەهر کوشندەیە)، واتە: هێزی کوشتنی تیادایە.

٥– (الحلول)، مەبەست ئەوەیە کە جێگاکە باس بکرێت، بەڵام خۆی لە خۆیدا مەبەست پێی حاڵی جێگاکە، واتە: خەڵکەکەی بێت، وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرموێت ﴿وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ﴾[2] واتە: پرسیار لەو گوندە بکە، کە مەبەست خەڵکی گوندەکەیە، کە ناوی جێگاکەی بردووە، بەڵام مەبەست خەڵکی ئەو جێگایەیە هەروەها وەك ڕستەی (ڕووبارەکە ڕۆدەبێت) واتە: ئاوەکەی ڕۆ دەبێت.

٦– (الجُزئيّة)، و بە پێچەوانەیشەوە، کە بریتییە لەوەی دەستەواژەی لاوەکی (جُزْئي) بەکار بهێنرێت، کەچی مەبەست پێی سەراپای کارەکە (کُلّي) بێتو،

---

[1] یوسف: (٣٦).

[2] یوسف: (٨٢).

هەروەها بە پێچەوانەیشەوە واتە: گشتگیری بۆ بەکار بهێنرێت، بەڵام مەبەست پێی (جوزئی) بوون بێت.

نموونە بۆ یەکەمیان، وەك ئایەتی ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾﴾ کۆیلەیەك ڕزگار بکەو، هەروەها فەرمایشتی پەروەردگار، سەبارەت بە کەفارەتی (ظیهار) کردن، کە دەفەرموێت: ﴿وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ باجەکەی ئازاد کردنی کۆیلەیەکە، کە مەبەست لە (رقبة) لە هەردوو ئایەتەکەدا، کابرای کۆیلەیە، بەڵام خۆی لە خۆیدا مەبەستەکە ئازادکردنی کۆیلەیە، (واتە: گەردنی کۆیلەی بۆ ئازاد کردن هێناوە، کە جوزئە، بەڵام مەبەست پێی ئازادکردنی تەواوی کۆیلەکەیە، کە "کُلّ"ـە)و، هەروەها نموونەی تر وەك ئایەتی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ﴾کە لێرەدا جوزئی هێناوە، کە دەستەکانن، بەڵام مەبەستی هەموو لاشەیەتی، واتە: بەتەواوی پێکهاتەی (ئەبو لەهەب)ـەوە، نزای تیاچوونی بۆ کراوە، واتە: لەم دوو نموونەیەدا جوزئی هێناوە، و مەبەست پێی هەموویەتی (کُلّ)ـە.

نموونە بۆ دووەمیشیان، وەك ئایەتی: ﴿يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِم﴾[1] واتە: ئەوانیش لەترسی مردنو ئەو دەنگە قورسو سەختەدا پڵو قامکیان دەئاخنن ناو گوێچکەیان، کە لێرەدا (أَصَٰبِعَهُمْ) بە مانای (أناملهم: پڵو قامكو پەنجەکانیان) هاتووە، کە بە دەستەواژەی گشتی (کُلّ) هاتووە، بەڵام مەبەستی هەندێکییەتی، واتە: (جزء) تیایدا مەبەستە.

٧- (السَبَبِيّة) وەك ئەوەی کە باسی هۆکارەکە (سبب) بکات، بەڵام مەبەستی بەدیهێنەری هۆکارەکە (مُسَبِّب) بێت، و هەروەها بە پێچەوانەیشەوە:

[1] البقرة: (١٩).

- نموونـه بـۆ یەکـەم: وەك ئـەو گوتەیەیـە کـە دەگوترێـت: (فلانەکـەس خـوێنی براکەیی خوارد)، واتە: ئەو پارەیـەی خـوارد، کـە کـابرای بکـوژ دابـووی لـە جیـاتی کوشـتنی براکـەی، چـونکە خـوێن ڕشـتن هۆکـاری دانـی بـڕە پارەیەکـە لـە جیـاتی کردەوەکەداو، دراوە بە برای کوژراو، وەك ماف.

- نموونـه بـۆ دووەم: وەك ئـەو قسـەیەی کـە پیـاو بـە ژنەکـەی خـۆیی دەڵێـت: (عیددە بژمێرە) کە مەبەستی تەڵاقدانییەتی، چونکە تەڵاقدان هۆکـارە بـۆ ژمـاردنی عیـددە، بۆیـە لێـرەدا پێکهێنـەری هۆکارەکـەی باسـکردووە، لـە جیـاتی خـودی هۆکارەکە.

ئینجـا ئـەوە بزانـە کـە ئـەو مـەجازەی کـە بـوونی پەیوەنـدی (علاقـة)کـەی، بەسـتراوەتەوە لـە لێکچوون (مشابهە)ـەوە، ئەمـە بـە خواسـتن (إستعارة) نـاوزەد دەکرێتو، ئەو مەجازەی کە پەیوەندی بـە غـەیری بابـەتی (موشابەهە: لێکچوون) هەیە، بە (مەجازی مورسەل) ناونراوە.[1]

**٣٠٥- جۆرەکانی نیشانە ((القَرینَة)):**

ئەو نیشـانەیەی کـە ڕێگـرە، لـە دەربڕینـی مانـا حەقیقییەکـەی لـەفزەکان چـەند جۆرێکە.

أ- نیشـانەی هەسـتی (قَرینَـة حِسِّـیَة)، وەك ئـەم گوتەیـە: (لـەو درەختـەم خوارد)، واتە: لەبەر هەمەکەی، چـونکە هەسـتی مـرۆڤ ڕێگـرە لـە ویسـتی خـواردنی خودی درەختەکە.

ب- نیشانەی نەریتیو ئێستایی (قَرینَة عادِیَّة، أوْ حالِیَّة)، واتە: ئەو نیشانەیەی کە بەگوێرەی نەریتو دۆخی ئێستا هاتۆتە گۆڕێ، وەك ئـەو قسـەیەی کـە پیـاو بـە

---

[1] ئەم پەڕەگرافە. پەیوەندی بەزانستی ڕەوانبێژی (البلاغة)ـەوە، هەیـەو، بـۆ زیـاتر شـارەزا بوون دەتوانن تەماشای کتێبەکانی بەلاغەبکەن.

ژنەکەیی دەڵێت: لە کاتێکدا کە ژنەکە دەیەوێت بچێتە دەرەوە لە ماڵ‌و پیاوەکە ڕێگری دەکات بۆیە پێی دەڵێت: (ئەگەر بچیتە دەرەوە تەڵاقت کەوتبێ)، کە ئەم قسەیە چوونە دەرەوەی لەو کات‌و ساتەدا لەسەر ئەژمار دەکرێت، نەوەك لە کاتی تردا.

ج- نیشانەی شەرعیی (قَرِينَة شَرْعِيَّة)، وەك بریکارگرتن لە پرۆسەی دادگادا، بۆ پرسی سکاڵاو سکاڵاکاری، کە ئەم بریکارە کارەکەی بریتییە لە وەڵامدانەوەو بەرگری کردن لە لایەنی یەکەم لەبەرامبەر بەڵگەکانی لایەنی بەرامبەردا لە بەردەم دادگاداو، کاری بریتیی نییە، لە تەشەنەپێدانی گرفت‌و کێشەو دژایەتی‌و زیادەڕەوی کردنی بەسەر نەیارەکانیدا، چونکە ئەم مانایانە لەشەرعدا قەدەغەن‌و، هەروەها لەو لەفزە گشتییانەی کە بە دەستەواژەی نێرینە هاتوون، وەك: (یا ءیها الذین آمنوا...) کە بۆ نێرینەو مێینەش بەکار دەهێنرێت، بەهۆی ئەوەوە کە زانراوە، کە لەشەرعدا ئەرك (تەکلیف)، شتێکی گشتییەو، لەسەر پیاوان‌و ژنانیشە.

## ٣٠٦- حوکمی مەجاز (ناحەقیقی):

أ- جێگیر کردنی مانای مەجازی بۆ لەفزەکەو، بەستنەوەی حوکمەکە پێیەوە، وەك ئایەتی: ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾[1] واتە: یان یەکێکتان لەسەر پێش ئاو هاتەوە، کە مەبەست لە (الغائط)، لێرەدا بێ دەست نوێژییە، (الحَدَث الأصْغَر)، و مەبەست مانا حەقیقییەکەی نییە، کە ئەو جێگا ناپەسەندەیە کە پێشاوە، و حوکمەکەیشی پێوە بەستراوە، کە تەیەمووم کردنە لەکاتی ویستنی کردنی نوێژدا، ئەگەر ئاوی دەست نەکەوێت‌و، هەروەها وەك ئەم فەرمایشتەی تری پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾[2] کە مەبەست لە دەست لێدان، لێرەدا مانا

---

[1] النساء: (٤٣)، المائدة: (٦).

[2] النساء: (٤٣).

مەجازییەکەیەتی، کە بریتییە لە سەرجێی کردن، نەوەك مانا حەقیقییەکەی، کە دەست لێدانە.

ب- ئەگەر دەکرا، بەپێی مانا حەقیقییەکەی مانای بکەین، ئەوە نابێت لابدەین بۆلای مانا مەجازییەکەی، واتە: قسەو کەلام لەسەر مانا حەقیقییەکەی خۆی مانا دەکرێت هەتا دەکراو، دەگونجا، چونکە حەقیقەت ئەسڵەو، مەجاز جێگری ئەوەو لقو چڵە(فرع)ـە، و هەرکات کە دەکرا، کار لەسەر ئەسڵ بکەین، ئەوا نابێت لابدەین بۆ جێگری ئەسڵو بۆ لقەکان، بەڵام کە پاساو هەبووو، نەمانتوانی کار بە مانا حەقیقییەکەی بکەین، ئەوا پەنا دەبەینە بەر مانا مەجازییەکەی، چونکە دواجار کارکردن بە کەلامو گوتەکان، باشترە لەوەلانانو گوێ پێنەدانیان.

بۆیە ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد، کە لەدوای خۆی هەزار دینار لە میراتەکەی بدرێت، بە کوڕەکەی (زەید)، ئەوا کار بە حەقیقەتی ئەم قسەو گوتەیە دەکەینو، ئەم وەسیەتە تەنها بۆ کوڕی ڕەچەڵەکی (زەید) جێ بەجێ دەکرێت، جا ئەگەر کوڕی پشتێنەییو ڕەچەڵەکی نەبوو، ئەوا سەرنج دەدەین، ئەگەر کوڕی کوڕی هەبوو، ئەوا بۆی ئەژمار دەکەینو، بڕی وەسیەتەکەی پێ دەدەین، چونکە (کوڕی کوڕیش) مانای مەجازی هەیە، بۆ ووشەی (کوڕ)و، لەبەر ئەوەی کە پاساومان هەبوو، نەمانتوانیوە، مانا حەقیقییەکەی بۆ دابنێین، بۆیە پەنامان بردۆتە بەر مانا مەجازییەکەیو، ئەگەر (کوڕی کوڕی) نەبوو، ئەوە ئیتر قسەکەیو وەسیەتەکەی پشت گوێ دەخەین، چونکە ناتوانین بیخەینە سەر هیچکام لەو لایەنانە، و نموونەی وەلانانو پشت گوێ خستنی قسەیەك، وەك ئەوەی کە کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات، فلانە کەس کوڕی ئەوە، لە کاتێکدا کە تەمەنی ئەو فلانەکەسە لە کابرای بانگەشەکار زیاتر بێت!!

## ٣٠٧- کۆکردنەوەی نێوان حەقیقەتو مەجاز:

ناکرێتو ناگونجێت، کە لەیەك لەفزداو لەیەك کاتدا، هەم حەقیقەتەکەی مەبەست بێتو، هەم مەجازەکەی‌و، هەردوومانا مەبەستەکەی تیادا بەرجەستە ببێت، وەك ئەوەی کە بگوترێت: (شێرەکەم مەکوژە)، کە مەبەست لە (شێر)، هەم خودی گیانەوەری شێر بێتو، هەم پیاوە ئازاکە، چونکە لە کاتی بەکار هێنانی ئەم لەفزەدا مانا حەقیقییەکەی زیاتر لە پێشترو دەستپێشخەرەو ئەگەر نیشانەیەك هاتە ئاراوە، کە بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە مانا مەجازییەکەی مەبەستە، ئەوا ئەو لەفزە لێرەدا مانا مەجازییەکەی بۆ بەکار دەهێنرێتو، مەبەستی مانا حەقیقییەکەی لێ دوور دەخرێتەوەو، هەندێکیش لە زانایان، هەردوولایەنی حەقیقی‌و مەجازییان تیادا بە دروست زانیبیوە، بەڵام ڕای یەکەم، زیاتر پێکاویەتی، بەڵێ بەکار هێنانی لەفز لە مانا مەجازییەکەیدا دروستە، ئەگەر مانا حەقیقییەکە تیایدا خۆی حەشار دابوو، و لە ژێریدا جێگای دەبوویەوە، کە ئەمە زانایان بە (عموم المجاز) سەراپاگیری مەجاز ناوزەدیان کردووە، وەك لەفزی (دایك)، کە لەسەر ئەسڵی ناوەکە ئەژمار دەکرێتو، دادەنرێت، بۆیە خودی (دایك)و (دایکی دایك)، واتە: داپیرەو بەرەو ژووریش دەگرێتەوە.

هەروەها وەك ئەوەی کە کەسێك سوێند بخوات، کە پێ نەخاتە ماڵی فڵانەکەس‌و، مەبەستی لە (پێ خستن) چوونە ماڵ بێت، چونکە ئەمە سەبەبەکەیەو، ناوی سەبەبەکەی هێناوە، بەڵام خۆی لەخۆیدا مەبەستی پێکهێنەری سەبەبەکەیەو، ئەمەیش مانایەکی مەجازی گشتگیرە، بۆ چوونە ناوماڵی ئەو کابرایە، بەپێی پێ خاوس‌و پەتی بێت، یان بە پێڵاوەوە، هەر چونیەکە، و هەر بەو گشتگیری مانا مەجازییە سوێندەکەی دەکەوێتو، بە کۆکردنەوەی نێوان حەقیقەتو مەجاز تیایدا کارەکەی ڕایی نابێت.

## – سێیەم: ((الصَریح والکِنایَة: ڕاشکاوو ناڕاستەوخۆ))[1]:

٣٠٨– (الصریح: ڕاستەوخۆ، یان ڕاشکاو): بریتییە لەو لەفزەی کە بەهۆی زۆر بەکار هێنانییەوە، مانا و مەبەستەکە تیایدا زۆر ڕوونو ئاشکرایە، ئیتر چونییەکە حەقیقی بێت، یان مەجازی.

– نموونە بۆ یەکەم: وەك ڕستەی: (أنتِ طالق)، کە ئەم لەفزە حەقیقەتێکی شەرعییە، سەبارەت بەلابردنی گرێبەستی هاوسەرێتی بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە.

– نموونە بۆ دووەم: وەك، ئایەتی (واسئل القریة)، کە ئەمە ڕاشکاوانەیە، هەر چەندە مەجازیشە، چونکە ڕاشکاوە لەوەدا کەمەبەست پێی پرسیارکردنە لەخەڵکی گوندەکەو، هەروەها وەك قسەکەر کە دەڵێت: (سوێند بە خوا لەو درەختە ناخۆم)، کە ئەمە مەجازێکی ناسراوە، بەهۆی نەبوونو نادیاریی مانا حەقیقییەکەی، چونکە هەر بە نەریت خواردنی خودی درەخت نەگونجاوە، بۆیە سوێندەکەی لەسەر مەجاز ئەژمار دەکرێت، کە بەرهەمی درەختەکەیە.

## ٣٠٩– حوکمی ((صەریح: ڕاشکاو)):

ئەوەی کە لەفزی ڕاشکاو مەبەستیەتیو داوای دەکات، بە بێ پێویستی بۆنیازو نیەت پراکتیزە دەکرێت، واتە: حوکمەکەی دەبەسترێتەوە بەخودی قسەکەوە، بەبێ وەستان لەسەر نیازی کابرای قسەکەر، واتە: چونیەکە نیازی ئەو مانایەی هەبووبێت، یان نیازی ئەو مانایەی نەبووبێت، چونکە ماناکەی ئاشکراو ڕۆشنە، و هەروەها وەك لەفزی (تەلاق) کە شەرع کردوویەتی بەئامرازی جیایی نێوان ژنو پیاوو، ئەم حوکمە تەنها بەدەر برینی لەفزەکەی، کە لەفزی (تەلاق)ـە، ئەگەر مەرجەکانی دروستی تەلاقەکە هاتبوونەدی، ئەوا لە دادگادا جێگیر دەکرێتو، دەچەسپێتو، ئەگەر کابرا بانگەشەی ئەوە بکات، کە ئەو نیازی ڕزگار بوونی لە

---

[1] المحلاوي، ل ٩٨– ١٠٠، أصول السرخسب، ب١، ل ١٨٧و دواتر.

کۆتو بەند هەبووە، لە دەربڕینی ئەو لەفزی تەڵاقەدا ئەوە بڕوای پێ ناکرێت، چونکە لەفزەکە سەبارەت بە تەڵاق زۆر ڕاشکاوانەیەو، دادوەریش کار بە ڕووە ئاشکراکە دەکات، هەروەها وەك لەفزی مامەڵەی کڕینو فرۆشتن، کە ئەگەر دەستەواژەی قبوڵ کردنی لایەنی بەرامبەری لەگەڵدا هات، ئەوە شەرع دەیکاتە هۆکار بۆ گواستنەوەی موڵکایەتییەکەی شتە فرۆشراوەکە، لە فرۆشیارەوە بۆ کڕیارو، ئەم حوکمە دەچەسپێت بەتەنها دەربڕینی دەستەواژەی دەمی کڕیارو فرۆشیار (إیجاب و قبول) شان بەشانی مەرجە پێویستییەکان بۆ دروستی مامەڵەکە، ئیتر چونیەکە دوو لایەنی کڕیارو فرۆشیار نیازو مەبەستیان هەبوو بێ لە دەربڕینی ئەو لەفزانەدا، یان نا....

**٣١٠- ((الکِنایَة: ناڕاستەوخۆ))**

لە زمانی عەرەبیدا، ئەوەیە کە قسەیەك بە جۆرێك بکەیت، کە مەبەست غەیری ئەوە بێت، کە دەری دەبڕیت.

- لە زاراوەدا ئەو لەفزەیە کە بەگوێرەی بەکار هێنانی ئەو مانایەی تیادا حەشاردراوە، کە تیایدا مەبەستو، بە هۆی نیشانەوە مانا و مەبەستەکەی دەزانرێتو ئاشکرا دەبێت ئیتر چونیەکە ئەم لەفزە حەقیقی بێت.

یاخود مەجازی (غیر متعارف) بێت[1] وەك ئەم قسەیەی پیاو بۆ ژنەکەی کە بڵێت: (حَبْلُكِ عَلی غارِبِكِ)، یاخود بڵێت: بڕۆرەوە بۆ ماڵ باوکت، یاخوت بڵێت (عیددە بژمێرە)، کە ئەم دەستەواژەگەلە بەناڕاستەوخۆیی مانای تەڵاقیان لێ دەفامرێتەوە.

---

[1] زانایانی ئوصولی فیقه، دەڵێن، کە حەقیقەتی دورخراوە (کنایة)یە، و حەقیقەتی بەکار هاتوو، (صریح)ـە، و مەجازی (متعارف)، هەر ڕاشکاوە (صریح)ـە، و مەجازی (غیر متعارف) ناڕاستەوخۆ (کنایة)یە، المحلاوي، ل ٩٩.

- حوکمی ناڕاشکاو ((کینایه)): بریتییه له ئەوەی کە داوای کردووە جێگیر نابێت، مەگەر کابرا نیازی وا بووبێت، یاخود حاڵەتی ئەو کاتەی کابرا دەلالەت لەسەر ئەو نیازە بکات، جادەچەسپێت، وەك ئەوەی پیاو بە ژنەکەی خۆی بڵێت: ((عیددە بژمێرە))و مەبەستی پێی تەڵاقدانی بێت، یاخود کاتێك کابرا ئەم قسەیە بکات، کە ژنەکەی داوای تەڵاقی لێ بکات.

هەروەها حوکمی تری (کنایة)، وەك ئەوەی کە ئەو شتانەی کەتەمومژاویو گوماناوین، بەهۆی کینایەوە ناچەسپێن، وەك سزای شەلاقدانی بوختانکار، بۆیە ئەگەر کەسێك بەکەسێکی تری گوت: (أمّا أنا فَلَسْتُ بِزانٍ)، واتە: بەڵام من داوێن پیس نیم، کە بە ناڕاشکاوانە: (کِنایَة) وای دەگەیەنێت، کە (تۆ داوێن پیسی! !)، ئەمە بەبوختان ئەژمار ناکرێتو، سزای شەلاقدانی پێ ناچەسپێت، چونکە ناڕاستەوخۆ (کنایة)یەو، هۆکاری شاراوەییو تەم و مژاوی بوون تیایدا هۆکارە بۆ لادانی سزای شەلاقدانی بوختانکار، لە سەر ئەو قسەیەی کە کردوویەتی.

## ((بەشە باسی سێیەم))

## دەلالەت کردنی لەفز، لەسەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە:

٣١١- لەفز لە ڕووی ئاستی ڕۆشنی دەلالەت کردنی لەسەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، یاخود لە ڕووی ناڕۆشنی ئەو دەلالەت کردنەوە دەبێتە دوو بەشەوە ((دەلالەتکردنی ڕۆشن)و ((دەلالەت کردنی ناڕۆشنی ئەو لەفزە لەسەر ماناکەی))و، جا باس لە هەریەکە لەم بەشانە دەکەین، هەر یەکەو بەپێی خۆیو لەوێستگەی خۆیدا.

### ((مەبەستی یەکەم))

### ((دەلالەت کردنی لەفز لەسەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە بەڕۆشنیو ئاشکرا))

### ((الواضح الدلالة))

٣١٢- ئەم پرسی (واضح الدلالة)یە، دەبێتە چوار بەشەوە،

- الظاهر : ئاشکرا.
- النص: دەق، یان تێکست.
- المفسر: ڕاڤەکراو، یان شرۆڤەکرا.
- المُحْكَم: توندوتۆڵو قایمو پتەو.

ئینجا ئەم دابەشکردنە، لەسەر بنەمای دەلالەت کردنی ئەم بەشانە دێت، لەسەر ئاستی ڕوونیو بەهێزیو بێ هێزی دەلالەت کردنی لەفزەکان لەسەر ماناکان،کە ناڕۆشنترینیان بریتییە لە، (ظاهر)و، دوای ئەم (النص)و، پاشان ڕۆشنییەکە زیاتر دەبێتو، دەدرەوشێتەوە، لە (المفسر)داو، لە (المحكم)دا، ئاستی ڕۆشنیو ئاشکراییو بەهێزییەکەی دەگاتە ترۆپك، و لەمەودوا باس لەگشت یەکێك لەمانە دەکەین.

- **یەکەم: (الظاهِر: ئاشكرا))**[1]:

((الظاهر)) لەزمانی عەرەبیدا، بەمانای (الواضح) ڕوونو ئاشكرا، هاتووەو، لە زاراوەی زانایانی زانستی ئوصولی فیقهدا، بریتییە لەو لەفزەی كە هەر لە خودی خۆیەوە مەبەستەكەی خۆیی دەرخستووەو، واتە: بەبێ هەڵوێستەكردن لەسەر هەر كاروپێو شوێنێكی دەرەكیو، خۆی لە خۆیدا ئاشكرایە، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش ئەم مانا ئاشكراو (الظاهیر)ییە ئامانجی بنەڕەتیی كەسی قسەكەر نییە، لە دەربڕینەكەیداو، لە قسەو باسەكەیدا.

نموونەی وەك ئایەتی ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ﴾[2] كە ئەم دەقە ئاشكرایە لەوەدا كە مامەڵەی حەڵاڵ كردووەو، سووخواردنی حەرام كردووە، چونكە هەر ئەم مانایە، خودی ئەو مانا ئاشكرایەیە كە لەهزری مرۆڤدا دەسپێشخەری دەكاتو، دەچەسپێت، كە ئەم مانایەش لەهەردوو ووشەی (حەڵاڵ كردن)و (حەرام كردن)ـەوە، دەركەوتووەو، پێویستی بە هیچ نیشانەیەكی دەرەكی نەبووە، بۆ بەرپاكردنی ئەم مانایە، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش، ئەم مانایە ئامانجی سەرەكی نەبووە، لە دەربڕینی دەستەواژەی ئایەتە پیرۆزەكەدا، چونكە مەبەستو ئامانجی ئەسڵی ئایەتەكە بریتییە لە سڕینەوەو لابردنو لادانی هاوشێوەیی لە نێوان (البیع: مامەڵە)و، (الربا: سووخۆری)داو، هەروەها بەرپەرچدانەوەیە بۆ ئەوانەی كە دەیانگوت: (مامەڵە وەك سوو وایە!).

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل ١٦٣– ١٦٤، فواتح الرحموت، ب٢، ل١٩، شرح المنار، ل ٣٤٩– ٣٥٠، وعبدالوهاب خلاف، ل ١٨٨– ١٨٩.

[2] البقرة: (٢٧٥).

هەروەها نموونەیەکی تر وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرمویّت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ﴾[1] واتە: گوێڕایەڵی فەرمانەکانو ڕێگری لێکردنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن، کە ئەم دەقە لە دەلالەت کردنیدا لەسەر واجب بوونی گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر جەمی ئەو شتانەیدا کە فەمانی پێ دەکاتو، هەروەها ڕێگری لێ دەکاتو، هەر ئەم مانایەش دێت بە هزری مرۆڤدا، لە کاتی تێگەیشتن لە دەرەبڕینەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە مەبەستو ئامانجی سەرەکی نییە، کە لە دوو توێی ئایەتەکەدا هەیە، چونکە ئایەتەکە لە بنەمادا بۆ دەلالەت کردن لەسەر واجبی گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە، لە پرسی دابەشکردنی دەسکەوتی شەڕدا، بەڵام دوای ئەم مانایە دەلالەت دەکات، لەسەر واجبی گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بەڕەهایی.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرمویّت: ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُواْ فَوَٰحِدَةً﴾[2] واتە: دەسا ئەو ژنانە مارەبکەن، کە پێتان دەشێن، دووان، دووان سیان، سیان، چوار ، چوار، واتە: هەر یەکێکتان دەتوانن هەتا چوار ژن مارە بکەن، بە مەرجی عەدالەتو توانایی ژیاندنیان، خۆ ئەگەر ترسان کە نەتوانن بەدادگەرانە وەکو یەك تەماشای ژنەکانتان بکەن، دەبێ تەنها ژنێك مارە بکەن.

کە ڕووی ئاشکراو (الظاهـر)ـی، ئایەتە پیرۆزەکە ئەوەیە کە مارەکردنی ئەو ژنانەی کە حەڵاڵن بە مرۆڤ دروستە، بەڵام ئەم مانایە، مەبەستی سەرەکی نییە، کە لە ناواخنی ئایەتەکەدا هەنو، بەڵکو ئامانجو مەبەستی ئەسڵی لە کرۆکی ئایەتە

---

[1] الحشر (٧).

[2] النساء (٣).

پیرۆزەکە بریتییە لە دروستی فرەژنی، تا چوار ژن، لە کاتی بێخەمی لەوەدا کە ستەمیان لێ ناکەیتو، ئەگەر نادادپەروەریت هەبوو، ئەوە بوونی تەنها ژنێك دروستە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) کە پرسیاری لێکرا، سەبارەت بە پاکی ئاوی دەریا، فەرمووی: (ئاوەکەی پاکەو، تەنانەت مردووی ناویشی، کە ماسیو نەهەنگەکانو هەندێ گیانلەبەری تریشن، خواردنیان حەلاڵە)، کە ئەم دەقە لە (الظاهر)دا، سەبارەت بە حوکمی مردووی ناودەریا گوتراوە، کە مەبەستی سەرەکی فەرموودەکە ئەمە نییە، چونکە پرسیارەکە سەبارەت بە ئاوی دەریا کرابوو، نەوەك سەبارەت بە حوکمی مردووی ناو دەریاکان.

## ٣١٤- حوکمی لەفز و دەقی ئاشکرا (الظاهر):

١- دەکرێتو، دەگونجێت، کە دەقو لەفزی (الظاهر)، بەدیوی تردا ڕاڤە بکرێتو، ئەگەری ئەم (تأويل)کردنەی هەیە، واتە: لادانی لەمانا ظاهرییەکەیو دەرخستنی مانای تر تیایدا، بۆ نموونە ئەگەر (عام: گشتی) بوو (تخصيص: تایبەت) بکرێتو، ئەگەر (مُطْلَق: ڕەها) بوو، ئەوا (مُقَيّد: کۆتو بەند) بکرێتو بەپێی مانا مەجازییەکەی ماناو ڕاڤە بکرێت نەوەك بەگوێرەی مانا حەقیقییەکەی، هەروەها جۆرەکانی تری (تأويل)کردن.

٢- واجبە کە کار بەمانا (الظاهر)ییەکەی خۆی بکرێت، ئەگەر بەڵگەیەك نەبوو، کە لەو (ظاهر)ـی، بوونە لای بدات، و مانای تری تیادا بەرجەستە بکات، لە غەیری مانا ظاهیرەکەی خۆی. چونکە لە ئەسڵدا نابێت، ئەو لەفزە لە مانا دیارو ظاهیرییەکەی خۆی لا بدرێت، مەگەر بەڵگەیەك بەرپا ببێتو، لەو مانا ئەسڵییەی لا بداتو، نموونەیش وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ کە لە ظاهیردا، مانای حەلاڵی مامەڵەی بەگشتی تیادا دەفامرێتەوە، بەڵام

مامەڵە بەئارەقەوەی تیادا تەخصیص (تایبەت) دەکرێتو، دروست نییە، کە مامەڵەی پێوە بکرێتو، هەروەها مرۆڤ هەستێ شتێ بفرۆشێت، کە لەلای خۆی نەبێت، یان بەردەست نەبێت، کە ئەمەیش هەرچەندە مامەڵەیە، بەڵام هەر نادروستەو، چەندەها جۆری مامەڵەی تر کە شەرع نەهی کردووە، لە ئەنجامدانیانو، ناچنە ژێر ڕکێفی ئەو دروستییەی کە لە مامەڵەی حەڵاڵدا بەگشتی هەیەو، لە ظاهیری ئایەتەکەوە وەرمان گرتووە.

٣- ظاهیر، لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرێت کە سڕینەوە (نسخ)ـی، بەسەردا بێت، چونکە لە دوای کۆچی دوایی ئەم ئازیزەوە(ﷺ)ئیتر نەسخو سڕینەوە نەماوەو، بەسەر چووەو، ناکرێتو نابێت.

**دووەم: ((النص: دەق))**[1]

**النص**: لەزاراوەدا، بریتییە لەو لەفزەی کە هەر بەخودی دەربڕینو لەفزەکەی خۆیو شێوازی دەستەواژەکەی دەلالەت دەکات، لەسەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، بەبێ هەڵوێستەکردن، لەسەر هەر جۆرە شتێکی دەرەکیو، هەر ئەم مانایەش ئەو مانا ئەسڵییەیە، کە مەبەستە لە دەقەکەو، لە دوو توێی دەقەکەدا هەیە[2]و، بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە بێت (نص: دەق) لە پرسی دەلالەت کردنیدا، لەسەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە، لە (الظاهر) ئاشکراترو دیارترو ڕوونترەو، هۆکاری ئەم زیاتر ڕۆشنییەی ئەوەیە کە دەستەواژەی کەلامەکە هەر بۆ گەیاندنی

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل١٦٤- ١٦٥، فواتح الرحموت، ب٢، ١٠٩ المحلاوي، ل ٨٤- ٨٥.

[2] دەستەواژەی (نص) بۆ هەمو دەقێکی قورئانی، یاخود دەقی فەرمودە بەکار دەهێنرێت، وەك دەگوترێت، دەقەکانی قورئانو سوننەت (نصوص: القران والسنة)، و بەم مانایە بێت، لەفزی (نص: دەق)، (ظاهیر)، و(نص)، و(مفسر)، و(محکم)، بە مانا زاراوەییەکانی خۆیان دەگرێتەوە.

ئەو مەبەستە ئاشكرایە هاتووە، كە دەری بڕیوە، نەك لەبەر ئەوەی كە شێوازی كەلامەكەو، دەستەواژەكەی ڕوونو ئاشكرا بێت، واتە: لەبەر ناواخنەكەی ئەم زیاتر ڕۆشنیو ئاشكراییەی دراوەتە پاڵ، ئەوەك لەبەر ڕووكە شەكەی نموونەیش وەك ئایەتی: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ﴾ كە حەلاڵی مامەڵەو حەرامی سوو خواردن دەردەخات، ئەمە (ظاهر)ـە كەیەتیو، لە جیاكردنەوەی نێوان مامەڵەو سوودا (نص: دەق)ـە، چونكە ئەم مانایە- كە جیا كردنەوەی نێوان مامەڵەو، سووخۆرییە،- زیاتر لە فام كردنی ئایەتەكەوە وەردەگیرێت، هەزری مرۆڤ دەسپێشخەری بۆ دەكات، هەر ئەم مانایەش مەبەستی ئەسڵی ناواخنی ئایەتە پیرۆزەكەیە، چونكە بۆ بەر پەرچدانەوەی ئەو بێ باوەڕانە هاتووە، كە دەیانگووت: مامەڵە وەك سوو خواردن وایە، و هیچ جیاوازیەكیان نییە.

٣١٦- حوكمی (نص: دەق):

دەق دەكرێت لادانی مانا (تأویل) وەربگرێت، بەسەریدا بهێنرێت، هەروەها دەكرێت نەسخ بووبێتەوە بەلام ئەمەیان تەنها لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)و، كاركردن پێی پێویستە ئەگەر بەڵگەیەك بەرپا نەبووبێت، لەسەر (تأویل) كردنی، واتە: لادانی ماناكەیو، ماناكردنی بەجۆرێكی تری غەیری ئەو جۆرەی كە دەقەكەی پێهاتووەو، كاریش بەپێی ئەو مانایە دەكرێت، كە (تأویل)ـەكەی، لەسەر كراوە.

٣١٧- جیاوازی نێوان (الظاهر) و((النص)):

- یەكەم: دەلالەت كردنی (النص) لەسەر ئەو مانایەی كە بۆی هاتووە، ڕوونترو ئاشكراترە، لە دەلالەت كردنی (ظاهر) لەسەر ماناكەی.

- دووەم: مانای (النص) دەقەكە، ئامانجی سەرەكییەو، بنەڕەتییە، لە دوو توێی كەلامەكەدا، بەلام مانای (ظاهر) مەبەستو ئامانجی سەرەكیو بنەڕەتی نییە بەڵكو لا بەلاییو پاشكۆیی (تَبَعي) یە.

- **سێیەم:** ئەگەری بەلارێدابردن (تأویل)کردنی مانای (النص) دوورترە، لە بوونی ئەگەری ئەو تەئویل کردنە لە (ظاهر)دا.

- **چوارەم:** لە کاتێکدا کە دژایەتیو پێچەوانە بوونەوە لە نێوان (نص)و(ظاهر)دا ڕوویدا، ئەوا (النص: دەق) پێش دەخەین. بەسەر (الظاهر) ئاشکرادا.

**٣١٨- ((التاويل))[1]:**

- **التأويل**، لەزمانی عەرەبیدا، لە (آل، يؤول) هاتووە، واتە: (رَجَعَ: گەڕایەوە)، و ئەم ئایەتە پیرۆزەیش هەر لەوەوە هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ﴾[2] واتە: ئەوانەی کە لەدڵیاندا لادانو، چەوتی هەیە، هەر چۆنێك دڵیان حەز بکات مانای ئایەتە لێکچووەکان دەکەن، و تەفسیرو لێکدانەوەی هەڵەیان بۆ هەڵدەبەستن، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، (تأويله) بەمانای (يؤول إليه)، واتە: (يرجع إليه) هاتووە، واتە: ئەو مانایەی کە ئایەتەکە بۆی دەگەڕێتەوە.

- **التأويل:** لە زاراوەی شەرعیدا، لە ڕووی تەئویل بوونەوە، بریتییە لە ماناکردنی لەفز لەسەر غیری ئەو مانایەی کە بە ظاهیریی هەیەتیو لە گەڵ بوونی ئەگەری ئەو مانا نائاشکرا (غيرەظاهيره)، لە لەفزەکەدا بەڵام تەئویلی دروست ئەوەیە کە لەفز بەپێی غەیری دەلالەت کردنە ظاهیرییەکەی خۆی مانا بکرێت، لەگەڵ بوونی ئەگەری ئەو مانا نائاشکرا (غير ظاهر)ـە، لە لەفزەکەداو، بوونی بەڵگەیەکی وا ئەم مانا کردنی لەفزە لەسەر ئەو مانا نا ظاهیرییە پاڵپشت دەکاتو بە هێزیشی دەکاتو، دانەری کتێبی (التلويح)، لە پێناسەکەیدا دەڵێت: (تأويل) بریتییە لە لادانی هەر لەفزێك لە مانا (ئاشکرا: ظاهر)ـەکەی، خۆیەوە، بۆمانایەکی

---

[1] الأمدي، ب٣، ل ٧٣، ودواتر، فواتح الرحموت، ب٢، ل ٢٢، و خلاف ل ١٩١و دواتر التلويح والتوضيح، ب١، ل ١٢٥، إرشاد الفحول، ل ١٧٧.

[2] آل عمران: (٧).

پەسەندکراو (مرجوح) کە ئەم لەفزە بە هۆی دەلالـەتکردنی بەڵگەیەکـەوە، ئەگـەری بوونی ئەو مانا پەسەند کراوەی تیادا هەیە.

گوتیشمان، کە هەریەکە لە (الظاهر)و (النص) ئەگەری تـەئویل کردنیـان هەیـەو، دواجـار لـە مانـا دیـارو ئاشـکراکەی خۆیـان، کـە لـە هـزری مرۆڤـدا چەسـپاوە وەردەگێڕدرێن بۆ مانایەکی تر، بەهۆی بوونی بەڵگەیەکی لەو جۆرەی کە خوازیـاری ئەم تەئویل کردنەیە، بەڵام کاری بنەڕەتیو پیشەیی لێرەدا ئەوەیـە کـە ئـەو لـەفزە لەمانا ظاهیرییەکەی خۆی لانەدرێتو، مانای ئەمەیش ئەوەیـە کـە لێکدانـەوەو ڕاڤـە کردنـی لەسـەر غـەیری حاڵەتـە ئاشـکراو ظـاهیرییەکـەی خـۆیو، تـەئویل کردنـی پێویستی بە بەڵگەیەکی وەرگیراو هەیەو، بۆیە بەم بۆنەیەوە، (تەئویل) دووبەشە:

- دروستی وەرگیراو (صحیح مقبول).
- خراپی ڕەتکراوە، (فاسد مرفوض).

ئینجـا تـەئویلی دروسـت ئەوەیـە کـە مەرجـەکانی دروسـتی تـەئویلی تیـادا هاتبێتەدی، کە بریتیین لە :

- یەکەم: دەبێت لەفزەکە شیاوو گونجا بێت، بۆ تەئویل کردنو، زانیشمان کـە ئەو لەفزانەی گونجاون بۆ تەئویل کردن بریتیین لە (ظاهر)و، (نـص)، بـەڵام هیچکام لە (مفسر)و، (محکم) بۆ تەئویل کردن ناگونجێن.
- دووەم: لەفزەکە ئەگەری تەئویل کردنی هەبێت، واتە: ئەگەری ئەو مانایـەی تیادابێـت کـە لەفزەکـەی بـۆ لا دەدرێـتو، تـەئویل دەکرێـت هەرچـەندە ئەگەرەکە پەسەندکردنێکی لاواز (مرجوح) بێـت، بـەڵام ئەگـەر هـەرگیز ئـەو ئەگەرەی تیادا نەبوو، ئەوە تەئویلەکە دروست نییە.
- سێیەم: دەبێـت تـەئویل کردنەکـە لەسـەر بنـەمای بەڵگـەی گونجـاوو ژیرانـە بێـت، لـە دەقـەکانی قورئـانو فـەرموودە، و قیـاسو ئیجمـاعو، یـاخود هونـەری

شـەرعدانانو میتـۆدە گشـتییەکانو، جـا ئەگـەر ئـەو تەئویلـە پشـتی بـە بەڵگـەی وەرگیراو نەبەستبوو، ئەوە خۆی لە خۆیدا تەئویلێکی وەرنەگیراوە.

- **چوارەم:** نابێت ئەو تەئویل کردنە پێچەوانەی دەقێکی ڕاشکاو بێت.

نزیکە لە تێگەیشتنی مرۆڤەوەو، کەمترین بەڵگە بەسە بۆ چەسپاندنیو، جاری وا هەیـە، کـە تەئویلەکـە، تـەئویل کردنێکـی دوورە لـە تێگەیشـتنی مرۆڤـەوەو، هـیچ بەڵگەیەك توانای پڕکردنەوەی کەلەبەری ئەو دوورییەی نییە، و بەڵکو پێویسـتی بـە بەڵگەیەکی بەهێز هەیە، کە وەك تـەئویلێکی وەرگیراوو دروست بیخاتـە بەرچـاوو، ئەگـەر وانـەبێت، بەچـاوی تـەئویلی بـەر پەرچـدراوە تەماشـا دەکرێـتو دواجـار تەئویلێکی ناسازو ڕەتکراوە دەبێت.

٣١٩- نموونـەی تـەئویلی دروسـت، وەك ئـەو تەخصـیص کردنـەی، کـە بەسـەر (عام) بـوونی، پرسـی مامەڵـەی کـڕینو فرۆشـتندا هـاتووە کەلـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا هەیە، کە دەفـەرموێت: ﴿وأحـل الله البيـع﴾کـە ئەمـە دەقێکـی عامـە، بـەڵام دەقـی سوننەت هاتووە، کە تەخصیصی کردووە، کە دەقەکانی سوننەت نەهی دەکەن، لە چەند جۆرێکی دیاریکراو لە مامەڵەکان، بۆ نموونە مامەڵە کردنی مرۆڤ بـە شـتێکەوە کە نادیار بێت، یاخود هی خۆی نەبێت، یـان لـەلای نـەبێت، واتـە: دەقـە عامەکـەی سەرەوە کە ئایەتە پیرۆزەکەیە بەم دەقانەی سوننەت تەخصیص کراوە.

هەروەها نموونەی تەئویلی دروست، وەك پرسی ئافرەتـە تەڵاقـدراوەکان، کـە لـە ئایەتی: ﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ ﴾[1] کـە ئەمـە دەقێکـی عامـەو تایبەتـە بـەژنی گواسـتراوەوە بـە بەڵگـەی ئایـەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ

---

[1] البقرة (٢٢٨).

﴿ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾[1]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتـان هێنـاوە، کـاتێ ژنـانی بڕوادارتـان مارەکردن‌ولـە دوایدا تەڵاقتان دان، پێش ئەوەی کە بچنە لایان ئەوا هیچ عیددەو ماوەیەکتان بەسەرییانەوە نییە، کە ڕێگر بێت بۆ شووکردنەوەیان، واتە: بێ عیددە بۆیان هەیە، مێرد بکەنەوە، کەواتە: (ثلاثة قروء) پاکیی بێت، یان بێ نوێژی، ئەو چاوەڕوانی کردنە بۆ ئەو ژنانەیە کە گواستراونەتەوە، نەوەك بۆ ئەوانەی کە هەر بێ گواستنەوە تەڵاق دراون، هەروەها ئەم (عام) بوونەی تەڵاقدراوانە، دیسان تایبەت کراوەتەوە بەوانەی کەسکپڕنین، چونکە عیددەی سکپڕ دانانی سکەکەیەتی، نەك سێ جار (پاکبوونەوە، یان بێ نوێژی، ((قُرْءْ)))، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[2] واتە: عیددەی ژنانی سکپڕ، دانانی سکەکەیەتی‌و، تەواو، ئیتر دەتوانێت شووبکاتەوە.

پاشان نموونەی تەئویلی دروست‌و ڕەوا وەك تەئویل کردنی لەفزی (شاة: مەڕو بزن)، لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: (وفي كل أربعين شاةً شاةٌ) کە دەکرێت (شاة: مەڕو بزنە) زەکاتەکە بەنرخ بقرسێندرێت‌و، دابنرێت‌و، کەواتە: مانای فەرمودەپیرۆزەکە بەم جۆرەی لێ دێت: ئەوەی کەواجبە، لە زەکاتدانی چل سەر مەڕ یان بزندا، بریتییە لە دانی مەڕێك یان بزنێك، یان نرخەکەی‌و، بەڵگەی ئەم تەئویل کردنەیش ئەوەیە کە مەبەست‌و ئامانج لەزەکاتدان بریتییە لە پڕکردنەوەی پێداویستی هەژاران‌و، ئەم ئامانجەیش وەك چۆن بەدانی خودی مەڕەکە بەزەکات‌و،

---

[1] الأحزاب (٤٩).

[2] الطلاق (٤).

حەواڵەکردنی بۆ هەژاران دێتەدی، هەروەها بە قرساندنی نرخەکەی‌و دابەشکردنی بەسەر هەژاران‌و خاوەن پێداویستییەکاندا هەر دێتەدی‌و چونیەکە.[1]

پاشان نموونەی تەئویلی دروست هەروەك دانان و ئەژمار کردنی کڕین‌و فرۆشتن بە خەڵات‌و دیاری‌و بە پێچەوانەیشەوە، بەهۆی بوونی بەڵگەیەکەوە کە دەلالەتی لەسەر بکات، چونکە هەردوو لەفزەکە سەبارەت بە یەکتری‌و بەگشتی هەڵگری ئەم مانایەن بۆ یەکتری.

جاری وا هەیە، کە تەئویل، تەئویلێکی دوورەو، پشتی بە بەڵگەیەکی وەرگیراو نەبەستووە، بۆیە ئەمە تەئویل کردنێکی نادروست‌و وەرنەگیراوەو، نموونەیش وەك ئەوەی کە لە فەرموودەدا هاتووە، کە (فەیرۆزی دەیلەمی)، کاتێك موسوڵمان بوو، لەو کاتەدا دوو خوشك پێکەوە ژنی بوون، جا پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: کامیانت دەوێت، لای خۆت بیهێڵەرەوەو، ئەوەی تریان واز لێ بێنەو تەڵاقی بدە، کە مانای ظاهیری ئەم فەرمودەیە کە لە هزری مرۆڤدا دەچەسپێت، ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتیدا بە فەیرۆز، کە بەدڵی خۆی‌و چۆنی دەوێت، یەکێکیان لای خۆی بهێڵێتەوەو، ئەوی تریان تەڵاق بدات، بەڵام حەنەفییەکان هاتوون، ئەم فەرمودەیەیان تەئویل کردووەو، گوتویانە، کەمانای فەرمودەکە ئەوەیە کە ژنی یەکەم لای خۆی بهێڵێتەوەو، ژنی دووەم تەڵاق بدات، ئەگەر لەیەك گرێبەستدا هەردووکیانی خستبێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، بەڵگەی ئەم تەئویل کردنەی حەنەفییەکان ئەوەیە کە قیاسی دەکەن، لەسەر موسوڵمانێك کە ئەگەر لە گرێبەستێکدا دوو خوشکی پێکەوە مارە کرد، یاخود لە دوو گرێبەستی جیاوازدا، دوو خوشکی بەیەکەوە مارەکرد، بەڵام بەڵگەیەکی لاوازەو، تەئویلەکەیان دوورە،

---

[1] شێخی ئامێدی، ئەم تەئویلەی حەنەفییەکانی، بە تەئویل دوورەکان ئەژمار کردووەو، بەوەرگیراوی دانەناوە، الآمدي، ب٣/ ل ٧٩.

چونکه پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لە فەیرۆز نەکرد، سەبارەت بە چۆنیەتی هاوسەرگیری کردنی لە گەڵیان،و، ئایا لەیەك گرێبەستدا مارەی کردوون، یان لە دوو گرێبەستی جیادا؟!و ئەگەر مەبەست لە فەرمودەکەیش ئەوە بووایەت، کە حەنەفییەکان دەیڵێن، ئەوا ئەو پرسیارەی ئاڕاستە دەکردو، یاخود هەر لە سەرەتاوە حوکمەکەی بۆ ڕوون دەکردەوە، چونکە فەیرۆز تازە هاتبوویە ناو بازنەی ئیسلامەوەو، بە ئەحکامەکانی تازە شارەزا ببوو، و لەم ڕووەوە پێویست بوو، کە ئەحکامەکانی ئیسلامی فێر بکرێتو، لەم ڕوانگەیەوە لەبەر ئەوەی کە شتی لەم بابەتەی کە باسمان کرد، لە پرسیارو پرسیارکاریو شیکردنەوەی زیادە ڕووی نەدابوو، بۆیە تەئویلەکە لاوازەو، پاش دەخرێتو دواجار وەرناگیرێتو، ڕەت دەکرێتەوە.

**سێیەم: ((المفسر: ڕوونکراوە))**[1]:

(المفسر)، لە (فَسّر) وەرگیراوە، واتە: ئاشکرا کردنو ڕوون کردنەوە، واتە: فلانە شت ئاشکرایەو، ڕوونەو، لە زاراوەدا بریتییە لەوەی کە ڕوونیو ئاشکراییەتی زیاترە، لە ڕوونیو ئاشکرایی (نص: دەق)و، هەر خۆیشی لەسەر مانای تەواوو درێژو کاملی خۆی دەلالەت دەکاتو، ئیتر هیچ بارێك بۆ تەئویل کردنی ناهێڵێتەوەو، نموونەیش وەك ئەم ئایەتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿وَقَـٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً﴾[2] کە ووشەی (مشرکین: هاوەڵ پەیدا کەرەکان) ناوێکی ئاشکراو گشتییە (ظاهرٌ وَ عام)، بەڵام ئەگەری تەخصیص کردنی هەیە، بەڵام کە لە دوایەوە ووشەی (کافة) هات، ئیتر ئەگەری تەخصیص کردنەکە

---

[1] فواتح الرحموت، ب٢ ١٩– ٢٠، المحلاوي، ل ٨٥– ٨٦، خلاف ، ل ١٩٣، أصول السرخسي، ب١، ل ١٦٥.

[2] التوبة (٣٦).

بەرز بوویەوە، و بوویە (مفسر)، و هـەروەها نموونەیـەکی تـر وەك ئایـەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ﴾[1] کـە پێشـتر کردوومانەتـە کوردیو، جا لەفزی (ثمانین)، تەئویل کردن هەڵناگرێت، چونکە ژمارەیـەکی دیـاری کراوە، نە زیادە هەڵدەگرێت، نە کەمکردن، و بۆیە بە (مفسر) ئەژمار دەکرێت.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك ئەو ئایەتەی کە عیددەی بۆ ئەو ژنانە دانەناوە کە پێش گواستنەوەیان تەڵاق دەدرێنـەوە، کـە دەفـەرموێت: ﴿فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ﴾[2] کە ووشەی (تعتدونها) ئەو ئەگەری تەئویل کردنی عیـددەی بـۆ غـەیری ئـەو کاتـە عادەتیـەی کـە ژنـی تەڵاقـدراو چـاوەڕوانی دەکـات، سـڕییەوە، و لـە دەرەنجامدا (عیددە) لێرەدا سەر بە بابەتی (مفسر)ـە.

نموونەیەکی تر وەك ئـەوەی کـە کەسـێك بەژنەکـەی خـۆی بڵێـت، (طَلِّقـي نفسـكِ واحدة: یەك تەڵاقی خۆت بدە)، کە لێرەدا ووشـەی (طلقـي)، تایبـەت (خاص)ـە، و ئەگەری تەئویل کردنی هەیە، بۆ (سێ) تەڵاق، بەڵام کە گوتی: (واحـدة: تـەنها یـەك تەڵاق)، ئیتر ئەو ئەگەری تەئویل کردنەی سڕییەوە.

هەروەها نمونەیەکی تر وەك ئەو لەفزانـەی کـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا بـە تێکڕایـی (مُجْمَل)ـی، هاتوون، و دواتر سوننەت ئەو تێکڕاییو ڕەهاییو گشتی بوونەی، درێژە پێداونو یەکلایی کردوونەتەوەو، ڕوونی کردوونەتەوەو، ئەو گشتی بـوونو تێکڕایـی بوونـەی سـڕیونەتەوەو، ئـیتر لێـرەوە بوونەتـە (مفسـر)، وەك ئـەم فەرمایشـتەی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿وأقیموا الصلاة وأتوا الزكاة﴾و، هەروەها ئایـەتی: ﴿

---

[1] النور (٤).

[2] الأحزاب (٤٩).

﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًاۚ﴾[1] كـه پێغەمبـەر (ﷺ) ماناكـانی نوێژو زەكاتدان‌و، حەج كردنـی بـە درێـژی بـاس كـردووەو، بـە گوفتاروكردارەكـانی خۆی مەبەست‌و ئامانجی ئەو پەرستشـانەی ڕوون كردۆتـەوەو، دەرخسـتووە، بۆیـە بـەم هۆیـەوە ئـەم لەفزانـە بوونەتـە (مفسـر: ڕوونكـراوەو، شـرۆڤەكراو)، جـا ڕونكردنەوەیەكی وایش كە تەئویل هەڵناگرێت.

٣٢٢- حوكمی (مُفَسَّر):

كـاركردن بـە (مُفَسَّـر)، لەسـەر هـەمان ئـەو شـێوازەی كـە درێـژەی پێـدراوەو ڕوونكراوەتەوەو بە شێوەیەكی یەكلایی (قطعي)، دەلالەتی لەسەر دەكـات، كـارێكی واجبـەو، لەسـەر دەمـی پێغەمبـەردا (ﷺ) ئەگـەری سـڕینەوە (نەسـخ) بوونـەوەی هەیە، ئەگەر لەو ئەحكامانە بوو، كە شیاوی نەسخ كردنەوەن، بەڵام لە دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) هـەموو قورئـان‌و سـوننەت سـەر بـە بابـەتی ئـەو بڕیارەكـار پێكراو (مُحْكَم)انـەن، كـە ئەگـەری نەسـخ كردنـەوەیان نییـە، چـونكە ئـیتر سـروش (وەحی) پچڕاوەو، تەنیا سورشیش دەتوانێت نەسخیان بكاتەوە.

٣٢٣- جیاوازی نێوان (تەفسیر)و (تأویل):

ئەو تەفسیرەی كە (مُفَسَّر)ـەكە، واتە: ئەو شتەی كە تەفسیرو ڕاڤەی كردووە، لە گەڵیدا تەئویل هەڵناگرێت، ئەمە هەمان ئەو تەفسیرەیە، كە لە خـودی دەسـتواژەكە دەفامرێتـەوە، وەك لـەو دەقـە قورئانیانـەدا باسـكرا، كـە ڕابـوردن‌و، وەك نمونـە هێنامانەوە، یاخود تەفسیر، لـەو ڕوونكردنـەوە تەفسـیریانەو یەكلاییانـەی كـە لـە لایەن شەرعەوە هاتووت، وەرگیراوە، هەروەك لە نموونەكانی نوێژو زەكات‌و حەجدا هێناومانن.

---

[1] آل عمران: (٩٧).

کە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) تەفسیرو ڕاڤەی کردوون‌و، بەم هۆیەوە ئیتر شیاوی تەئویل کردن نین‌و، ئەم جۆرە تەفسیرە بە پشکۆی خودی ئەو دەستەواژەیە، یاخود ئەو لەفزە ئەژمار دەکرێت‌و، بەشێکە لە دەقەکە، بەڵام (تەئویل)، بریتییە لە ڕوونکردنەوەی مەبەستی لەفزەکە، بەهۆی بەڵگەیەکی گوماناوی (ظني)یەوە، کە لەڕێی ئیجتیهادەوە، دەستخراوە، بەڵام یەکلایی (قطعي) نیەو، وەك ئەو دەقە (مُفَسَّر: ڕونکراوەیەی، کە تەفسیری) لەبارەوەکراوەو، هاتووە (قطعي)و یەکلایی نییە، واتە: لە تەفسیردا ڕوونکردنەوەی مەبەست‌و ئامانجی دەقەکە، لەلایەن خودی شەرعەوە دیاریکراوەو، دەرخراوەو، هەر بەپێی ئەم بەڵگەیەش تەئویلی موجتەهیدەکان نایەکلایی (غیر قطعي)یەو، دەکرێت، کە مەبەست لێی شتێك بێت، لە غەیری ئەو شتەی کە موجتەهیدەکان دەریان بڕیوەو، ویستویانە.

چوارەم:(المُحْکَم: توندو تۆڵ‌و قایم‌و کار پێکراو)[1]:

٣٢٧- (المُحْکَم)، لە زمانی عەرەبیدا بەمانای (المُتْقَن) وردەکاری تیادا کراوەو توندو تۆڵ دێت‌و، لە زاراوەی شەرعدا، بریتییە لەو لەفزەی کە دەلالەت کردنی لەسەر ماناکەی دەرکەوتووە، بە دەرکەوتنێکی بەهێزو، کە لەو حاڵەتە زۆر بەهێز تربێت، کە لە (مفسر)دا هەیەو، نەتەئویل هەڵدەگرێت‌و نە سڕینەوە (نەسخ).

هۆکاری تەئویل هەڵنەگرتنی ئەوەیە کە ڕوونی دەلالەت کردنەکەی گەیشتۆتە ئاستێك، هەرچی ئەگەرەکانی تەئویل کردنە لێی دووركەوتونەتەوەو، هەروەها نەسخی بەسەردا نایەت: چونکە دەلالەت لەسەر حوکمێکی ڕیشەیی‌و ئەسڵی دەکات‌و، هەر لە سروشتیدا وایە، کە جێگۆڕکێ‌و گۆڕان قەبوڵ ناکات، یاخود

---

[1] المسودة، ل ١٦١- ١٦٢، المحلاوي، ل ٨٦- ٨٧، أصول السرخسي، ب١، ل ١٦٥، خلاف، ل ١٩٥- ١٩٦.

لەوانەیە بەسروشت، ئەم حاڵەتانە وەربگرێت، بەڵام ئامرازگەلێکی پێوە لکاون، کە ئەو ئەگەرانەی نەسخ کردنەوە دەڕەوێننەوە.

نموونەی ئەو ئەحکامە ئەسڵییە بنەماییانەی کە هەر لە سروشتی خۆیاندا نەسخ وەرناگرن، وەك ئەو دەقانەی کە سەبارەت بە خوای گەورە و ڕۆژی دوایی‌و پێغەمبەران‌و حەرامی ستەمکاری‌و، پێویستی بوونی داد پەروەری‌و هتد... هاتوون.

ئینجا نموونەی ئەو ئەحکامە تایبەتانەی (جزئی) کە ئامراز گەلێکیان پێوەیە، کە دەلالەت دەکەن، لەسەر دروستی‌و بەجێیی ئەو ئەحکامە تایبەتانە وەك فەرمانیشتی پەروەردگار سەبارەت بە کەسی بوختانکار بۆ ئافرەتانی داوێن پاك، کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا﴾[1] و هەروەها وەك ئەو فەرمایشتەی تری پەروەردگار سەبارەت بە حەرامی مارەکردنی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای وەفاتکردنی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا﴾[2] واتە: بێگومان هەرگیز بۆ ئێوە ناشێ‌و نابێت، ئازارو ئەزیەتی پەیامبەری (ﷺ) خوابدەن، ئیدی بە زمان بێت یان بەکردارو، هەرگیزیش بۆتان نییە، ژنەکانی دوای خۆی بەهیچ جۆرێك مارە بکەن، چونکە وەکو دایکتانن.

هەروەها نموونەیەکی تر وەك، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: (الجهاد ماض إلى يوم القيامة) واتە: جیهاد تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامە، و ئەم جۆرە بە (مُحْكَم لعينه) ناوزەد کراوە، واتەلەبەر خودی خۆی کار پێکراوو بەهێزەو، هەر ئەم بەشەیشە، کە لێرەدا جێگای مەبەستەو، جاری وا هەیە،

---

[1] النور: (٤).

[2] الأحزاب: (٣٥).

که دەقێك بە هۆی کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)و پچڕانی وەحییەوە، دەبێتە (مُحْکَم)، کە ئەمەیان بە (مُحْکَم لغیره) ناوزەد کراوە واتە: بەهۆی شتێکی ترەوە، بووەتە (محکم)، و بەهێزیی و توندوتۆڵی، و کارپێکراویی لەو شتەوە وەرگرتووە، بەڵام ئەم جۆرە لێرەدا جێگای باسی ئێمە نییە.

٣٢٨- حوکمی (مُحْکَم):

کارکردن بەوەی کە موحکەم بە شێوەیەکی یەکلایی (قطعي) دەلالەتی لەسەر دەکات واجبە، و ئەگەری وەرگرتنی مانای تر جگە لە ماناکەی خۆیی نییەو، هەروەها تەئویل کردنو نەسخ کردنەوە هەڵناگرێت.

٣٢٩- پلەکانی (واضح الدلالة):

گوتمان کە، (واضح الدلالة)، واتە، ئەو لەفزەی کە دەلالەت کردنی لەسەر ماناکەی ڕوونە چوار جۆرە:

ظاهیر- النص- المُفَسّر- المُحْکَم، و سەرجەمیان دەلالەت کردنیان ڕوونو ئاشکرایە، لەسەر ئەو مانایەی کە دەیدەن بە دەستەوە، بەڵام لە ڕووی هێزی ئاشکرایی‌و ڕۆشنی ئەو دەلالەت کردنەیان لەسەر مانا مەبەستەکانیان جیاوازییان هەیە، بۆیە بەهێزترییان لە ڕوونی‌و ئاشکرایی دەلالەت کردندا بریتییە لە (المُحْکَم)و، پاشان (المُفَسّر)، و پلەی دوای ئەم (النص)، و ئینجا (الظاهر) دێت، و ئاستی کاریگەری ئەم جیاوازییە لە کاتی پێچەوانە بوونەوە لە نێوانیاندا دەر دەکەوێت، جا ئەگەر (ظاهر)ێك، لەگەڵ (نص) ێك دژو پێچەوانە بوونەوە، ئەوە (نص)ـە، کە پێش دەخرێت چونکە دەلالەت کردنی لە (ظاهیر)ـەکە، ڕۆشن‌و ئاشکرا ترەو ئەگەر (نص)و، (مُفَسّر) پێچەوانە بوونەوە، ئەوا (مُفَسّر) پێش دەخرێت، بەسەر (نص)داو، دواجار (مُحْکَم) پێش دەخرێت بەسەر هەموویانداو، نموونەیش لەسەر ئەمانە لە باسی (التعارض وَالترجیح)، لەبەشی سێیەمدا، دەهێنینەوە.

## (( مەبەستی دووەم ))

## باسی ئەو لەفزەی کە دەلالەت کردنی لەسەر ماناکەی ناڕۆشن و تاریکە، (( غير الواضح الدلالة )):

بریتیە لەو لەفزەی کە لە دەلالەت کردنیدا لەسەر ئەو مانایەی کە دەیدات، بە دەستەوە، شاراوەیی و گرێ کوێرەو ناڕوونی تیادایەو، لە خودی خۆیدا دەلالەت ناکات لەسەر ئەو مانایەی کە مەبەستیەتی، بەڵکو ئەم دەلالەت کردنەی لەسەر ئامرازە یاخود شتێکی دەرەکی وەستاوە، تا ببێتە هۆکار بۆ دەلالەت کردنی لەسەر ئەو مانا مەبەستەی کە هەیەتی ئینجا ئەم پرسی (غیر واضح الدلالة)یە، لە ڕووی شاراوەیی ماناو مەبەستەکەیەوە، چەند پلەیەکی هەیە:

١- باڵاترینیان بریتییە (المتشابه: لێکچوو).

٢- ئەوەیان کە ناڕۆشنی و شاراوەییەکەی لە (المتشابه) کەمترەو، پلەی لە دوای ئەوەوەیە بریتییە لە (المُجْمَل، واتە: تێکڕا، یاخود گشتی).

٣- پلەی سێیەمیان بریتییە لە (المشكل: گرفتاوی).

٤- پلەی چوارەم و کۆتاییشیان، بریتییە لە (الخَفي: شاراوەیی و نادیاری).

ئێمە لێرەدا، لەسەر هەر یەکێك لەمانە، و بە گوێرەی خۆی قسەیان لەسەر دەکەین.

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل ١٦٧، المحلاوي، ل ٨٧، ٨٨، خلاف، ١٩٨- ٢٠٠.

## یەکەم: ((الخَفي: شاراوە))[1]:

((خَفي)): بریتییە لەو لەفزەی کە دەلالەت کردنێکی ئاشکراو ڕوونی لەسەر ماناکەی خۆی هەیە، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە لە جێ بەجێ کردنی ئەو مانایەدا، بەسەر هەندێ لە تاکە پێکهێنەرەکانیدا، ناڕوونیو، شاراوەیی ڕویداوە، کە بۆ لادانی ئەم نادیاریو ناڕوونییە لەسەر ئەم بەشەی تاکە پێکهێنەرانە، پێویستمان بەسەرنج دانو تێڕامانی زیاتر هەیە، وەك لەفزی (سارق) کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا﴾ کە لێرەدا (السارق: دز) بریتییە لەو کەسەی کە سامانو مولکی خەڵکی لە جێگای تایبەتی خۆیدا خاوەنەکەی هەڵی گرتبێو پاراستبێتی، ئەم بچێت بەنهێنیو شاراوەیی بیدزێت، کە لەفزی (سارق) بە ڕووکەش و لە ظاهیردا سەر جەمی تاکە پێکهێنەرەکانی دەگرێتەوە، تەنانەت ئەو کەسانەیش کە لە کاتی بێداری خەڵکیدا، کە دەستیان فێرەو، بەهۆی بوونی پسپۆڕییان لە کارەکەدا دزی دەکەن، هەر ئەمانەیش دەگرێتەوە، کە ئەمانە بە گیرفان بڕ (طَرّار) ناوزەد کراون، هەر وەك چۆن، هەر بە گوێرەی ڕووکەش و ظاهیری، لەفزی (سارق)، ئەو کەسانەیش دیسان دەگرێتەوە، کە مردوو لە گۆڕەکانیان هەڵدەکەننەوەو، کفنەکەیان دەدزنو، بە (نَبّاش: گۆڕهەڵکەنە) ناوزەرد کراون، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لەم لەفزەدا، (گیرفان بڕ: طَرّار) تایبەت کراوە، بە پێڕی دووەمەوە، بۆیە لەفزی (سارق: دزی) سەبارەت بەو دوو پێڕ، و گروپە ناڕوونو شاراوە کردووە، چونکە جێ بەجێ کردنو پراکتیزە کردنی مانای (سارق: دز) بەسەر ئەم دوانەداو، بەهەمان لەفز جێ بەجێ ناکرێتو نابێتو نافامرێتەوەو، بۆ ئەم پرۆسەی جێ بەجێ کردنە پێویستمان بە ئامرازێکی دەرەکی هەیەو، هۆکاری نادیاریو ناڕۆشنییەکەیش ئەوەیە کە وا بەهزرو خەیاڵی مرۆڤدا دێ، کە تایبەتمەند کردنی ئەم دوو جۆرە لە دزەکان بە دوو ناوی سەر بەخۆ وای کردووە، کە ئەم دوو جۆرە دزە، سەر بەو جۆرە دزانە نەبن، کە لەفزی (سارق)

دەری بڕیونو، مانایان دەگەیەنێت، بەڵام بە تەماشاکردنو سەرنجدان دەردەکەوێت کە تایبەت کردنی گیرفان بڕ (طرار) بەم ناوەی خۆیەوە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم کەسە لە کارەکەیدا زیاتر پسپۆڕو لێزانەو چالاکەو، هێشتا کارەکەی لەپلەی دز (السارق) بالاترە، کە لە کاتی بێداری خەڵکیدا دزی دەکاتو، هەڵەکان لەخەڵکی دەقۆزێتەوە، کە بێ ئاگانو کاڵاکانیان تالان دەکات، بۆیە دزی کردنی ئەم کەسە ترسناکترەو، تاوانەکەی قێزەونترە، بۆیە لەفزی (سارق: دز) ئەمیش دەگرێتەوەو، سزای دەستبڕینی دزی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت، بەڵام لە گەڵ ئەمەیشدا (گۆڕهەڵکەنە: نباش) بۆیە ئەم ناوەی پێوە تایبەت کراوە، چونکە لە مانای (دزی)دا پلەی کەمترو نزمترە، چونکە ئەم جۆرە دزە ماڵو سامانێکی دەردخواردوو نادزێتو هەروەها لە جێگای پاراستنی خۆیدا نییە، چونکە گۆڕ بە جێگای پاراستنی شتومەك ئەژمار ناکرێتو، مردوویش دیسان بە پارێزەر حساب نییە، بۆیە لەفزی (سارق: دز) بە سەر گۆڕهەڵکەنەدا جێ بەجێ ناکرێتو، سزای دەست بڕینی بۆ نییە، بەڵکو تەنها تەمبێ دەکرێت، ئەمەیش ڕای هەندێ لە شەرعزانانی، وەك پێشەوا ئەبو حەنیفەیە، (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت).

جەماوەری زانایان دەفەموون: لەفزی (سارق)، خودی (نباش: گۆڕهەڵکەنە)یش دەگرێتەوە، چونکە تایبەتمەندیکردنی (نباش) بەم ناوەی خۆیەوە پێچەوانەی ئەوە نییە کە لەفزی (سارق)ی بەسەردا پڕاکتیزە بکرێتو، گۆڕهەڵکەنەیش هەر دزەو، بەدز دێتە ئەژمارو، ئەم جۆرە تایبەتکردنە، وەك تایبەتکردنی جۆرێکی دیاریکراو لە جۆرەکانی یەك جینس، وایە، کە تایبەت بکرێت بە یەك (ناو: إسم)ەوە، کە ئەم جۆرە دیاریکراوە، هەر بەو شێوازو شکڵەوە، لە ژێر چەتری سەراپاگیری ئەو جینسەدا بەبێ جیاوازیو پەرگیرکردن جێگای دەبێتەوەو، لێرەشدا (نباش) جۆرێکە لە جۆرەکانی جینسی (سارق: دز)و، ناوی (سارق)ی بەسەردا دەبڕدرێت،

بەڵام پرسی ئەوەی کە گۆڕ جێگای پاراستنی کاڵا نییە، ئەم ڕایە ڕەتکراوەتەوە، چونکە دەکرێت، بە نیسبەت کفنەوە جێگای پاراستن بێت و، چونکە جێگای پاراستنی هەر کاڵایەك، شوێنی تایبەت بە خۆیی هەیەو، هەروەها پاساوی ئەوەی کە کفن کاڵایەکی بێ بایەخەو، کەم نرخە، ئەمە بیانوو نییە، بۆ ئەوەی ناوی سامان و کاڵابوون و بە بەهابوونی بەسەردا لا بدرێت و، بۆیە مەرجی ئەوەی کە دەبێت سامانە دزراوەکە بە بایەخ و نرخدار بێت، لە کفنیشدا هەر دێتەدەرو، بۆیە دواجار سزای دز، بەسەر گۆڕهەڵکەنەیشدا دێتە دی و ئەمەیش هەر بەدز ئەژمار دەکرێت و، ئەمە ڕای جەماوەری زانایانەو هەر ئەم ڕایەش لە پێشترە(راجح)ـە.

هەروەها نموونەیەکی تر وەك لەفزی (قاتل: بکوژ) لەم فەرمودە پیرۆزەدا کە دەفەرموێت: (لا يرث القاتل: بکوژ میرات نابات) کە ئەمە لەفزێکی عامە، بە پێی ڕووکەش و ظاهیر سەرجەم ئەو بکوژانە دەگرێتەوە، کە بە تایبەتی کوشتنەکەیان ئەنجامداوە، لەگەڵ ئەوانەیشدا کە بە هەڵە کردوویانەو ئینجا دەلالەت کردنی لەسەر کوشتنی بەدەست ئەنقەست ئاشکراترو دیارترە، بەڵام سەبارەت بە جێ بەجێ کردنی ئەم مانایە بەسەر بکوژی هەڵەدا، جۆرێك لە شاراوەیی و نادیاری تیادایەو هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە لە ووشەی (قاتل)دا، لە دوایەوە ئاوەڵناوی (خطأ) هاتووە.

چونکە بێ بەشبوون لە میرات بردن سزایەو بە پێی داب و نەریتیش وایە، کە هەڵەو دەست ئەنقەست سزایان جیاوازەو، ئایا لەم پرسەدا، واتە بێ بەش بوونی لە میراتبردن چونیەکن؟! و ئایا مانای فەرموودەکەی بە سەردا پڕاکتیزە دەکرێت؟!! جا هەندێك لە شەرعزانان ڕایان وایە، کە لە سزاداندا یەکسانن و، لەفزی (قاتل)، بکوژی هەڵەیش دەگرێتەوە، وەك چۆن بکوژی دەست ئەنقەستیش دەگرێتەوەو، هەردووکیان پێکەوە بێ بەش دەبن، لە میرات بردن و بەڵگەی ئەم ڕایەش ئەوەیە کە

بکوژی بە هەڵەیش هەر ناوی (بکوژ)ی بەسەردا دەبڕدرێتو، چونکە ئەم کەسە، کە بەهەڵە کوشتنی ئەنجامداوە، لە(إحتیاط) کردنو خۆپارێزیدا کەمو کورتی کردووەو، بۆیە لە میرات بێ بەش دەکرێت، بەهۆی ئەو خەمساردیو کەمو کورتی کردنییەوەو، هەروەها بێ بەش کردن لە میرات سزایەکی ناتەواوو ناکامڵەو پڕاو پڕی کارەکە نییەو، هیچ ڕێگرێك لێرەدا نییە، کە لەم پرسەدا یەکسان بێت، لەگەڵ بکوژی دەست ئەنقەستداو، لە کوشتنەوەیدا لە یەکتری جودابن، و هەروەها لەبەر ئەوەی کە ئەگەر بەم سزا ناتەواوەیش سزا نەدرێتو تەمبێ نەکرێت، ئەوا کوشتن لەناو میراتبەراندا پەرەدەسێنێتو، دەڵێن بە هەڵە ئەنجامنداوە بۆیە بۆ گرتنی ئەم دەرگایەو، بۆ ڕێگری کردن لەپاساوو بیانووی تاوان کردنو پەلەکردن لەکردنی کارێك پێش هاتنی کاتەکەی، پێویستە ئەو کەسەی کارەکەی کردووە، لە میراتبردن بێ بەش بکرێت، و هەندێکی تر لە شەرعزانان ڕایان وایە: کە لەفزی (قاتل) لە فەرموودە پیرۆزەکەدا بکوژی بە هەڵە ناگرێتەوە، چونکە نیازی خراپی نەبووەو، بۆیە سزای تەواوی لەسەر جێ بەجێ ناکرێت، کە کوشتنەوەیەتی، و هەروەها سزای ناتەواو و ناکامڵیشی لەسەر جێ بەجێ ناکرێت، کە بێ بەش کردنییەتی لە میرات بردن.

و لە هەموو لەفزێکی وادا، کە دەلالەت کردنی ئاشکرایە، لە سەر ماناکەی، هەر چەندە لە پراکتیزەکردنی ئەم مانایەدا بەسەر هەندێ لە تاکە پێکهێنەرەکاندا ناڕوونی هەبێت، هەر مەسەلەکە بەم جۆرە دەبێتو، ئینجا ئەم مانایەهەرچەندە سەبارەت بە هەندێ لەماناکانی ناڕوونو نائاشکرایە، ئەمەیان لە دوای سەرنجو تێڕامان ڕوون دەبێتەوەو، حوکمەکەی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێتو، یان ئەوەیە کە هەر حوکمەکەی بەسەردا جێ بەجێ ناکرێتو، هەر بەناڕوونی دەمێنێتەوە وەك نموونەمان هێنایەوەو تێڕوانینی شەرعزانانیش لەم بوارەدا جیاوازە.

٣٣٣- حوكمى (خَفي):

پێویسته تەماشا بکەین‌و سەرەنج بدەین، لەو لەمپەڕەی کە بووەتە هۆکاری ناڕوونییەکە، لە جێ بەجێ کردنی مانای لەفزەکە، بەسەر تەواوی تاکە پێکهێنەرەکانیدا، جا ئەگەر بینرا کە لەفزەکە ئەویش هەر دەگرێتەوە، ئەو لەمپەڕەیش هەر سەر بەتاکەکانی لەفزەکەو بڕگەکانیەتی، ئەوا ئەمیش حوکمی لەفزەکە هەڵدەگرێت، هەروەك سەبارەت بە (گیرفانبڕ) گوتراو، ئەگەر بینرا کە لەفزەکە نایگرێتەوە، ئەوا حوکمی لەفزەکە هەڵناگرێت، وەك لە (گۆڕهەڵکەنە)دا بینیمان ئینجا پێویستە ئەوە بزانرێت، کە لەم پرسانەدا، شەرعزانەکان لەسەرنج‌و تێڕامانەکانیاندا جارو بار کۆکن‌و جارو باریش ڕاجیاییان هەیە.

- **دووەم: ((الـمشكل: گرفتاوی))[1]:**

(المشكل)، لەو قسەیەوە وەرگیراوە، کە دەڵێت: (أشْكَلَ عَلى كَذا)، واتە: فلانە شت لە شێوەو نموونەکانی خۆیەوە دەرهات، و لێم بوویە شتێکی نادیارو پڕ لە گرێ‌و گۆڵ.

(المشكل)، لەزاراوەی زانایانی زانستی ئوصولی فیقهدا، بریتییە لەو ناوەی کە دانراوە بۆ شتێك کە بەهۆی تێکەڵی‌و پێکەڵی ئەو شتە لەگەڵ هاو وێنەکانی خۆیدا، نادیاری‌و لێکچوون لە مەبەستەکەیدا دروست بووەو، بەجۆرێك کە مەبەستەکەی ناتوانین بزانین‌و دیاری بکەین، مەگەر بە بوونی بەڵگەیەك بەم کارە هەستین، کە ئەم ناوە لێکچووە، لەناو هاووێنەکانیدا جیا بکاتەوەو، بەدەستەواژەیەکی تر (مشكل)بریتییە لەناو بۆ (کەلام)ێك، یان لەفزێك، کە ئەگەری ئەوەی تیادا هەیە، کە چەندمانایەکی جیاوازی هەڵگرتبێت، لە کاتێکدا کە مەبەستەکەتیایدا، هەریەك

[1] أصول السرخسي، ب١، ل ١٦٨، المحلاوي، ل ٨٨- ٨٩، خلاف، ل ٢٠٠- ٢٠١، أصول الفقه، للأستاذ أبو زهرة، ل ١٢٢- ١٢٣.

مەبەستە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە گەڵ هاو وێنەکانی خۆیدا تێکەڵو پێکەڵی ڕوویداوەو لێك دەچن بەم هۆیەوە، ئەم مانایە لەلای بیسەر نادیارو ناڕوون بووەو، بۆ جیاکردنەوەی ئەم مانایە، لە لێکچووەکانی پێویسمان بە سەرنجو تێڕامان هەیە، کەواتە، هۆکاری نادیاریی لە (مشکل)دا خودی لەفزو شێواز (صیغة)کەی خۆیەتی، بۆیە ئەم بەخودی دەستەواژەو شێوەکەی خۆی دەلالەت لەسەر مەبەستەکەی ناکاتو، بەڵکو پێویستی بە نیشانەیەکی دەرەکی هەیە، تا ئەو مەبەستەی بۆ ڕوون بکاتەوەو، ئەمە بە پێچەوانەی (خفي)یەوەیە، چونکە (خفي) نادیارییەکەی بەهۆی خودی لەفزەکەوە نییەو، بەڵکو ئەم ناڕوونیو نادیارییەی خەفی بەهۆی پڕاکتیزە نەکران، و جێی بەجێ نەکرانی مانای خەفی، بەسەر هەندێ لە تاکە پێکهێنەرەکانیدا، و بە هۆی بوونی فاکتەر و هۆکاری دەرەکییەوە ڕوویدەدا، و نا ڕوون دەردەچوو، بەڵام لەم (مشکل)ـەدا، هۆکارە کە خودی خۆیەتی!

٣٣٥- نموونەی ((المشكل)):

لە نموونەکانی (مشکل) بریتییە لە (اللفظ المشترك) واتە: لەفزی هاوبەش، کە لە زماندا بۆ چەند مانایە دانراوەو، بە خودی خۆی دەلالەت ناکات لەسەر مانایەکی دیاریکراو، بەڵکو نیشانە دەرەکییەکان مەبەستەکەو، مانادیاری کراوەکە دەستنیشان دەکەنو، ڕای موجتەهیدەکان لەم بارەیەوە جیاوازەو وەك ئەو ڕاجیاییەی کە لەسەر لەفزی (قرء) هاتۆتە ئاراوە لە ئایەتی: ﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ ﴾ کە لێرەدا (قرء)، هەم بۆ (پاکیی)و هەم بۆ (بێ نوێژی) دانراوە، و نیشانەکانیشن کە مەبەستەکە لێرەدا دیاری دەکەن، و هەروەها نموونەیەکی تر، وەك ووشەی (أنى) لە ئایەتی: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ

شِئْتُمْ﴾[1] واته: ژنەکانتان لەکاتی پاکیدا جێی کشتوکاڵتانن‌و، جێگای سەوز بوونی تۆوتانن، کەوابوو لە هەر کوێوە دەتانەوێت بچنە کێڵگەکەتانەوە بەهەر کات‌و بەهەر جۆر دەتانەوێ‌و، هەر لە جێگەی سەوز کردنەوە بێ‌و پاك بێ، بچن!

کە ووشەی (أنّى) لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە بە مانای (کیف)واتە: چۆنیەتی‌و شێواز بەکار هاتووەو، هەروەك بەمانای (مِنْ أيْنَ: لە هەر کوێوە) بە کار هاتووەو، نیشانەکان‌و شێوازی دەقەکە مانای مەبەست دیاری دەکەن‌و، لێرەشدا مەبەستەکەیان دیاری کردووەو، دەقەکە دەلالەت دەکات، لەسەر گشتگیری شێوازەکان، نەك لەسەر گشتگیری جێگاکانی سێکس کردن، واتە: نیشانەکان دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن کە پیاو بە هەرجۆرێك دەتوانێت با لەگەڵ ژنی خۆیدا سێکس بکات، بەڵام سەبارەت بە چۆنیەتی سێکس کردنەکە، ئەمەیان دەبێت تەنها لە ڕێگەی کونی زاو زێوە کردەوەکە ئەنجام بدات نەوەك لە پاشەوە!

٢٣٧- حوکمی ((المشکل)):

لەم ڕوانگەیەوە، حوکمی (مشکل)، بریتییە لە گەڕان‌و لێکۆڵینەوەو سەرنجدان لە نیشانەکان، و ئەو بەڵگانەی کە دەلالەت دەکەن، لە مانا مەبەستەکەی لەفزە (موشکیلە)کە، و پاشان دەبێت کار بکەین، بەوەی کە لە دەرەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەو سەرنجدانە دەستمان کەوتووە، ئەمەیش بەوە دەبێت کە یەکەمجار تەماشا بکەین، و سەرنج بدەین لەسەر جەمی مەفهوم‌و مانای لەفزەکەو، سەرجەمیان کۆنترۆڵ بکەین‌و، ئینجا بۆ دەرهێنانی مانا مەبەستەکە، دەست بکەین، بەوردەکاری کردن‌و سەرنجدان‌و، شرۆڤەو توێژینەوەکردن!

---

[1] البقرة: (٢٢٣).

- **سێیەم: (الـمُجْمَل: تێكڕا، یاخود گشتی)[1]:**

(المُجْمَل) له زمانی عەرەبیدا، بە مانای (المُبْهَم: نادیار) هاتووەو، لـەم گوتەیـەوە وەرگیراوە كە دەڵێت : (أجْمَلَ الأمْر)، واتە: بابەتەكەی نادیارو تەمومژاوی كردو، لە زاراوەدا هەروەك پێشەوا سەرەخسی دەفەرموێت: ئەو لەفزەیـە، كـە مەبەستەكەی نازانرێـتو، فـام ناكرێـت مەگـەر بـە شـرۆڤە كردنـی ئـەو لـەفزە موجمەلـەی كـابرای قسەكەر مەبەستەكەمان بۆ دەربكەوێت، یاخود كـابرای قسـەكەر ڕوون كردنەوەیـەك بـداتو، مەبەسـتەكەی دەربخـات، كەواتـە: موجمـەل بریتییـە لـەو لـەفزەی كـە مەبەستەكەی شاراوەیەو ناڕوونەو، تەنها بەڕەەنكردنەوەی قسـەكەر دەردەكـەوێت، كـە مەبەسـتی چییە؟! چـونكە هـیچ نیشـانەیەك لـە ئـارادا نییـە، كـە ئـەو مانـا مەبەسـتەی كـابرای قسـەكەر دەربخـاتو، دەلالـەتی لێ بكـات، كەواتـە: هۆكـاری نادیاریی لە موجمەلدا لەفزییەو، دەرەكی (عارضي) نییە، واتە: لەفزی موحمـەل لـە خـودی خۆیـدا دەلالـەت لەسـەر ئـەو مانایـە ناكـات. كـە مەبەسـتیەتیو، نیشـانەی لەفزیو حاڵی لە ئارادا نین، تا مەبەستەكەی ڕوون بكەنەوە،و بەڵكو پێویستمان بـە گەڕانەوە هەیە، بۆ خودی شەرع، بۆ زانینی مەبەستی لەفزەكە.

هۆكاری ئەم موجمەل بوونو نادیارییـە، جـاری وا هەیـە، ئەوەیـە كـە لەفزەكـە، سـەر بـەجۆری ئـەو لـەفزە هاوبەشـانەی كـە نیشـانەیەكیان لـە گەڵدانییـە، تـا مانـا مەبەسـتەكانیان دیـاری بكـاتو، جـاری واهەیـە، هۆكارەكـە ئەوەیـە كـە نـامۆیی (غرابة)ی، لەفزەكە هۆكاری ناڕوونیو موجمەل بوونەكەیە، وەك لـەفزی (هَلُوع) كـە لەم ئایەتە پـیرۆزەدا دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا﴾[2] كـە هـەر بـەهۆی ئـەم نامۆییەوە ئایەتەكانی دواتر هاتوون، ڕاڤەی ئەم ووشەیە دەكـەن، كـە دەفـەرموون:

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل ١٦٨، خَلّاف، ل ٣٠٤.

[2] المعارج (١٩).

﴿إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا﴾ واته: هەر کە تووشی ناخۆشیو هەژاریو کەم دەستی بوو، ماخۆلانی پێ دەکەوێت، و کاتێکیش تووشی خێرو چاکە بوو، لە مەردووم ئەیگرێتەوەو بەشی خەڵکی لێ نادات، کەواتە: ئەمە مانای ووشەی (هلوع)ـە، کە بەمرۆڤی لەو چەشنەی چاوچنۆکو چاو برسیو بێ کەڵك دێت.

هەروەها وەك، لەفزی (القارِعَة) کە ڕاڤەکەی لە خودی هەمان ئایەتدا هاتووە: کە دەفەرموێت: ﴿ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ﴾[1] واتە: ڕاچڵەکێنەر، ڕاچڵەکێنەر چییە؟! تۆ چوزانیت داچڵەکێنەر چییە؟! ڕۆژێکە گشت مردوم وەکو پەپوولەی پرشو بڵاوی لێ دێتو، کێوەکانیش وەك خوری شیکراوەیان لێ دێتو، بەهەوادا دەڕۆن.

پاشان جاری وا هەیە، کە هۆکاری ناڕوونیو موجمەل بوونی بریتییە لە گواستنەوەی مانای لەفز، لە مانا زمانەوانییەکەیەوە بۆمانا زاراوەییەکەی، وەك لەفزی حەجو نوێژو زەکاتو بۆیە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) مانا شەرعییەکانی ئەم لەفزانەی ڕوون کردوونەتەوەو، ئەگەر ئەم ڕوونکردنەوانەی شەرع نەبوایەن ئەوا ئەو مانایەی کە شەرع مەبەستیەتی لەم لەفزانەدا دەرنەدەکەوت.

٣٣٩- حوکمی (موجمەل):

پێویستە هەڵوێستە بکرێت، لەسەر دیاری کردنی مانا مەبەستەکەو، لەسەری ڕابوەستین، و بۆیە لەم ڕوانگەیەوە کارکردن پێی دروست نییە، مەگەر ڕاڤەو ڕوونکردنەوەیەك لە شەرعەوە پەیدا ببێت، کە ئەو نادیارییە لاببات و ماناکەی

---

[1] القارعة: (١-٥).

دەربخات، جا ئەگەر ڕوونكردنەوەكەی بەرفراوان بووو، یەكلایی (قطعي) بوو، ئەوە ئەو موجمەلە دەبێتە (موفەسسەر: ڕوونكراوە)، وەك ئەو ڕوونكردنەوانەی كە لە پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەیان گرتووە سەبارەت بە زەكاتو نوێژو، هتد..و ئەگەر ڕوونكردەوەكە بەم جۆرو شێوازە نەبوو، ئەوا موجمەلە كە دەبێتە (مشكل: گرفتاوی)و پێویستیش بە تەماشاكردنو سەرنجدان هەیە، بۆ لابردنی ئەو گرفتەو زانینی مەبەستەكەی چونكە شەرع تا ڕادەیەك ئەم نادیاریی و موجمەلەی خۆی لابردووە، و پاشان دەرگای سەرنجدانو ئیجتیهادی كردۆتەوە، بۆ زانینی مانا مەبەستەكە، و نموونەیش وەك (سووخواردن) كە لە قورئانی پیرۆزدا، بە موجمەلی هاتووە، و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە فەرمودەی (شەش موڵكە سوودارەكە) ڕوونی كردۆتەوە بەڵام ئەم ڕوونكرنەوەیەش هێشتا تەواو تێرو تەسەلو فراوان نییە چونكە هەموو (سوو)ـی، بە تەواوەتی تیادا كۆنترۆڵ نەكردووە، و نەیگرتووەتە خۆ، و بۆیە ئیجتیهادكردن دروستە بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو شتانەی كە (سوو)یان، تیادا هەیە، بە قیاسكردنی لەسەر ئەوانەی كە لەفەرموودەكەدا هاتوون.

- **چوارەم: ((المتشابه: لێكچوو))[1]:**

بریتییە لەو لەفزەی كە مەبەست تیایدا شاراوەو ناڕونە،و دەستەواژەو شێوازی لەفزەكە دەلالەت ناكات لەسەر ئەو مەبەستەی كە هەیەتیو، ڕێگایشمان نییە، بۆ زانینی ئەو مەبەستە، چونكە هیچ نیشانەیەك لە ئارادا نییە، كە ئەو ناڕوونییە لا ببات، و زانینی ئەو مەبەستە تەنها تایبەتە بە خودی شەرعەوە.

ئەمە ئەو قسانەن كە زانایانی زانستی ئوصولی فیقە، سەبارەت بە پێناسەی (متشابە) دەیانكەنو، نموونەیشیان بەو پیتە پچڕ پچڕانە هێناوەتەوە، كە لە

[1] أصول السرخسي ، ب١، ل ١٦٩، أصول الفقه، للأستاذ أبو زهرة، ل ١٢٨– ١٢٩، خلاف، ل ٢٠٥.

سـەرەتای سـورەتەکاندا هـەن، وەك (حـم عسـق)، هـەر وەك ئایەتـەکانی صـیفاتی خودایشـیان هـەر کردۆتـە نمونـەی ئـەم بابەتـە وەك، ئایـەتی: ﴿الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾[1] واتە: ئەو خودا بەخشندەیە چوویە سەر عەرشی خۆی، کە مەبەست بـەم چوونو سەرکەوتنە بۆ سەر عـەرش، سـەرکەوتنێکی شـیاوی زاتـی بڵنـدی خودایـە، بەبێ هیچ شوبهاندنو قوڵکردنەوەیەك!

هـەروەها نموونەیـەکی تـر وەك ئایـەتی: ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾[2] واتـە: دەسـتی خودا، لە بان دەستیانەوەیە، بەبێ شوبهاندنی دەست بۆ پەروەردگار !

لە ڕاستیدا، ئەم بابەتی (متشابە)ـە، بەو مانایەی کە زانایانی ئوصول دەیانەوێت ئەمـە باسـی ئوصـول فیقهــ، نییـە، و بـەڵکو باسـی زانسـتی (کەلام)ـــە، و لێـرەدا ئەوەمان بەسە کە بە پەلـە بڵێین: پیتـە پچڕ پچڕەکانی سـەرەتای سـورەتەکانیو ئایەتەکانی باسی صیفاتی خـودا، سـەر بـەو باسـی موتەشـابیهە نـین، کـە زانایـانی ئوصول دەیانەوێت، چونکە پیتە پچڕ پچڕەکان بـۆ ئـەوە هـاتوون، کـە ئـەوە ڕوون بکەنەوە، کە قورئانی پـیرۆز لـەو پیتانـەو هـاو وێنـەکانیان پێکهـاتووە، و مـرۆڤیش دەستەوستانە لە ڕکەبەری کردنی، و ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە کـە لـە لای خـوداوە هـاتووەو، ئـەم بـێ منەتییـە لـە ئیعجازەکـانی قورئـانی پـیرۆزە، و ئایەتـەکانی صیفاتیش ماناکانیان ناسراوە، و بە پێی ئەو حاڵەی کـە شـیاوی خـودای گـەورەن، مانا دەکرێت، واتە: ئەم صیفاتانە بە جۆرێك دەچەسپێنرێن، بۆ خـودای مـەزن، کـە پێچەوانەی صیفاتی دروسـتکراوان بێت، وەك چۆن خودا خـۆی لـە دروسـتکراوەکانی تر ناچێت، بۆیە صیفاتەکانیشی هەر لە صیفاتی دروستکراوان ناچێتو، ئەم ئایەتـە

---

[1] طه: (٥).

[2] الفتح: (١٠).

پیرۆزەیش بەڵگەیە لەسەر ئەم قسەیەمان، کە دەفەرموێت: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾[1] واتە: خودای مەزن هاوێنەی نییەو، هەر خۆی شنەوەندەو بینەرە.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە بە پێی ئەزمونیش وا چەسپاوە، کە لەفزە لێکچووەکان لە ئایەتو فەرمودە پراکتیکییەکان (عەمەلییەکان)ـی، شەرعدا نین، چونکە ئەو دەقانەی کە سەبارەت بە حوکمەکان هاتوون، مەبەست تیایاندا کارپێکردنیانەو، جێ بەجێ کردنیانە، نەوەک تەنها بڕوا پێ بوونیان، و ئەگەر (متشابە: لێکچوو)بن، کار پێکردنیان ئەستەمەو، بۆیە بۆ ئەوە هاتوونەتە خوارەوە، تا کار بەناواخنەکانیان بکرێتو، ئەوەی داوای دەکەن، جێ بەجێ بکرێت، پێویستە کە هیچ جۆرە لێکچوونو وەك یەك بوونێك لە نێوانیاندا نەبێت.

---

[1] الشوری (١١).

## ( بەشە باسی چوارەم )

## چۆنییەتی دەلالەت کردنی لەفز لە سەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە:

## ( كيفية دلالة اللفظ، على المعنى )

٢٤١- ڕێخۆشکردن:

لە بەشە باسی سێیەمدا قسەمان لەسەر دابەشکردنەکانی لەفز کرد، سەبارەت بە ئاستی ڕۆشنیو ناڕۆشنی دەلالەت کردنی ئەو لەفزانە لەسەر ماناکانیانو، لەم بەشە باسەدا قسە لەسەر ڕێگاکانی دەلالەت کردنی لەفز دەکەین، لە سەر ئەو مانایەی کە بۆی دانراوەو، بەم پێودانگەیش بێت، لەفز دەبێتە چوار بەشەوە، کە بریتیین لە:

- عبارة النص.
- إشارة النص.
- دلالة النص.
- إقتضاء النص.

هۆکاری ئەم دابەشکردنەیش ئەوەیکە مانا، جاری وا هەیە لە ڕێگای (عبارة النص: دەستەواژەی دەقەکەوە) فام دەکرێتو جاری وا هەیە کە بەهۆی (إشارة النص: ئاماژەی دەقەکە)و، جاری واهەیە کە بەهۆی (دلالة النص: دەلالەتکردنی دەقەکە)و، جاری وا هەیە کە بەهۆی (إقتضاء النص: داواکاری دەقەکەوە) فام دەکرێتو دەزانرێتو، ئەمانە بەشەکانی دەلالەت کردنی لەفزن لەسەر ماناکەیو، جەماوەری زانایان جگە لە حەنەفییەکان، دەلالەتێکی تایبەتی تریان زیاد کردووە، کە بریتییە لە (مفهوم المخالفة: مانای پێچەوانە)، و لەمەودوا قسە لەسەر هەموو جۆرێ لە جۆرەکانی ئەم دەلالەتانە بە پێی خۆی دەکەین.

### - یەکەم: (( عبارة النص: دەستەواژەی دەق ))[1]:

٣٤٢- بریتییە لە دەلالەتکردنی لەفز لەسەر ئەو مانایەی کە زووتر لە هزری مرۆڤدا دەچەسپێت، لە کاتی بیستنی خودی ئەو شێوازو دەستەواژەیەدا کە لەفزەکە هەیەتی، ئیتر چونیەکە ئەو مانایە بە بنەڕەت (أصالة)، یان بە پاشکۆیی (تبعیة)، مەبەستو ئامانج بوو بێت، لە دوو توێی کەلامەکەدا، جا هەموو مانایەك کە لە خودی ئەو لەفزە دەفامرێتەوەو، لەفزەکەیش هەر بۆ گەیاندنی ئەو مانایە بەرپا کرابێت، چ بە ئەسڵی بێت، یان پاشکۆیی، ئەم پرۆسەیە، بە دەلالەتکردنی دەستەواژەیی (عبارة) دادەنرێتو، بەمانای حەرفی دەق ناوزەد دەکرێت، واتە: ئەو مانایەی کە لە برگەکانی کەلامو ڕستەکان وەردەگیرێت.

٣٤٣- نموونەی ئەم بابەتە وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کە لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ کە ئەم ئایەتە پیرۆزە، هەر بەدەستەواژەو عیبارەتەکەی خۆیو بەخودی لەفزەکانی خۆی دەلالەت دەکات لەسەر حەرامی کوشتنی خەڵکیو، هەروەها نموونەیەکی تر وەك ئایەتی: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ کە ئەم ئایەتە پیرۆزە، هەر بە دەستەواژەکەی خۆی دەلالەت دەکات لەسەر فەرزبوونی نوێژو زەکاتدان، لەسەر شانی مسوڵمان، و هەر ئەم مانایەش لە بنەڕەتدا (إصالة) مەبەست بووە، لە دەربڕینی ئەو ئایەتەدا.

جاری وا هەیە کە ناواخنی کەلام بۆ گەیاندنی دوو مانا یان سێ مانایە، ئیتر بە بنەڕەتی وابێت، یان بە تەبەعیەت، وەك ئایەتی: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟﴾، کە بە دەلالەتکردنی دەستەواژەکەی دوو مانای لێ دەفامرێتەوە.

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل ٢٣٦، المحلاوي، ل ١٠١.

- یەکەم: لادانی لێکچوون لە نێوان مامەڵەو سوودا، کە ئەویش مانا و مەبەستە ئەسڵییەکەیە، کە ئایەتەکەی لە پێناودا گوتراوە، تا بەرپەرچی ئەو گوتەیەی هاوەڵ پەیداکەران بداتەوە، کە دەیانگوت: (مامەڵەو سوو وەك یەکن!).

- دووەم: گەیاندنی مانای ئەوەی کە مامەڵە حەڵاڵەو سوو حەرامە، کە ئەم مانایەیشیان، مانای مەبەستە، بەڵام بە تەبەعیەت، واتە: پاشکۆی مانای یەکەمە، واتە: دوو تویّ و ناواخنی کەلامەکە لەبنەڕەتدا (إصالة) بۆ گەیاندنی ئەم مانا دووەمە نەبووە، بەڵکو ئەم مانا دووەمە لە پاشکۆی مانای یەکەمدا دەفامرێتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە دەکرێت دەق دەلالەت بکات، لەسەر لادانی لێکچوون لە نێوان ئەو دووکارەدا، بەبیّ ئەوەی کە ڕاڤەی حەڵاڵی مامەڵەو حەرامیی سووخۆری بکات، جا ئەم مانایەش کە درکێنرا، ئەمە دەلالەتی لەسەر ئەوە هەیە، کە ئەم مانایەیان مەبەست بووە، لە دەق‌و دەستەواژەی ئایەتەکەدا، و بەڵام بە شێوە و مەبەستێکی پاشکۆیی، تا بە هۆیەوە بگەین، بە مانا بنەڕەتییەکەی ئایەتە پیرۆزەکە.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك ئایەتی: ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً﴾[1] کە ئەم ئایەتە پیرۆزە هەر بەپێی دەستەواژەکەی، دەلالەت لەسەر سیّ مانا دەکات:

- یەکەم: حەڵاڵی کاری هاوسەرگیری.

- دووەم: کورتکردنەوەی ژمارەی هاوسەرەکان، لەسەر چواردانەکە، کە لایەنی ئەو پەڕی ژمارەیانە.

- سێیەم: لە کاتی ترسان لە ستەم کردن لێیان لەسەر بوونی تەنها یەك ژن کورت کراوەتەوە.

---

[1] النساء: (٣).

و ئـەم سـێ مانایـەش، لـە دەسـتەواژەو لـەفزەکانی دەقەکـەوە دەفامرێتـەوەو، سەرجەمی ماناکانیش، مانای مەبەستن، کە لە نـاواخنو دووتـوێی دەقەکـەدا هـەن، بەڵام ئەوەندە هەیە، کـە مانـای یەکـەم، مەبەسـتەکەی تەبەعییـە، لـە ئایەتەکـەدا، چونکە ئایەتەکە لە بنەڕەتدا بۆ دەلالەتکردن لەسەر دووماناکەی کۆتایی گوتراوە.

- دووەم: ((إشارة النص: ئاماژەی دەق))[1]:

٣٤٥- بریتییە لە دەلالـەت کردنـی لەفزەکـە، لەسـەر مانایـەك کـە مەبەسـت نیـە تیایدا نە بەئەسڵیو نە بە پاشکۆیی (تەبەعی)، بـەڵام هـەر پێویسـتە بـۆ فـامکردنی ئەو مانایەی کە کەلامەکەی لـە پێنـاودا دەربـڕدراوەو، بۆیـە دەق بـەخودی شـێوەو دەسـتەواژەکەی خـۆی، دەلالـەت ناکـات لەسـەر ئـەو مانایـەو، بـەڵکو بـە ڕێگـەی پابەندبوون پێیەوە (إلتزام)، ئامـاژە بـەو مانایـە دەکرێـت، واتـە: ئـەو مانایـەی کـە دەقەکە بـەهۆی دەسـتەواژەکەی خۆیـەوە دەلالـەتی لەسـەر دەکـات، پابەنـدە بـەو مانایەوە کە ئاماژەی بۆ کردووە، بۆیە دەلالـەتکردنی لەفزەکـە لەسـەر ئـەو مانایـە، لێرەدا بە ڕێگای (ئاماژە: إشارة)یە، نەوەك بە ڕێگـای (عبـارة : دەسـتەواژە)، بۆیـە جارو بار ئەم جۆرە دەلالەت کردنە، بەوە دەر بڕدراوە کـە دەلالـەت کردنـی پابەنـد بوونی لەفزە لەسەر ئەو مانایـەی کـە لـە دووتـوێی کەلامەکـەدا مەبەسـت نـەبووەو، سەرەڕای ئەمەیش شایانی باسە کە دەلالەت کردنـی ئامـاژەیی جـاری وا هەیـە، کـە شـاراوەیەو پێویسـتی بـە قووڵبوونـەوە هەیـە، لـە سـەرنجو تێڕامانـدا، هـەر وەك پێویستمان بە جەخت کردنەوە هەیە لە بوونی پابەندیو هاوئاهەنگییەکی تـەواو لـە نێوان ئەو مانایەدا، کە دەقەکە بە دەستواژەکەی خۆی دەلالـەتی لەسـەر دەکـاتو، ئەو مانایەی بە ئاماژە (إشارة) دەلالەتی لەسەر دەکاتو، هەروەها دەبێت ئـەم هـاو

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل٢٣٦- ٢٣٧، الآمدي، ب٣، ل ٩٢- ٩٣.

ئاهـەنگیو پێکـەوە پابەندبوونـەی نێوانیـان، شـیاوی جیابوونـەوە نـەبێتو، لـە پێداویستییە حەقیقییەکانی پێکەوەیی بێت، لە نێوانیاندا.

٣٤٦- نموونەی ((إشارة النص: لە دەقە شەرعییەکاندا)):

یەکـەم: ئایـەتی: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[1] کـە ئـەم ئایەتـە پیرۆزە بە دەستەواژەکەیدا دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە ئەرکی ژیانی ئـافرەتی شیردەر، لەسەر پیاوەکەیەتیو، هەروەها دەلالەت دەکات لەسەر ئـەوەی ڕەچـەڵەك (نَسَب)ـی، منداڵ سەرباوکی دەچێتەوە، نـەوەك دایکـی، چـونکە ئایەتـە پیرۆزەکـە منـداڵی داوەتــە پــاڵ بــاوکی، بــەهۆی پیتــی (لام)ــی، ئیختیصاصــەوە، کــە بــۆ تایبەتمەندی دەبێت، کە لەبڕگەیەکدا فەرمووی: (وعلى المولود له)، و هەروەها لـەم مانایـەی کۆتاییـەوە، مانـای تـریش دەفامرێتـەوە، لـەڕێی (إشارة الـنص: ئامـاژەی دەقەوە)، لەو مانایانە:

أ- باوك تەنها کەسە، کە بژێوی ژیانی منداڵەکانی لەسەر واجبە، هـەروەك چـۆن کەس هاوبەشی نییە، لە دانەپاڵی ڕەچەڵەکی منداڵەکەیـدا بـۆ لای بـاوکی، هـەروەها لە ئەرکی ژیانی ئـەو منداڵانەیشـدا هـەر هاوبەشـی نییـە، و لەسەرشـانیەتی کاریـان بەڕێوە ببات.

ب- بۆ باوك دروستە کە بەپێی پێویست لە موڵكو سامانی منداڵـەکانی داببڕێـت، چونکە منداڵ، دراوەتە پاڵ باوك بەهۆی پیتـی (لام)ـی، موڵکایەتییـەوە لەئایـەتی: (وعلى المولود له)و، خودی ئەو منداڵە لەبەر ئەوەی کە ئازادەو بەندە نییە بۆیە بـۆ موڵکایەتی ناشێت، کەواتە: مەبەست لە موڵکایەتی لێرەدا سامانەکەیەتی، کـە هـەر وەك موڵکی بابی وایە، و دروستە بۆی لە کاتی پێویستیدا، و بـەپێی پێویسـت لێـی دابـڕێت.

---

[1] البقرة: (١٣٣).

دووەم: خـــوای پـــەروەدگار دەفـــەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾[1] واتە: سەر جێیی کردنتان لەگەڵ هاوسەرەکانتان لە شەوانی ڕەمەزاندا دروستە، کە لە دەستەواژەی ئەم دەقەوە دەر دەکەوێت، کە دروستە لەگەڵ خێزانەکەتدا تێکەڵاوی بکەیتو، سەرجێیی لەگەڵ ئەنجام بدەیت تا بەشی کۆتایی شەو، لە کاتی ڕۆژووەوانیداو، لەبەر ئەوەی کە ئەم دروست بوونەو، درێژبوونەوەی کاتەکەی ئەوەدەهێنێتەدی، کە کابرای ڕۆژووەوان بۆی هەیە، بە لەشگرانی ڕۆژ بکاتەوەو، کەواتە لە حاڵی ئەم مرۆڤەدا دوو ئاوەڵناو پێکەوە کۆ دەبنەوە کە لەشگرانیو بەڕۆژوو بوونەو، کۆبوونەوەیان بەدیهێنەرو پێویستکاری ئەو حاڵەتەیە کە ئەم دوو شتە پێچەوانەی یەکتری نینو، ڕۆژوو بە لەشگرانی بەتاڵ نابێتەوە، بەپێی ڕوانگەی هۆکارەکانو، پێشینەکانی ئەم پرۆسەیەوە.

کەواتە ئایەتەکە بەدەستەواژەکەی خۆی دەلالەت دەکات لەسەر دروستی کردەوە سێکسییەکانی نێوان ژنو پیاو تا کۆتایی شەوو، بە ئامـاژەی دەق (إشارة النص) دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی کە دروستە ئەو کەسە ڕۆژووەوانە بە لەشگرانی ڕۆژ بکاتەوە، و هەر چەندە ئەم مانایەیان مەبەست نەبووە لە دەربڕینی ناواخنی ئایەتەکەدا، بەڵام سەبارەت بەو مانایەی کە دەستەواژەی ئایەتەکە دەلالەتی لێ دەکات، مانایەکی پێویست (لازم)ە، هەرچەندە مەبەستیشی نەبووە!

- سێیەم: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا﴾[2] واتە: ئەو فەیئو دەسکەوتەی کە هەیەو، دەستکەوتووە، بۆ ئەو هەژار، و دوورەوڵاتو کۆچکردووانەیە، کە لە

---

[1] البقرة: (١٨٧).

[2] الحشر: (٨).

خانووو، ساماني خۆيان دەركران لە لايەن مەككەييەكانەوە، جا ئەوانەی داوای چاكەو ڕەزامەندی لە خوا دەكەن، كە ناواخنو دووتوێی ئەم ئايەتە پيرۆزە دەلالەت لەسەر ئەوە دەكات كە كۆچەرەكان (المهاجرين) بەشێكی دەسكەوت (فيئ)يان، دەكەوێت، و بە دەلالەتی ئاماژەكردن (( الدلالة الأشارة)) ئەوە دەفامرێتەوە، كە ئەو كۆچەرييانە (خوا لێيان ڕازی بێت) موڵك و سامانەكانی خۆيان لە شاری مەككە لە دەستداوە، و لە دەستيان دەرچووە، و بۆيە ئايەتە پيرۆزەكە لەفزی (للفقراء) دركاندنی هەژاری دايە پاڵيان، و لە دەستدانی موڵكايەتی ئەوان بۆ موڵكی خۆيان مانايەكی مەبەست نييە لەم ئايەتەدا نەبە ئەسڵیو نەبە تەبەعی (پاشكۆيی)، بەلام هەر وەك پێويستی وايە بۆ ئەو لەفزی (للفقراء: هەژاران)ـەيەی، كە لە ئايەتەكەدا هاتووەو، لازمە ئەم مانايەشی تيادا وەربگرين.

- چوارەم: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[1] واتە: كە لە شتێكتان نەزانی، لە كەسانی پسپۆڕ پرسيار بكەن، كە ئەم ئايەتە پيرۆزە هەر بە دەستەواژەكەی خۆی دەلالەت دەكات لەسەر واجبی پرسيار كردن لە كەسانی پسپۆڕ، چونكە ئەمە مانای مەبەستە لەئايەتەكەدا، و شتێكی ئاساييە كە پرسيار كردن لە كەسانی زاناو پسپۆڕ پێويستكارو بەديهێنەری بوونی ئەو كەسە پسپۆڕانەيە تا پرسيار كردن لێيان كارێكی گونجاوو بەديهاتوو بێت، بەلام ئەم مانايەيان مەبەست نييە لە ئايەتەكەدا، بەڵكو تەنها بە (إشارة النص) هەستی پێ كراوەو، زانراوە.

---

[1] الأنبياء: (٧).

- پێنجەم: خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾[1] واتە:، لە کاروبارەکاندا، پرسو ڕاوێژیان لەگەڵدا بکە، کە ئەم ئایەتەیش هەر بە دەستەواژەکەی خۆی دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە ئەسڵو بناغە، لە حوکمڕانیی ئیسلامیدا بریتییە لە پرسو ڕاوێژکردن (الشوری)، و ئەم مانایەش پێویستکاری بوونی گروپێکە لە گەلی ئیسلام، کە ئەم کاری پرسو ڕاوێژەیان لەگەڵدا بکرێت، چونکە ڕاوێژکردن لە گەڵ هەموو تاکێکی گەلی ئیسلامدا کارێکی گونجاو نییەو، ئەم مانایەش لە دوو توێی ئایەتەکەدا مەبەست نییەو، بەڵکو دەلالەت کردن لەم مانایە بەڕێگای (إشارة النص: ئاماژەی دەق) زانراوەو، دۆزراوەتەوە.

- شەشەم: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾[2] واتە: ماوەی دوو گیانییو لە شیر بڕینەوەی (٣٠-سی) مانگی خایاند، واتە: بە هەمووی دوو ساڵو نیوی خەیاندو، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ﴾[3] واتە: شیر بڕینەوەیش دووساڵی خایاند، واتە: ئەگەر منداڵ پێویستی بە شیر هەبوو، تا دووساڵ ئەیدرێتیو، سوودی لێ وەردەگرێت، کە بە ڕێگای ئاماژە (إشارة) لەم دوو ئایەتە پیرۆزەوە ئەوە دەفامرێتەوە، کە لای کەمی سکپڕی شەش مانگە، کە بەسەرنجدان و تێبینی کردنی هەردوو ئایەتە پیرۆزەکە ئەم مانایە بە ڕۆشنی دەردەکەوێت.

---

[1] آل عمران: (١٥٩).

[2] الأحقاف: (١٥).

[3] لقمان: (١٤).

- حەوتەم: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أغنـوهم عـن المسـألة فـِي مثـل هـذا اليَـوم) واتـە: ئـەو هـەژارو کەمدەسـتانە لـە داواکـردنو هەژاریـەتی لـەڕۆژێکی وەك ئەمڕۆدا ڕزگار بکەنو بێ نیازیـان بکـەن، کـە بەدەسـتەواژەی دەقەکـە ئـەو حوکمـە چەسپاوە کە دانی سەر فیترە لە ڕۆژی جەژندا بە هـەژاران کـارێکی واجبـە، چـونکە ئەم فەرموودە پیرۆزە هەر لە بنەڕەتدا بۆ گەیاندنی ئەم حوکمـە گـوتراوەو هـەر لـە خودی دەستەواژەکەیشییەوە ئەم مانایـە دەردەکـەوێتو، ژمارەیـەك حـوکمیش بـە ڕێگای ئاماژە (إشارة النص) دەچەسپێت، لەوانە:

أ- ئەو خێرە تەنها لەسەر کەسانی دەوڵەمەند پێویستە، چونکە بێ نیاز کردنـی هەژاران تەنها لە توانای دەوڵەمەندانداپە.

ب- ئـەو خێـرە بەکەمدەسـتەکان دەدرێـت، نـەك بـە دەوڵەمەنـدەکان تـا ئـەو پرۆسەیەی بێ نیاز کردنە جێ بەجێ ببێت.

ج- ئەم کارە واجبە، بەهەموو جۆرە ماڵێكو سـامانێك ئـەنجام دەدرێـت، چـونکە داوای بێ نیاز کردن کراوە، لە فەرمودەکەداو، بێ نیاز کردنی هەژارانیش بە پـارەی کاشو، بەموڵکی تریش هەر ئەنجام دەدرێتو، جێ بەجێ دەکرێت.

لـەم نموونانـەی ڕابـردووەوە تێبینـی ئـەوە دەکرێـت، کـە ئـەو مانایانـەی کـە پێویستن، و لە ئاماژەی دەقەکانەوە وەردەگیرێـن، جـاری وا هەیـە کـە شـاراوەنو، بەسەرنجدانی وردو تێڕامـانی قـوڵ هەسـتیان پـێ دەکرێـتو، دەزانـرێنو، جـاری وا هەیە کە، کەسانی واهەن، هەر نایانزاننو، پـەی نابـەن پێیـانو، تـەنها شـەرعزانانی بەتواناو قاڵەوەبووو، پسپۆڕ لـە شـەرعدا دەتـوانن هەسـتیان پـێ بکـەنو بیـانزانن، سەرەڕای ئەوەی کە عەقڵی مرۆڤەکان لە فـام کردنـی ئـەم زانیارییانـەدا جیـاوازنو، هەر یەکـەیان بـەجۆرێك لـە ئامـاژەی وەرگیراو لـەم دەقانـە تـێ دەگـات، ئەمـە بـە پێچەوانەی ئەو مانایانەوەیە کە لە دەلالەت کردنـی دەسـتەواژەی دەقـەکان (عبـارة

النص) دەستمان دەکەونو هەستیان پێ دەکەین، چونکە ئەم دەستەواژانەی دەقەکان جۆرێك لە ئاشکرایيو ڕوونیان تیادایە، کە تەنانەت کەسانی غەیری شەرعزانەکانیش پەی دەبەن پێیانو دەیانزانن.

– **سێیەم: ((دلالة النص: دەلالەت کردنی دەقەکان))[1]:**

– ٣٤٨– بریتییە لە دەلالەت کردنی لەفز لەسەر ئەوەی کە ئەو حوکمەی کە لە دەقەکەدا باسکراوە، جێگیرو چەسپاوە، بۆ ئەو شتانەیش کە بێدەنگییان لەسەر کراوەو، هیچ حوکمێك سەبارەت بەوان دەرنەبڕدراوە، جا بەهۆی ئەوەوە کەباسکراوەکەو بێدەنگی لێکراوەکە هەردووکیان لەهۆکار (علة)ی، ئەو حوکمەیدا کە تەنها لە ڕووی زمانەوانییەوە دەیزانین، چوونیەکن، مەبەست لە زانینی لە ڕووی زمانەوە، ئەوەیە کە هەموو زمانزانێك پەی پێ دەبات، و پێویستی بە ئیجتیهاد کردنو تێڕامان تیایدا نابێتو، لەبەر ئەوەی کە ئەو حوکمەی کە لە دەلالەت کردنی دەقەکە وەردەگیرێت، لە مانای دەقەکەوە وەردەگیرێ، نەك لە لەفزەکەیەوە، و هەندێ لە زانایانی ئوصول ئەم جۆرەیان بە (دلالة الدلالة) ناوزەد کردووە، و هەندێکی تریش بە (فَحوى الخطاب) ناویان بردووە، چونکە ماناکەی، لە ناواخنەکەیداو، شافعییەکان، بە (مفهوم الموافقة) ناویان ناوە، چونکە ئەو شتەی کە لەفزەکە دەلالەتی لەسەر کردووە، لەو حاڵەتەیدا کە بێ دەنگی لەسەر کراوە، هاوشانە لەگەڵ دەلالەتی لەفزەکەدا لەو حاڵەتەیاندا کە حوکمی لەسەر دەربڕدراوەو، هەر بەپێی ئەم بەڵگەیەش شتە بێ دەنگی لەسەر کراوەکە (مسکوت عنه) لە حوکمدا، لەگەڵ حوکمە باسکراوەکی (مذکور عنه)دا، یەکسانن،و هەنێکی تر لە زانایان ئەم جۆرە دەلالەت کردنەیان بە (القیاس الجلي)و (دلالة الأولى) ناو

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل ٢٤١– ٢٤٣، التلويح والتوضيح، ب١، ل ١٣١، المحلاوي، ل ١٠٣، المسودة، ٣٤٦، والآمدي، ب ٣، ل٩٧– ٩٥.

بردووە، چونکە ئەو شتەی بێدەنگیی لەسەر کراوە، سەبارەت بە حوکمەکە لە پێشترە لەوەیان کە حوکمەکەی دەربڕدراوە، چونکە هۆکارەکە (عیللەتەکە) لە (مسکوت عنە: بێدەنگی لێکراو)دا، بە هێزترە، لە بوونی لە (منطوق بە: دەربڕدراوەکەدا)!.

جا ئەگەر دەقەکە بەدەستەواژەکەی خۆی دەلالەتی کرد، لەسەر حوکمێك لە پێشهاتێکی دیاریکراوداو، دواتر پێشهاتێکی ترمان بینی کە لەگەڵ پێشهاتی یەکەمداو لە عیللەتەکەدا وەك یەك بوون، یاخود ئەم تەنانەت عیللەتەکەی تیادا بەهێزتر بوو، کە ئەم یەکسانیو لێکچوونەیش یاخود لە پێشتر بوونەیش تەنها بەزانینی زمانو کەمترین سەرنجدانو، بەبێ ئیجتیهاد کردنو تێڕامان پەی پێ دەبرێت، چونکە لە هزری مرۆڤدا بەو شێوازە جێگای خۆی دەکاتەوەو، خۆی دەچەسپێنێت، کە ئەو دەقە، لەدوو پێشهاتدا پراکتیزە دەکرێتو، ئەو حوکمەی کە بەدەق هاتووە، لەسەر دەربڕدراوەکەیان (منطوق)، دیسان لەسەر (مسکوت عنە: بێدەنگیی لێکراوە)کەیش، جێ بەجێ دەکرێت، چونکە وەك یەکن.

٣٤٩- نموونەی (دلالة الأشارة) لە دەقە شەرعییەکاندا:

- یەکەم: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾[1] کە ئەم دەقە هەر بەدەتەواژەکەی خۆی دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە حەرامە منداڵ بەرامبەر بە باوكو دایکی ئەو ووشە ئازاراوییانەی ئاخو ئۆف بەکار بهێنێت، چونکەئازاری دڵی دایكو باوکی تیادایە، جا هەر لە دەقەکەوە ئەوەیش لە هزرو بیری مرۆڤدا دەچەسپێت، کە لێدانو قسە پێوتنیشیان هەر حەرامە، چونکە لەم دووکارەیشدا هەر ئازاری تیادایەو تەنانەت ئازاری لە ئاخو ئۆفەکەیش زیاترە، و کەواتە، لێدانو جنێو پێدانیان زیاتر حەرامە لە ئاخو ئۆف کردن بەرامبەریانو کەواتە، حوکمە

---

[1] الأسراء: (٢٣).

بێدەنگی لێکراوەکە (مسکوت عنە)، حوکمەکەی لە پێشترەو زیاتر حەرامە، کە جنێوپێدانەکەیە لە حوکمە باسکراوەکە (منطوق عنە)، کە ئاخ و ئۆف کردنەکەیەو، ئەم مانایەش ڕوونە و پێویستی بە ئیجتیهادکردن و سەرنجدان نییە !

– دووەم: خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾[1] ئەم ئایەتـە پـیرۆزە هـەر بەدەستەواژەیەکەی خۆیدا مانـای ئـەوە دەدات بـە دەسـتەوە کـە خـواردنی مـاڵی هەتیو، بـە ڕێگـەی سـتەم و سـتەمکاری کـارێکی حەرامـەو، لـە ڕێ دەلالـەت کردنـی دەقەکەیەوە (دلالة النص) لەوە تێ دەگەین، کە سـوتاندنی سـامانیان و یـاخود لـە ناوبردنی، و خراپ کردنی، بـە هـەر جـۆرێ لـە جۆرەکـانی خـراپ کـردن بێـت، هـەر کارێکی حەرامە، چونکە ئەم کردەوە گەلە لەگەڵ خواردنی ماڵەکەیاندا بەستەمکاری یەکسانن و چونیەکن، چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر دەستدرێژی کردنی تیادایە، بۆسەر سامانی هەتیو، کە بێگومان هەتیو کەم توانا و دەستەوستانە لـە پارێزگـاری کردن و خۆپاراستن لەو دەستدرێژییانەو، کەواتە: دەقەکـە هـەر بـە دەسـتەواژەکەی خۆی خواردنی سامانی هـەتیوانی بـە سـتەم حـەرامکرد، و هـەروەها سـوتاندن و لـە ناوبردنیش بە ڕێگەی دەلالەت کردنی دەستەواژەکان ( دلالـة عبـارة) حـەرام کـردو، ئـەو شـتەی کـە لـەم پرسـەدا بێـدەنگی لێ کـراوەو (مسـکوت عنە)یـە یەکسـانە بـە درکێندراوەکە (منطوق بە) لە عیللەتی حوکمەکەدا.

– سـێیەم: خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ﴾ کـە بەڕێگـەی دەلالـەت کردنـی دەسـتەواژەکان ( دلالـة عبـارة) لـەوەی ئایەتەکە تێدەگەین کە عیددە بەسـەر بـردن لەسـەر ئـافرەتی تەڵاقـدراو واجبـە، تـا

---

[1] النساء: (١٠).

دڵنیابین لەوەی کە سکپڕنییەو، ئەم عیللەتەیش ئاسانەو، هەر کەسێ زمان بزانێت لێی تێدەگاتو هەروەها ئەم عیللەتە بۆ ئافرەتێکیش دەبێت، کە پرۆسەی هاوسەرایەتییەکەی بەهۆی یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی هاوسەرایەتی، وەك (هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام) هەڵوەشاوەتەوەو، بۆیە بەڕێگەی ( دلالة النص) ئەمیش هەر عیددەی لەسەرە، و عیللەتیش لێرەدا، لە بێدەنگیی لەسەر کراوە کە (مسکوت عنە) یەکسانە بە عیللەتەکە لە درکێندراوەکە (منطوق بە)دا.

لێرەوە ڕوون دەبێتەوە کە جیاوازی نێوان (دلالة النص)و (قیاس) ئەوەیە کە یەکسانی هەیە، لە نێوان مەفهومە وەك یەکە کانیاندا، واتە: (مسکوت عنە)و (منطوق بە) لە عیللەتدا تەنها بە تێگەیشتن لە زمانەکە و بەبێ ئیجتیهاد کردنو، تەئویل کردن دەزانرێتو دەفامرێتەوە، بەڵام یەکسانی نێوان (قیاسکار)و (قیاس لەسەر کراو) لە عیللەتەکەدا بەتەنها زانینی زمان پەی نابرێت پێیانو، پێویستیان بە سەرنج لێدانو، تێڕامانو ئیجتیهاد تیادا کرد هەیە.

- **چوارەم: ( إقتضاء النص: داواکاری دەق )[1]:**

(إقتضاء) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (الطلب: داواکردن) هاتووەو، لە زاراوەدا هەروەك پێشەوا سەرەخسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: بریتییە لەو زیادەیەی کە لە حوکمە دەق لەسەر هاتووەکەدا هەیە، کە پێشخستنی ئەو زیادەیە مەرجێکی پێویستە، بۆ ئەوەی کە دەقەکە سوود بەخش بێت، یاخود بەر پاکەری حوکمەکەی بێتو ، بەبێ ئەم زیادەیە خستنەکاری دەقەکە ڕووناداتو، بە دەستەواژەیەکی تر مەبەست لە دەلالەت کردنی (إقتضاء النص) بریتییە لە دەلالەتکردنی لەفز لەسەر شتێکی قسە لەسەرنەکراو (مسکوت عنە)، کە ڕاستی

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل٢٤٨، الآمدي، ب٣، ل ٩١ المحلاوي ل ١٠٥.

کەلامەکە و دروستیو پایەداری ئەو کەلامو قسەیە لەسەر ئەو زیادە شارەوەیە (موقەددەر)ـە، وەستاوە، کە لە ڕستەکەدا هەیە، و تەقدیر کراوە.

٣٥١- نموونە:

- یەکەم: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمۡ أُمَّهَٰتُكُمۡ.....﴾ کە تەقدیری مانای ئەو دەقە، واتە: ئەو زیادەیەی کە تیایدا شاراوەتەوە، بریتییە لەمەی کە حەرامە لەسەر موسوڵمان مارەکردنی دایکیو کچەکانیو..... هتد ئەنجام بدات، کە ئەم مانایە لەفزەکە دەلالەتی لەسەر کردووە، بە ڕێگەی (إقتضاء)، چونکە حەرامکردنەکە لەسەر خودی کەسەکان نییەو، بەڵکو حەرامکردنەکە لەسەر ئەو کردەوەیەیە کە پەیوەستە پێیانەوە، کە مارەکردنیانە!

- دووەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ﴾ واتە: خواردنی گۆشتی بەرازو سوود وەرگرتن لێی کارێکی یاساغو حەرامە، کە ئەم مانایەش بە دەلالەتکردنی لەفزەکەو لە ڕووی (إقتضاء)ەوە، زانراوە، چونکە هەروەك گوتمان حەرامکردنەکە پەیوەست نییە، بەخودی شتەکەوەو،بەڵکو حەرامکردنەکە پەیوەستە بە کردەوەی کابرای موکەللەفەوە، بۆیە لەسەر جەمی دەقەکاندا ئەم زیادەیە بە گوێرەی ئەوەی کە بۆی دەگونجێت، بۆی دادەنرێت.

- سێیەم: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّـهَ رفـع عَـنْ أُمَّتِـي الْخَطَـأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ)، کە ئەم دەقە لەڕووکەشدا دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە ئەو کردەوەیەی بەهۆی هەڵەکردن یان لە بیرچوونەوە یان زۆرلێکردنەوە ڕوویدات، حوکمی لەسەر لادراوەو، یاخود دەلالەتی لەسەر ئەوە هەیە، کە هەڵەکردنو لەبیرچوونەوەو زۆرلێکردن لە ناو ئەم ئیسلامەدا ڕوونادات و

نییە! بەڵام لە ڕاستیدا هیچکام لەم دوو مانایە دروست نین چونکە شتێك کە ڕوویدا، ئیتر لادانی مەحاڵە، هەروەها ئەم حاڵەتانە لەناو ئەم گەلەدا هەن‌و، نکۆڵییان لێ ناکرێت، بۆیە دروستی ئەم کەلامە لەسەر ووشەیەکی شاراوە بنیات نراوە کە هەر خودی دەقەکە دواکاری ووشەیەکی لەو جۆرەیە، کە بریتییە لە ووشەی (حکم)و، یاخود ووشەی (إثم)و، کەواتە مانای فەرموودە پیرۆزەکە بەم جۆرەی لێ دێت، لەسەر گەلەکەم حوکمی ئەم جۆرە شتانەی کە بەهۆی ئەم سێ حاڵەتەوە لەدەستیان دەردەچێت، لەسەریان لابراوەو، لێرەدا ووشەی (إثم:تاوان) بێدەنگیی لێکراوەو، جاری وا هەیە، کە دروستی کەلامەکە لەسەر تەقدیر کردن‌و شاردنەوەی ووشەیەکی لەو جۆرە وەستاوە، و ئەو مانا شاراوەیەیش لە ڕێگەی (إقتضاء)ـەوە، دەزانرێت‌و، هەر ئەم زیادە مانایەش بە بەشێك لە دەرهاویشتە مانابییەکانی فەرموودەکە دێتە ئەژمار.

– چوارەم: کاتێك کە مرۆڤێك بە کەسێکی تر کە مەڕێکی هەیە دەڵێت: بیکە بەخێرو دابەشی بکە، بەسەر هەژاراندا، بە (دەدینار) موڵکی منە، کە ئەم قسەیە لە ڕووی (إقتضاء)ـەوە، دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە مەڕەکە لە خاوەنەکەی دەکڕێت، بە (دە دینار)، چونکە خاوەن مەڕەکە بریکاری ئەو نییە، لەکردنی بەخێردا بەسەر هەژاراندا، مەگەر دوای ئەوەی کە کابرای فەرمان کار بیکڕێت، و ببێتە موڵکی، ئینجا پرۆسەکە جێ بەجێ دەکرێت‌و، لێرەدا کڕینەکە بە دەلالەتی (إقتضاء النص) چەسپاوە.

٢٥٢– پوختە باسی ئەم دەلالەت کردنانە:

پوختەی ئەوەی گوتمان سەبارەت بە (دلالة عبارة)، و (دلالة الأشارة)، و (دلالة النص)، و (إقتضاء النص)، ئەوەیە کە دەلالەتکردنی دەستەواژە ( دلالة عبارة)

بریتییه له دەلالەتكردنی دەق، به دەستەواژەو لەفزەكانییەوە لەسەر حوكمێك، لە گەڵ ئەوەیشدا كە ناواخنو دوو تـوێی كەلامەكەیش، هەر ئەم حوكمەی تیادا دەفامرێتەوەو ئاماژەی تیادا هەیە، لەسەر ئەوەی كە دەری بڕیوەو، بەم حوكمە دەگوترێت، كە به (عبارة النص) جێگیر بووەو، پاشان (دلالـة إشـارة) بریتییە، لە دەلالەتكردنی دەقەكە، به دەستەواژە، و لەفزە كانییەوە لەسەر حوكمەكە بە بێ ئەوەی كە ناواخنو دووتوێی كەلامەكە، بۆ ڕوونكردنەوەو دەرخستنی ئەم هاتبێتو، لێرەدا به حوكمەكە دەگوترێت، كە به (إشارة النص: ئاماژەی دەق) جێگیر بووەو، چەسپاوە.

پاشان (دلالة النص)، بریتییە لە دەلالـەت كردنـی دەقەكە لەسەر حوكمەكەی بەڵام به شێواز (صیغة)و لەفزەكانی دەقەكە نا.... بەڵكو بە ناواخنو ڕوحەكەیو، ئەوەی لێی دەفامرێتەوەو، لێرەدا به حوكمەكەی دەگوترێت كە به (دلالـة الـنص) جێگیر بووە.

(دلالة الأقتضاء)، بریتییه له دەلالەتكردنی دەق، بەڵام به شێوە (صیغة)و لەفزو ماناكەی نا.... بەڵكو به زیادەیەكی وا كە كەلامەكە دەیخوازێت، و لە ڕستەكەدا شاراوەتەوەو تەقدیرییە كە ئەم مانا زیادەیەش دروستیو ڕاستیو پایەداری كەلامەكە خواستویەتیو پێویستی پێی هەیە.

جا لە پوختە باسی ئەو دەلالەتانەیدا، كە تێپەڕین، بۆمان دەردەكەوێت كە هەر مانایەك لەدەق دەفامرێتەوە، بەهەر ڕێگایەك بێت، لە ڕێگاكانی ئەم دەلالەت كردنانە، ئەمە به بەشێك لەو مانایە هەژمار دەكرێت، كە دەقەكە هەیەتی، و بۆیشی جێگیر دەكرێتو، دەقەكە بەڵگەیەو پاڵپشتە بۆی، و بۆیە ئەم چواردەلالەتانە بە دەربڕدراوی دەقەكە (منطوق النص) دێنە ئەژمارو، هاوشانو بەرابەرن، لەگەڵ

(دلالة المفهوم)، واته: (مَفهوُم الـمُخالَفَة)، ماناى پێچەوانەى کەلامەکە کە لە برگەى دواتردا، قسە لەسەر ئەم (مَفهوُم الـمُخالَفَة)يە، دەکەين.

- **پێنجەم ((مَفهوُم الـمُخالَفَة: ماناى پێچەوانە))[1]:**

٣٥٣- گوتمان کە دەلالەت کردنى لەفز لەسەر هاوشانىو يەکسانى حوکمى برِيارە بێدەنگەکان (المسکوت عنە)و، برِيارە دەربرِاوەکان (المنطوق عنە)ى، ناو دەقەکان، ئەم پرِۆسەيە بەشێکە لە دەلالەتى لەفزىو، بە (دلالة النص): ياخود (مَفهوُم الموافقة) ناوزەد دەکرێت.

بەلاّم سەبارەت بە دەلالەتکردنى لەفزەکە لەسەر چەسپاندنى حوکمێکى پێچەوانەى دەربرِدراوەکە (منطوق)، بۆ بێدەنگيى لێکراوەکە (مسکوت عنە) واتە: (مسکوت عنە : بێدەنگيى لێکراوەکە)، پێچەوانەى دەربرِدراوەکە (منطوق عنە) بێت، لە حوکمدا، ئەمەيە کە بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) ماناى پێچەوانە ناوزەد کراوەو، حوکمى يەکەم بە (منطوق النص) ناوزەد کراوەو، ئەو حوکمە دووەمينەى کە چەسپاوە بۆ (بێدەنگى لێکراوەکە: مسکوت عنە) بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) ياخود (دليل الخطاب) ناوزەد کراوە، و زاناى مەزن (الآمدي) قسەيەکى هاوواتاى ئەمە دەکاتو، دەفەرموێت: سەبارەت بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة)، بريتييە لەوەى کە ئەو شتەى حوکمەکە لە (بێدەنگى لێکراوەکە: مسکوت عنە)دا، دەلالەتى لێدەکات، پێچەوانە بێت لە گەلّ ئەوەيدا، کە حوکمەکە لە (منطوق: درکێندراوە) کەدا، دەلالەتى لىّ دەکاتو، هەروەها بە ( دليل الخطاب)يش، ناوزەد کراوە، و بۆيە بە ( دليل الخطاب) ناوبراوە، چونکە (خطاب: گوتەى ئاراستە کراو) دەلالەتى لەسەر دەکات!

---

[1] الامدي، ب٣، ل ٩٩و دواتر، المحلاوي، ل ١٠٨و دواتر، المسودة، ل ٣٥٧و دواتر أصول السرخسي، ب١، ل ٢٥٥و دواتر، الأحکام، أبن حزم، ب٧، ل ٧٨و دواتر، إرشاد الفحول، ل ى١٠٩، ودواتر، الشيخ خلاف، ل١٨٠و دواتر.

٣٥٤- جۆرەکانی (مَفهوُم المُخالَفَة):

ئەم (مَفهوُم المُخالَفَة)ـەیە، لەلای ئەو گروپانەی زانایان، کەکاری پێ دەکەن، چەند جۆرێکە، کە گرنکترینیانو بەناو بانگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:

- یەکەم: (مَفهوُم الصّفة):

بریتییە لە دەلالەت کردنی لەفزێك، کە ئاوەڵناو (وصف)ێکی، وای پێوە بەسترابێت، کە لە کاتی نەمانی ئەو وەصفو خەسڵەتەدا ببێتە هۆکاری پێچەوانە بوونەوەی حوکمەکەیو، مەبەستیش لە (وەصف) لێرەدا، هەر کۆتو بەندێکە بەڕەهایی کە پێوەی بێت، جگە لە (الشرط)و (الغایة)و، (العدد)و، هەروەها مەبەستیش لە (وەصف) لێرەدا، ئەو وەصفەیە، کە لە (نعت) فراوانترە، و هەر چونیەکیشە کە ئەو نەعتە نەعتەکەی زانستی نەحو بێت، وەك: (في الغنم السائمة زکاة)، لەو مەڕو بزنانەیدا کە خۆیانو بێ چاودێری خاوەنیان گەورە دەبنو زیاد دەکەن، زەکاتدان هەیە، یان نەعتەکە ئیضافە کرابێت، وەك (سائمة الغنم)، و یاخود شتی بۆلا ئیضافە کرابێت، وەك (مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ)، هەرکەس قەرزار بووو، پارەی هەبوو بیداتەوە، دوای بخات ستەمکارەو یاخود نەعتەکە ظەرفی زەمان بوو، وەك ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ﴾ و، یاخود هەر ئەو نەعتە ظەرفی مەکان بوو، وەك ڕستەی (بع فِي بغداد: لە شاری بەغداد مامەڵەی بکە).

**چەند نموونەیەك، لەسەر مەفهومی ئاوەڵناوی (مَفهوُمُ الصِّفَة):**

١- خـوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾[1] ئینجـا هـەر کەسێکیشـتان لەبـەر دەسـت تـەنگی مـاڵیی، توانـاو دەسـەڵاتی نـەبوو، ژنـانی ئازادی داوێن پاکی بڕوادار مارە بکـات، بـا لـەو کیـژە (کـەنیزە) بڕوادارانـە بوونەتـە ماڵتان مارە بکات، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە دروستە کە نیزەکی باوەڕدار مارە بکرێت، لە کاتێکدا کە ئەو کەسە توانـای هەیـە، کـە ژنـی ئازاد مارە بکات، و ئایەتـە پیرۆزەکە بـە مـەفهومی پێچـەوانەی (مَفهـوُم الـمُخالَفَة) دەلالەت دەکات، لەسەر نەهی کردن لەسەر مارەکردنی کەنیزەکی ناموسوڵمان!

٢- هــەروەها نموونەیــەکی تــر، وەك ئــەم ئایەتــە پیرۆزەکــە دەفــەرموێت: ﴿وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ﴾[2] هەروەها قەدەغەیە کە حەڵاڵی ئەو کوڕانەیشـتان مـارە بکـەن، کـە بەڕاسـتی لـە پشـتی خۆتـان بـن، واتـە: بـووك، دیارەکە ئەمە ژنی کوڕەزاو کچەزایش دەگرێتەوە، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە بە (مَفهـوُم الـمُخالَفَة) دەلالـەت لەسـەر ئـەوە دەکـات، کـە ژنـی بـەکوڕ کـراو، واتـە کـوڕی پشتاوپشتی خۆت نەبێت، مارەکردنی یاساغ نییە!

٣- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (فِي السَّائِمَةِ زَكَاة)، واتە: ئەو مەڕوماڵاتەی کە بەدەمی خۆی دەلەوەڕێ، زەکـاتی تیـادا هەیـەو، کەواتـە: بـەپێی مانـای پێچـەوانە (مَفهوُم الـمُخالَفَة)، لەمەڕو ماڵاتی دابەستە (غير السائمة)دا زەکات نییە

٤- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (فمن باع نخلةً مؤبرة فثمرتها للبائع) واتە: هەر کەس باخە خورمایەکی موتوربەکراو بفرۆشێت، ئـەوە بەرهەمەکـەی بـۆ فرۆشـیارە،

---

[1] النساء: (٢٥).

[2] النساء: (٢٣).

که بەمەفهومی پێچەوانەی ئەم فەرموودەیە بەرهەمی خورمای موتوربە نەکراو، بۆ فرۆشیار نییە!

٥- جابر (خوا لێی ڕازی بێت)دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاریدا لەسەر مافی نزیکیو دراوسێتی (شفعة) لەسەرجەم هەموو ئەو شتانەیدا کە هاوبەشنو دابەش نەکراون، کە بەپێی مەفهومی پێچەوانە بێت، لەو شتانەیدا کە دابەشکراونو، هاوبەشی تیایاندا نەماوە، پرۆسەی (شفعة) رەچاونەکراوەو، کاری پێ ناکرێت!

٦- هەروەها نموونەیەکی تر وەك ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لَيُّ الوَاجِدِ يُحِلُّ عُقُوبَتَهُ وَعِرْضَهُ)، واتە: ئەگەر کەسێك توانای هەبوو، کەمافی خەڵکی کە لەسەریەتی بیداتەوەو، بۆی بگێڕێتەوەو، بەڵام لەدانەوەیدا کەمو کورتی کرد، ئەوە خاوەن مافەکە دەتوانێت بڵێت، کە ستەمی لێ کردوومو، لە دانەوەی مافەکەی مندا سستی نواند چونکە قسەی لەم جۆرە لە بارودۆخێکی لەم شێوازەدا نەبێت دروست نییەو، ئەم کارەی کابرای لار دانەوەی مافی خەڵیدا، شیاوی ناوزڕاندنو سزادانیەتی، کە بە پێی مانای پێچەوانە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) دەردەکەوێت، کە ئەو کەسەی لە نەبوونیو نەداریدا ناتوانێت، قەرزەکەی، یان هەرمافێك کە هەیە، بیداتەوە بە خاوەنەکەیو ڕادەستی بکاتەوە، ئەمەیان ناچاری وای لێ کردووە، بۆیە ناوزڕاندنو سزادانو تەمبێ کردنی دروست نییە!

## دووەم: ((مَفهوُم الشرط)):

بریتییە لە دەلالەت کردنی ئەو لەفزەی کە حوکمەکەی لە خۆ گرتووە، بەلام مەرج (شرط)تێکی پێوە بەستراوە، کە هەیەتی، حوکمێکی تر دەچێپێنێت، واتە: بەستنەوەی بەو شەتەوەو، لەکاتی بوونی شەرتەکەدا، حوکمەکەیش هەیەو، کە شەرتەکە نەما، حوکمەکەیش نامێنێت.

- نموونەگەلێك لەسەر مەفهوم شەرط:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ﴾[1] کە مەفهومی پێچەوانەی ئەوەیە کە دروست نییە، کە نیزەکی برواداریش مارە بکرێت، لە کاتێکدا کە ئەو کەسە توانای هەبوو، ژنی ئازاد بخوازێتو، مارە بکات.

٢- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[2] واتە: ئەگەر ئەو ژنانە دووگیان بوون، ئەگەر چی سێ تەلاقیش درابن، ئێوە نەفەقەیان بکێشنو بە خێویان بکەن، هەتا سکەکەیان دادەنێن، واتە: ئەگەر ژنە تەلاقدراوەکە دووگیان بوو، ئەوە دووشتیان لەسەرتانە جێگەی نیشتەجێ بوونو، بەخێوکردنو نەفەقە، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە بە دەلالەت کردنی دەستەواژەکەی ( دلالة عبارة) مانای ئەوە دەدات، بە دەستەوەکە واجبە نەفەقەی ژنی تەلاقدراو، بەسێ تەلاقیش (بائن) بکێشرێت، ئەگەر دووگیان بوو، و بە (مَفهوُم المُخالَفَة) دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە لە کاتی نەبوونی سکپڕیو دووگیانیدا، ئیتر ئەم حوکمەی بەسەردا جێ بەجێ نابێت.

---

[1] النساء: (٢٥).

[2] الطلاق: (٦).

٣- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا﴾[١] واتە: وەك پێشەكیەك دەبێت مارەی ژنان بدەن، و بە فەرزێكی خوای پەروەردگاریشی بزانن، جا ئەگەر بە پێخۆشبوونی خۆیان شتێكیان لە مارەییەكەیان پێ بەخشین، ئەوكاتە ئێوەیش بیخۆن‌و نۆشی گیانتان بێت.

ئەم ئایەتە پیرۆزە مانای ئەوە دەدات بە دەستەوە كە پیاو بۆی هەیە، هەرچەندێك بێت، لە مارەیی ژنەكەی وەربگرێتە لای خۆی، بەڵام بە پێخۆشبوون‌و ڕازی بوونی ژنەكەو، بە پێی مەفهومی پێچەوانە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) حەرامە، بە هیچ جۆرێك كە لە مارەیی ژنەكەی بخوات، ئەگەر ژنەكە ڕازی نەبێت.

٤- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (الْوَاهِبُ أحق بِهِبَّته إذا لم يثب عنها)، كە ئەم فەرموودەیە دەلالەت لەوە دەكات، كە ئەگەر كەسێك موڵك‌و سامانێكی بەدیاری دابەكەسێكی ترو، لەبەرامبەر ئەو بەخشینەیدا هیچ شتێكی لە جیاتی خەڵاتەكەی خۆی وەرنەگرتبوو، ئەوە مافی پاشگەز بوونەوەی هەیە، لەو دیاری دانەی! كە بەپێی مانای پێچەوانە، یاخود دژە مانا (مَفهوُم الـمُخالَفَة) ئەگەر كەسێك لەبەرامبەر خەڵات‌و دیارییەكەیدا، شتی لە جیاتی وەرگردتبوو، ئەوە مافی پاشگەز بوونەوەی لەو دیاریدانەو خەڵاتكردنە نییە!

- سێیەم: (مَفهوُم الغاية):

بریتییە لە دەلالەت كردنی لەفزێك، كە حوكمی ئەو لەفزە بەستراوەتەوە، بە ئامانج‌و مەبەستێكەوە، كە لە دوای لا چوونی ئەو مەبەستەو بارودۆخە لەسەر پێچەوانەی حوكمی پێشوو دەلالەت دەكات.

---

[١] النساء: (٤).

## نموونەی ئەم بابەتە:

١- خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ﴾[1] کە ئەم دەقە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە ژنی تەڵاقدراو، بە سێ تەڵاق، حەڵاڵ نییە، لە مێردەکەی، بەڵام ئـەم حوکمـە بەسـتراوە، بەمەبەسـتێکەوە، کە شووکردنی ئەو ژنەیە بە پیاوێکی تری غەیری پیاوەکەی خۆی، کە ئەم دەقە بـە مانای پێچەوانە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) دەلالەت دەکات، لەسەر دروسـتی شـووکردنەوەی بـە پیـاوە پێشـووەکەی خـۆی لـە دوای هاتنـەدی مەبەسـتەکەو مەرامەکـە، کـە شووکردنی بە پیـاوی دووەمـەو، لـە دوای جیابوونـەوەی لـە پیـاوی دووەمو بـەدڵی خۆیو بە تەوا بوونی عیددەکەی، ئیتر لە پیاوی یەکەمی حەڵاڵ دەبێتەوە.

٢- خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾[2]، واتە: دەسا بە درێژایی شەوگار بخـۆن و بخۆنـەوە، و بچـنە لای خێزانـەکانتان، هـەتا ئەوکاتـەی هـەودای سـپیایی، دەمـەو بـەیان لـەنێو هەودای ڕەشی شەو لە ڕۆژ هەڵاتەوە دەردەکەوێو جیا دەبێتەوە.

کە ئەم دەقە ئەوە دەگەیەنێت، کە خواردنو خواردنەوە لـە شـەوانی ڕەمەزانـدا، هەتا دەمەو بەیان دروستەو، بە پێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) ئـەوە دەگەیـەنێت، کـە لـە دوای ئەو مەبەستو بارو دۆخـەوە، کـە دەمـەو بەیانـە، ئـیتر خـواردنو خواردنـەوە حەرامە.

---

[1] البقرة: (٢٣٠).

[2] البقرة: (١٨٧).

٣- خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾[1] واتــە: ئــەی پێغەمبــەر (ﷺ) سەبارەت بە تێکەڵی ژنـان لەسـەردەمی بـێ نوێـژی‌و، حەیزییانـدا لێت دەپرسـن؟ پێیان بڵێ، ئەو خوێنە شتێکی زیاناوی و قێزەونە، و هەرکەسێك لێی نزیك ببێتەوە، توشـی ئەزیـەت‌و ئـازار دەبێـت، جـا کـەوابوو، ئێـوەیش لـە مـاوەی بـێ نوێژییانـدا لێیانەوە دووربن‌و تێکەڵی سەرجێیان مەکەن‌و، نابێت نزیکیان ببنـەوەو بچنە لایـان هەتا پاك دەبنەوە، جا کە پاکیش بوونەوەو، خۆیان شۆرد، ئـەوجا دەتـوانن بۆیـان بچن‌و تێکەڵاوییان لە گەڵ بکەن، لـەو جێیـەوە کـە خـودا ڕێگـای پێـداون، واتـە: لـە پێشـەوە، بەڕاسـتی خـودا ئـەو کەسـانەی خـۆش دەوێـت، کـە لـە گونـاه پەشـیمان دەبنەوەو، خۆیان پاك‌و خاوێن ڕادەگرن!

کە بە پێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) دروسـتە لـە دوای پاکبونـەوە سـەرجێیان لەگـەڵ بکرێت.

٤- خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾[2] واتە: ئێوە لەگـەڵ ئـەو کۆمەڵـەیـەدا بجـەنگێن، کـە دەسـتدرێژی دەکـەن، تـا ناچـار دەبێت‌و دەگەڕێتـەوە بـۆ بڕیـارو حـوکمی خـوا، کـە ئـەم دەقـەیش بـەپێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) لەسەر ئـەوە دەلالـەت دەکـات، کـە ئەگـەر کۆمەڵـە دەسـتدرێژی کارەکـە گەڕایەوە بۆلای فەرمانی خودا، ئـیتر شـەڕکردن لـە گـەڵیان نابێـت‌و دروسـت نییـە، بکرێت.

---

[1] البقرة: (٢٢٢).

[2] الحجرات: (٩).

## – چوارەم: ((مَفهوُم العَدَد)):

بریتییە لە دەلالەت کردنی لەفزێك، کە ئەو حوکمەی لەفزەکە دەری دەخات، بەسترابێتەوە بەژمارەیەکەوە، کە ئەو ژمارەیە لاچوو حوکمی پێچەوانی حوکمی یەکەم دێتە ئاراوە، واتە: بەستنەوەی حوکمەکە بە ژمارەیەکی دیاریکراوەوە، وا دەکات کە ئەو ژمارەیە کەم‌و زیادی کرد، ئیتر حوکمەکە پێچەوانە دەبێتەوە.

– نموونەکانی ئەم بابەتە:

١– خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ﴾[1] واتە: هەشتا شەلاق لە بوختانکار بدەن، کە بەپێی مانای پێچەوانە (مَفهوُم الـمُخالَفَة)، نابێت ژمارەی ئەو شەلاقانە لە هەشتا شەلاق زیاتر یان کەمتر بن.

٢– خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ﴾[2] واتە: لە کەفارەتی ئەو کارەدا، سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بن، کە بەپێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة)، ئەگەر ئەو ڕۆژوو گرتنە لە سێ ڕۆژ کەمتر بێت، کەفارەتەکەی لە کۆڵ ناکەوێت‌و، دەبێت پابەند بێت، بە ژمارەکەوە، کە (سێ) ڕۆژە.

٣– خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ﴾[3] کە سزای داوێن پیسی کچ‌و کوڕ، سەد شەلاقە، کە بەپێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) نابێت، ئەو سزایە لەو ژمارەیە، کە سەد شەلاقە کەمتر یان زیاتر بێت.

---

[1] النور: (٩).

[2] البقرة: (١٩٦).

[3] النور: (٢).

## پێنجەم: ((مَفهوُم اللَقَب)):

بریتییە لە دەلالەت کردنی لەفزێك، کە ئەو حوکمەی دەری دەخات بەسترابێتەوە بەناوێکەوە، کە ئەم بەسترانەوەی بەو ناوو نازناوەوە وابکات، کە ئەو حاڵەتو ناوە تەنها لەسەر ئەو شتە دابنێتو، لەسەر غەیری ئەوی لابباتو، مەبەستیش لە (لە ناو: الأسمُ العَلَم)، لێرەدا ئەوەیە کە ئەو لەفزەیە دەلالەت دەکات، لەسەر خودی شتەکە، نەك لەسەر خەسڵەتەکانی (صیفاتەکانی)، ئیتر چونیەکە ئیسمی عەلەم بێت، وەك (قام زید) یا ناوی جۆر (إسم نوع)بێت، وەك (في الغنم زکاة: لە ئاژەڵدا زەکاتدان هەیەو، دەبێت بدرێت).

## نموونەکانی:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ﴾[1] کە بەپێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) غەیری موحەمەد (ﷺ) کەس پێغەمبەری خوا نییە، واتە لەسەردەمی ئەوو دوای ئەودا.

٢- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّـٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾[2] کە بەپێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) غەیری ئەوانەی کە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتوون، هاوسەرایەتی کردن لەگەڵیاندا حەڵاڵەو دروستە.

٣- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (فـي البُـرِّ صَدَقَة) واتە: زەکاتدان لەگەنمدا هەیە، کە ئەمەیش بەپێی مانای پێچەوانە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) ئەوەیە کە لە غەیری گەنمدا زەکاتدان بوونی نییە!

---

[1] الفتح: (٢٩).

[2] النساء: (٢٣).

## ٢٥٥- مەرجەکانی کارکردن بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة):

ئەم بابەتی (مَفهوُم الـمُخالَفَة)یە، بە هەموو بەشەکانییەوە، دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە ئەو حوکمەی کە درکێندراوە، پێچەوانەکەی دەچەسپێت، بۆ ئەوەیان کە بێدەنگیی لێکراوە، ئیتر چونییەکە ئەو حوکمەی کە دەربڕدراوە (منطوق عنه)یە، بڕیارێك بچەسپێنێت، واتە: (إثبات) بکات، یان ڕەتی بکاتەوە، (نفي) بکات، لە لای ئەوانەی کە کار بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) دەکەن، ئەوەیان بەمەرج گرتووە، کە دەبێت ئەو کۆت و بەندەی کە حوکمەکەی پێ بەستراوەتەوە، سودی تری نەبێت، تەنها سوودی ئەوەی هەبێت، کە حوکمی درکێندراوەکە لا بەرێت لەسەر بێدەنگیی لێکراوەکە، واتە: لە کاتی نەبوونی کۆتەکەدا، حوکمەکەیش نابێت، جا ئەگەر سودێکی تری لەمە زیاتری هەبوو، ئەوە نابێتە بەڵگەو، بۆ کارپێکردن ناشێت، وەك ئەوەی کە ئەو کۆت و بەندەی لەسەریەتی، لە ڕوانگەی زۆرایەتی (أكثرية) لەسەری دانرابێت، وەك ئەو کۆتەی کە بۆ ڕوونکردنەوەی زۆری ئەو حاڵەتە لە پرسی ژناندا هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّـٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾[1] واتە: ئەو کچانەی کە خۆتان بەخێوتان کردوون لە (زڕ کچ - کۆڵەبەس) لەو ژنانە بن، کە ئێوە چوینەلایان، ئەمانە هاوسەرایەتی کردن لە گەڵیان دروست نییە، کە لێرەدا کۆت و بەندی (في حجوركم) کۆت و بەندێکی خۆپارێزی لێکردن (إحتراز)ی نییەو، بەڵکو کۆتێکی زۆرینەییە، لەسەر بنەمای ئەوەی کە نەریتی خەڵکی وایە کەژن شووی کردەوەو، لە مێردی پێشووی کچی هەبوو، لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ ماڵی مێردە تازەکەی‌و، لەوێ پەروەردەی دەکات، لێرەدا کار بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة)ی، ئەم دەقەناکرێت، بەو

---

[1] النساء: (٢٣).

مانایەی کە (کۆڵەبەس) بە مارەکردنی دایکی، ئیتر لە پیاوەکە حەرام دەبێت، ئیتر چونیەکە، لە خانووی کابرای دووەمدا پەروەردەو چاودێری کرابێت، یان نا....

هەروەها نموونەیەکی تر وەك ئەوەی کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً ﴾[1] واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، سوو چین لەسەر چین مەخۆن و، وەری مەگرن، وەك سەردەمی نەفامی بۆ نموونە، ئەچوون (١٠٠) دیناریان ئەدا بە (٣٠٠) دینار، چونکە لە بنەڕەتدا، سوو خۆری بە هەموو شێوەیەك حەرامکراوە، کە لێرەدا کاربە (مَفهوُم الـمُخالَفَة)ـی، ئەم دەقە ناکرێت، کە دروستی خواردنی سوویە، ئەگەر چین لەسەر چین نەبوو، و چەند بەرابەر نەبوو، لە بڕە ئەسڵییەکەی خۆی، چونکە ئەم کۆت (قید)ـە، بۆ ڕوونکردنەوەی حاڵەتی زۆرینە (أغلبية)ـە، لە مامەڵە سوودارەکاندا، کە دەستپێکردنیەتی بە بڕێکی کەم، و دواتر وردە وردە زیاترو زیاتر دەکات، بەپێی سەردەمو، یاخود ئەم کۆتو بەندە دەرخستنو باسکردنو ڕوونکردنەوەی ئەو واقیعو بارودۆخە هاتووە، کەواتە ئەم کۆتەلێرەدا، کۆتی خۆپاراستن نییەو، مەبەستی لەحەرامی سوویە، کەم بێت، یان زۆرو، بۆیە لێرەدا کار بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة)ـی، ئەم دەقە ناکرێت.

هەروەها ئەگەر مەبەست لەو کۆتە زۆرایەتیو ڕۆچون (التكثير والمبالغة) بوو، ئەوا هەر دیسان کار بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) ناکرێت، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴾[2]، کە لێرەدا هێنانی وشەی (حەفتا جار) کۆتێکی خۆپارێزی (قيد إحترازي) نییە، بەڵکو

---

[1] آل عمران: (١٣٠).

[2] التوبة: (٨٠).

مەبەستی لە زیادەڕەوی کردنو ڕۆچوونە لە داوای لێخۆشبوون کردن بۆیان، هەرچەندە زۆر داوای لێبوردن بکرێت بۆیان، هیچ سوود ناگەیەنێت بەو کەسەی کە داوای لێبوردنەکەی بۆ کراوە، بە پێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) دەلالەت لەسەر ئەوە ناکات، کە ئەگەر داوای لێبوردن کردنەکە لەو ژمارەیە زیاتر بێت، ئیتر سوود دەگەیەنێت بە کەسی لێبوردن بۆ داواکراو!

## ٣٥٦- بە بەڵگەبوونی (مَفهوُم الـمُخالَفَة):

جەماوەری زانایان ڕایان وایە، کە لە (مفهوم اللقب)دا کار بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) ناکرێت، و ئەم ڕایەش دروستە، چونکە لە واتای نازناو (مَفهوُم اللقب)دا، ئەوەی لێ نافامرێتەوە کە حوکمەکە لابدات، لەسەر غەیری ئەو ناوەی کە حوکمەکەی لەسەر هاتووە بۆ نموونە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((فـي الغنم زكـاة)) واتە: لە مەڕو بزندا زەکاتدان هەیە، ئەمە ئەوەی لێ نافامرێتەوە کە زەکاتدان لە حوشترو مانگادا نیە، وە هەروەها فەرمایشتەکەی تری پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((فـي البرّ صدقة)) لە گەنمدا زەکاتدان هەیە ئەوەی لێ نافامرێتەوە کە زەکاتدان لە جۆر گەنمەشامیدا نیە.

پاشان سەبارەت بەبەڵگەنەکردنی (مَفهوُم اللّقب)، جیاوازی نییە لە نێوان دەقە شەرعییەکانو دەقەکانی یاسادەسکردەکانو دەستەواژەکانی دانەران (المؤلفين)و گرێبەستەکانی نێوان خەڵکدا، کە دەوترێت: (دَينُ المُتَوَفّي يُؤدّى مِنْ تَرِكَتِـهِ)، واتە: قەرزی مردوو لە پاشماوەی کەلەپورەکەی دەدرێتەوە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە وەسیەتە دروستو شایەنەکانی بۆ جێبەجێ کردن لەو کەلەپورەی ئامادە ناکرێت بۆ پراکتیزەکردن، وە هەروەها دەوترێت: (البيـع ينقـل الملكيّـة) واتە: مامەڵە خاوەندارێتی دەگوازێتەوە لە فرۆشیارەوە بۆ کڕیار. ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە مامەڵە نەبێت، هیچی تر گوێزەرەوەی خاوەندارێتی نیەو هتد....

زانایانی ئوصولی فیقهـ کۆکن لەسەر بەبەڵگەکردنی (مَفهوُم الوصـف)، و (مَفهوُم الشرط)، و(مَفهوُم الغايَة)، و(مَفهوُم العدد)، لە غەیری دەقە شەرعییەکاندا، واتـە: لـە گرێبەستەکانی خـەڵكو هەڵسوکەوتو مامەڵـەکانیانو قسـەکانیانو دەسـتەواژەی دانەرەکانو شەرعزانەکاندا، و لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر کەسی وەقفکار وتـی: لـە دوای خۆم خانووەکـەمم وەقفکـرد لەسـەر قوتابیـانی زانسـتخواز لـە شـاری بەغـداد، ئـەم قسەیەی ئەم کابرایە بە گوێرەی دەربڕینەکەی ئەوە دەگەیـەنێت کـە وەقفکردنەکـە ئەم پێڕە زانستخوازە دەگرێتەوە نەوەك گروپو کەسـانی تـر، وە هـەروەها ئەگـەر کەسێك وەسیەتی کردو وتی: ئەوا سێیەکی سـامانەکەمم کـردە وەسـیەت، کـە وەك هاوکاری بدرێتـە خزمـە نزیکـەکانم، ئـەوە وەسـیەتەکەی بـۆ ئـەو خزمـە هەژارانـەی دەبێت، نەوەك بۆ پارەدارەکانیان، و هۆکاری بوون بە بەڵگەی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) لە قسـەو گوفتـاری خەڵکیـدا ئەوەیـە کـە نـەریتی خـەڵکیو ئـەو زاراوانـەی کـە پێـی تێدەگەنو لە دەستەواژەدا بەکاری دەهێنن بۆ حاڵی بوون، لەسەر ئەم شێوازەن، و ئەگـەر کـار بـە (مَفهـوُم الـمُخالَفَة) نـەکرێت ئـەوا گرێبەستەکانیان بـەفیڕۆ دەڕواتو وەسێتو ئیرادەیان تێکدەشکێنرێتو ئەمەیش کارێکی دروست نیە.

زانایانی زانسـتی ئوصـولی فیقهـ، سـەبارەت بەبەڵگـەکردنی (مَفهـوُم الوصـف)، و (مَفهـوُم الشـرط)، و (مَفهـوُم الغايـة)، و (مَفهـوُم العـدد)، لـە دەقـە شـەرعییە تایبەتییەکاندا ڕاجیاییان هەیـە، و جـەماوەری زانایـان لەسـەر ئـەوەن کـە دەکرێـت بکرێنە بەڵگە، و حەنەفییەکان ڕایـان وایـە کـە ناکرێنـە بەڵگـە، و لـەم ڕوانگەیـەوە، ئەگەر دەقێکی شەرعی هات، کە دەلالەتی دەکرد لەسەر حوکمێك لە پێشهاتێکدا، و وەصفێکی یان مەرج (شرط)ێکی، پێوە بەسترابوو، و یاخود سنورێکی بـۆ دانرابـوو، و یان ژمارەی بۆ دیاری کرابوو، ئەوا لە پێشهاتێکدا کـە ئـەم کۆتانـەی بـە سـەرەوە

نەبوو، و داماڵرابوو لێیان، ئەوە پێچەوانەی حوکمی یەکەمینی هەیە، لەسەر ڕای جەماوەری زانایان.

ئینجا لای حەنەفیەکان دەق تەنها لەسەر حوکمی ئەو پێشهاتە دەبێتە بەڵگە، کە بەو مەرجانەوە هاتووە، کە لەسەری دیاری کراون‌و ئەو پێشهاتەی کە ئەو مەرج‌و کۆتانەی تیادا نەهاتووە ئەوا دەقەکە بە پێی (مَفهوُم الـمُخالَفَة) دەلالەت ناکات لەسەر حوکمەکەی، بەڵکو حوکمەکەی بە بێدەنگیی لێکراو (مسکوت عنـه) ئەژمار دەکرێت‌و بە بەڵگەی شەرعی بەدواداچوون‌و گەڕانی بۆ دەکەین، بە مەبەستی دۆزینەوەی‌و ئەگەر بەڵگەمان دەست نەکەوت، ئەوا بە پێی بەڵگەی (أستِصحاب) کار دەکەین، کە بریتیە لەوەی کە (الأصل فِي الأشياء الأِباحة) واتە: ئەسڵی سەرجەمی شتەکان ئەوەیە کە حەڵاڵن.

پاشان بەڵگەی حەنەفییەکان ئەوەیە کە، ئەو کۆت‌و بەندانەی کە بەدەقە شەرعیەکانەوە لکاون، سودی زۆریان هەن، ئەگەر ئەو سودانەمان بۆ دەر نەکەون، ناتوانین دان بەوەدا بنێین، کە سوودەکانی ئەو کۆت‌و بەندانە بریتییە لە تایبەت کردنی حوکمەکە بەو شتەوە کە کۆتەکەی پێوە بەستراوەو، هەروەها لادانی حوکمەکە لەسەر ئەو شتەیان کە کۆتەکەی پێوە نییەو، هۆکاری ئەمەیش ئەوەیە کە ئامانج‌و مەبەستەکانی شەرع زۆرن‌و، کۆنتڕۆڵ ناکرێن، بە پێچەوانەی ئامانج‌و مەبەستەکانی مرۆڤەوە، کە دەکرێت پیایاندا ڕابگەین‌و کۆنتڕۆڵیان بکەین‌و، بۆیە هەر بەم بەڵگەیە (مَفهوُم المُخالَفَة) لەقەسەو گوفتاری مرۆڤەکاندا دەکرێتە بەڵگە، بەڵام لە گوفتاری شەرعدا، ناکرێتە بەڵگە!

هەروەها لە شێوازەکانی زمانی عەرەبیدا، شتێکی لەم جۆرە بایەخدار نییە، کە پێچەوانەی حوکمە درکێندراوەکە (منطوق) بچەسپێنرێت، بۆ بێدەنگیی لێکراوە کە (مسکوت عنه)، و بەڵگەی ئەمەیش ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك بە کەسێکی تر بڵێت،

(إذا جاءك فلانٌ صباحاً، فأكرمه)، ئەگەر فلآنەکەس سەر لەبەیانی هات بۆلات ڕێـزی بگره، ئەوا لەم قسەیەوە ئەوە نافامرێتـەوە، کـە ئەگـەر شـەو هـات، بـۆ لات، ڕێـزی مەگره! و هەر بە پێی ئەم بەڵگەیەش دروستە، کە پرسیار لە بوێژ بکرێـت، کـە ئایـا ئەگەر شەو هـات بـۆلام، ڕێـزی لێ نـەگرم؟! و لەبـەر ئـەوەی کـە دەلالـەتکردنی ئـەو درکێنـدراوە (منطـوق) لەسـەر بێـدەنگی لێکـراو (مسـکوت) دەلالـەتێکی یـەکلایی (قطعي) نەبوو، بۆیە تەنها لەبەر ئەگەری بوونی ئەم بەڵگەیە، ناکرێـتو ناگونجێـت، کـە دەقەشـەرعییەکە بکرێتـە بەڵگـە لەسـەر بێـدەنگی لێکراوەکـەیان چـونکە بـە بەڵگەکردنی دەقە شەرعییەکان لەسـەر بنـەمای ئەگەرەکانـە (إحتیـاط)ـە، و کـاری ئەگەری (إحتیاط)یش، وایە، کە خوازیـار بـە (مَفهـوُم الـمُخالَفَة) نییـە و، کـاری پـێ ناکات.

هەروەها بەڵگەیەکی تریان ئەوەیە کە زۆرینـەی دەقەشـەرعییەکان کـە دەلالـەت لەسەر حوکمەکان دەکەن، لەو پێشهاتانەیدا کـە کـۆت و بەنـدەکانیان تیـادا هەیـە، ئـەوا هـەمان حـوکم چەسـپاوە، لـەو پێشـهاتانەیدا کـە کـۆت و بەنـدەکانیان تیـادا نەهاتووە، وەك، کورتکردنەوەی نوێژ، بە مەرجی بوونی ترس، کـە کـورت کردنـەوە هەیە، بەبێ بـوونی ترسـیش، واتـە: لـە حاڵـەتی تـردا، کـە ئەمـە دەلالـەت دەکـات، لەسەر ئەوەی کە کارکردن بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) شـتێکی یـەکلایی (قطعـي) نییـەو، هـەروەها کاتێـك کـە شـەرع دەیـەوێت، کاربـە (مَفهـوُم الـمُخالَفَة) بکـات، ئـەوا بـە شێوەیەکی ڕاستەو خۆو ئاشکراو بەدەق ڕوونی دەکاتەوە، وەك ئەم ئایەتە پـیرۆزە کـــە دەفـــەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾[1] کە کەمێك پێش ئێستا کردمانە کوردیو پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات.

---

[1] البقرة: (٢٢٢).

ئینجا بەڵگەی جەماوەری زانایان ئەوەیە کە ئەو کۆتو بەندانەی کە لە سەردەقە شەرعییەکان هاتوون، هەروا بەهەوانتەیی‌و لە خۆوە دانەنراون‌و، بەڵکو بۆ سووگەیاندن دانراون‌و، ئەگەر ئەم کۆتو بەندانە تەنها سودی ئەوەیان هەبێت، کە حوکمەکەی تایبەت بکات، بەو پێشهاتانەوە کە کۆتو بەندەکانیان تیادا هاتووە، ئەمە ئەوە پێویست دەکات، کە حوکمەکە لابدات، لەسەر ئەو پێشهاتانەی کە کۆتو بەندەکەیان لەسەر نییە، واتە: کار بە (مَفهوُم الـمُخالَفَة) بکرێت، تا ئەو کۆتو بەندانە بە هەوانتەویێ ئامانج نەیەنە ئەژمار، کە بێگومان شەرع لەشتی لەم جۆرەوە دوورە.

هەروەها ئەوەیشیان کردووەتە بەڵگە کە نەریت لە شێوازەکانی زمانی عەرەبیدا وایەکە بەستنەوەی هەر حوکمێك بەکۆتو بەندێکی دیاریکراوەوە دەلالەت دەکات، لەسەر نەبوونی ئەو حوکمە لە کاتی نەبوونی ئەو کۆتو بەندانەداو، ئەم شتەیش حاڵەتێکە کە هزری مرۆڤ بۆی دەچێت‌و، پێشوەخت دەستپێشخەری بۆ دەکات، بۆیە هەر کەس ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری (ﷺ) بیستبێت، کە دەفەرموێت: (مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ)، دواخستنی قەرزدانەوە، لەلایەن کەسێکەوە کە هەیبێت، و قەرزەکەی نەداتەوە، ستەمکردنە، ئەمە لە هزری کابرای بیسەردا ئەوەی لێ حاڵی دەبێت‌و، لێی دەفامرێتەوە، کە دواخستنی قەرزدانەوەی کەمدەستو هەژار کە نییەتی بیداتەوە، کارێکی ستەمکارانە نییە.

ئەوەی ئێمە زیاتر بەلایدا دەڕۆین، ڕاکەی جەماوەری زانایانە، بەڵام ئەویش بە ئەسپایی بەلایدا دەڕۆین‌و وەری دەگرین، چونکە ئامانج و مەبەستەکانی شەریعەت هەرچەندە زۆرن‌و، کۆنترۆڵ ناکرێن، بەڵام ئەگەر لەلای کەسی موجتەهید، سودی ئەم کۆتو بەندانە تەنهائەوە بوو، کە حوکمەکە تایبەت بکەن، بەو حاڵەتەوە کە کۆتو بەندەکانی تیادایە، ئەوا زۆرینەی گومانی موجتەهیدەکە بەلای ئەوەدا

دەڕوات، کە ئەو کۆت و بەندە تەنها بە مەبەستی گەیاندنی ئەم سوودە دانراون و، دواجار حوکمەکە لەسەر ئەو پێشهاتانەی کە کۆت و بەندەکانیان لە سەر نییە، لا دەدرێت و، گومانە زۆرەکەیش بۆ کارکردن بە (مَفهوُم المُخالَفَة) بەسەو، چونکە بە پێی کۆکبوونی ئەوانەی کە کاربە (مَفهوُم المُخالَفَة)دەکەن، ڕایان وایە، کە دەلالەت کردنی ئەم مەفهومە، لێرەدا (ظَنّي)یە، و (قَطْعي) نییە.

**٢٥٧- بەرهەمی ئەم ڕاجیاییە:**

بەرهەمی ئەم ڕاجیاییە، لە کاتی هاتنی دەقێکی بەستراوە بەکۆت و بەندەوە دردەکەوێت، و ئەوانەی کە کار بە (مَفهوُم المُخالَفَة) دەکەن، بە بوونی ئەم کۆتانە حوکمەکە بۆ درکێندراوەکە (منطوق) دەچەسپێنن، و کە کۆت و بەندەکەیش نەما، حوکمەکە لا دەدەن، بەڵام ئەوانەی کە کار بە (مَفهوُم المُخالَفَة) ناکەن، ئەوا حوکمەکە دەچەسپێنن بۆ درکێندراو (منطوق)ـەکە، لەو جێگایەدا کە حوکمەکە هاتووە، کە کۆت و بەندەکە نەما، ئەوا پێچەوانەی ئەو حوکمەی بۆ ناچەسپێنن و، بەڵکو لەبەر ڕۆشنایی بەڵگە گەلی تردا، بە دوادا چوون و گەڕان بۆ حوکمەکەی دەکەن.

## (( بەشی دووەم ))

## (( نیازو مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلام ))[1]

زانینی نیازو مەبەستە گشتییەکانی شەریعەت کارێکی پێویستە، بۆ تێگەیشتن لە دەقە شەرعییەکان، بە شێوەیەکی دروستو، هەروەها بۆ هەڵێنجانی ئەحکامەکان لەبەڵگەکانییانەوەبە شێوازێکی گونجاوو وەرگیراوو بۆیە تەنها زانینی ڕووەکانی دەلالەت کردنی لەفزەکان لەسەر ماناکان بۆ کەسی مەجتەهید بەس نییەو، بەڵکو پێویستە لەسەری کە نهێنییەکانی شەرعداناو ئەو مەرامو مەبەستە گشتییانە بزانێت، کە شەرع مەبەستی بووە، لەکاتی دانانی ئەحکامە جیاوازە شەرعییەکاندا، تا ئەو کەسە موجتەهیدە بتوانێت، کە لە دەقەکان تێ بگاتو، بە شێوەیەکی دروست ڕاڤەیان بکاتو، لەبەر ڕۆشنایی ئەو نیازو مەبەستە گشتییانەدا حوکمەکان دەربهێنێت.

٣٦١- بەپێی ئەزموونو، تەقەیۆر نەبوونی حاڵەتەکە (إستقراء)، و بە دوادا چوون کردن بۆ ئەحکامە جۆراو جۆرەکانی شەریعەت ئەوە چەسپاوە، کە نیازو مەرامو مەبەستی ئەسڵیی دانانی ئەحکامەکان بریتییە، لە بە جێهێنانی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤەکانو، پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانەو، لادانی زیان لەسەریان، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە، ئەو بەرژەوەندییانە ئەوانەنین، کە مرۆڤەکان دەیانبینن، بە پێی حەزی خۆیان بەسوودو بەرژەوەندی تەماشای دەکەنو، بەڵکو بەرژەوەندی ئەوەیە کە لە تەرازووی شەرعدا بە بەرژەوەندی ئەژمار کراوە، نەوەك لە تەرازووی حەزو هەواو هەوەسدا، چونکە مرۆۋ جاری وامەیە، کە بەحەزو هەوەسی خۆی شتی سوودمەند بە زیان تەماشا دەکاتو، یان شتی زیانمەند بە

---

[1] الموافقات، للأمام الشاطبي، ب٢، ٢٥٢و دواتر الشيخ خلاف، ل ٢٣٢و دواتر، مذكرات في أصول الفقه ، للأستاذ الزانزف، ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

سوود تەماشاو ئەژمار دەكات، ئەمەش بەپێی كەوتنە ژێر كاریگەری دەروون، و ئەو جیهان بینییەی كە خۆی هەیەتی، كە حەز دەكات، بە پەلە بگات، بە سوودێكی كەم، بە بێ ئەوەی كە ڕەچاوی ئەو زیانە مەزنەی كردبێت، كە لە داهاتووی ئەو كارەدا كە ئەو بە باشی زانیوە، ئاوقەی دەبێت، بۆ وێنە وا بیردەكاتەوە كە خواردنی ماڵی خەڵكی بە ناهەق و، بەشێوازی نهێنی و پێچاو پێچ یان بەشاردنەوەو قۆرخكردنی خواردەمەنییەكانیان یان بە سوو خۆری كارێكی سوودمەندو دروستە، تا سامانەكەی بەم ڕێگا یاساغو ناخاوێنە زیاد بكاتو، یاخود دانیشێتو، جیهاد نەكات لە ڕێی خوادا، تا ژیانێكی خۆشو ڕاحەت بباتە سەرو لەم كاتەدا مرۆڤ ئەو ڕاستییەی بیری خۆی بردۆتەوە، كە ئەم سوودانە ڕواڵەتینو حەقیقی نین، چونكە لە ناواخندا زیانی ڕووت دەبن، هەم لە ئێستاو هەم لە ئایندەدا.

لە پێناوی هەموو ئەمانەدا، پێویستیمان بە ڕوونكردنەوەی نیازو مەبەستو ئامانجو مەرامە گشتییەكانی شەریعەت هەیە، تا ئەو كەسەی كە تەكلیفی شەرعی لەسەر شانە، بیانزانێت، و هەروەها بزانێت، كامیان ئەنجام بداتو، واز لە كامیان بهێنێتو، لەبەر ڕۆشنایی ئەو نیازو مەبەستانەدا بەرژەوەندیو زیانە كانی خۆی كێشانە بكات.

هەروەك گوتمان مەبەستو ئامانجی شەرع یەكەمجار بریتییە لە بەجێ گەیاندنی بەرژەوەندی مرۆڤەكان، و دواتر پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانەیەو بە پێی ئەزموونو بەدوا داچوون ئەوە چەسپاوە كە ئەم بەرژەوەندییانە سێ جۆرن، (الضروريات)، و (الحاجيات)، و (التحسينيات)، و هەموو جۆرێك لەم سییانە تەواو كاری خۆیی هەیەو، هەروەك هەر سێكیسیان لە گرنگیدا لەیەك پلەدا نینو، ڕوونكردنەوەی ئەم پرسەیش بەم شێوازەی لای خوارەوەیە:

٣٦٢- (الضروريات): پێویستییەکان):

مەبەست لەم زاراوەیە، بریتییە لەو بەرژەوەندییانەی کە ژیانی خەڵکیو، کۆمەڵگەو سەقامگیری کۆمەڵگەی لەسەر وەستاوەو، بەرپا بووە، بەجۆرێك کە ئەگەر ئەم پێویستیانە نەبن ئەوا ژیانی خەڵکی تێك دەچێتو، بێ سەرو بەری باڵ بەسەر ژیانی مرۆڤەکاندا دەکێشێتو، بێ ئاکامیو شڵەقان تووشی کارو کردەوەکانیان دەبێتو، هەروەها بەدبەختی دنیاو سزای دوا ڕۆژیان ئاوقە دەبێت.

ئەم پێویستیانە (الضروريات)ـانەیش، بریتییە لە، (ئایین)و، (گیان)و، (ژیری)و، (وەچە)و، (سامان)و، شەرع ڕەچاوی سەرجەمی ئەم بەرژەوەندییانەی کردووە، ئەگەر چی لەوانەیە لەڕووی شێوازەکانی ڕەچاوکردنو پاراستنی ئەم بەرژەوەندییانەوە جیاوازی هەبێتو، شێوازەکەی شێوازی جیاجیای وەرگرتووەو، شەریعەتی ئیسلامی کە دوا شەریعەتە، بە جوانترین شێوەی ڕەچاوکردنو چاودێری کردن ئەم بەرژەوەندییانەی لەبەر چاو گرتوونو، لەسەر ەتادا بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییەکان ئەحکامی داناونو، دواتر بۆ پاراستنیشیان حوکمی بەرپا کردوون.

بۆیە بۆ بەدیهێنانی (ئایین)، (باوەڕ)و، (پایەکانی باوەڕ)ی داناون، کە پایەکانی بریتین لە، شایەتومانو ئەوەی پێویستە بۆ شایەتومانەکەو، بیرو باوەڕەکانی تر، وەك بڕوا هێنان بەزیندوو بونەوەو لێپرسینەوەو، هەروەها بنەماکانی پەرستشی ، وەك نوێژ و ڕۆژوو، و حەج، و زەکاتدان، کەبەم کردەوە گەلە (ئایین) دێتەدی، و کاروبارو حاڵی خەڵکی باش دەبێتو، ڕێك دەبێتەوەو، دواجار کۆمەڵگە لەسەر بنەمایەکی بەهێزو بەتین بونیات دەنرێت.

هەروەها بۆ پاراستنی (ئایین)، بڕیاری بانگەوازکردنی داوە بۆ لایو، هەروەها بڕیاری ئەوەیشی داوە، کە دەبێت بەر پەرچی هێرشی دوژمنکارانە بۆ سەری

بدرێتەوەو، هەروەها جیهادی پێویست کردووە، لەدژی ئەوانەی کە دەیانەوێت بەتاڵی بکەنەوەو، مەشخەڵی ئایینداری بکوژێننەوەو، هەروەها سزای داناوە لەسەر ئەوانەی کە لێی پاشگەز دەبنەوەو، هەروەها ئەوانەی قەدەغەکردوون، کە گومان لەسەر بیرو باوەڕی خەڵکی دروست دەکەنو، هەروەها فەتوادانی بەتاڵی قەدەغە کردووە، لەگەڵ گۆڕینو شێواندنی ئەحکامەکانو هتد... پاشان بۆ بەدیهێنانی (گیان: ڕۆح) پرۆسەی هاوسەرێتی بەرپا کردووەو، بۆ پاراستنی (گیان) ئەو پێویستییانەی داناون، لە خواردنو خواردنەوەو، سزادانی ئەوانەی کە دەستدرێژی دەکەنە سەر گیانی مرۆڤەکان، کە بێگومان (گیان) لەسەر ئەمانە بەندەو بەهۆی ئەمانەوە دەپارێزرێتو، هەروەها حەرامیی کردووە کە (گیان) ڕووبەڕووی تیاچوون بکرێتەوە.

ئینجا (ژیری: عەقڵ) دیارییەکە کە خودا خەڵاتی مرۆڤەکانی کردووەو، لە ئەسڵی ژیریدا هەموو مرۆڤەکان چوونیەکنو، بۆ پاراستنی ژیری سەرجەم ئەو سەرخۆشکەرانەی حەرام کردووە، کە ژیری تێک دەدەنو، خراپی دەکەنو، هەروەها سزای داناوە بۆ ئەوانەی کە سەرخۆشکەرەکانو ماددە هۆشبەرەکان بەکار دەهێنن، ئینجا بۆ پاراستنی (وەچە) هاوسەرایەتی شەرعیی داناوەو، بۆ پاراستنو تێکەڵ نەبوونی وەچەکان، داوێن پیسی حەرام کردووەو، سزای بۆ داوێن پیس داناوەو، هەروەها بوختانکردنی حەرام کردووەو، سزایش بۆ بوختانکار داناوەو، لەباربردنی کۆرپەلەو ڕێگری کردن لە منداڵ بوونی حەرام کردووە، مەگەر لە بەر پێویستی بکرێت!

هەروەها بۆ بەدەستهێنانی (سامان) مامەڵە جۆراو جۆرەکانی حەڵاڵ کردووەو، بە پێویستی داناوە، هەوڵی بۆ بدرێتو ئینجا بۆ پاراستنی (سامان)، دزی حەرام کردووە، و سزای دزی داناوەو، هەروەها تیابردنی سامانی خەڵکانی تری حەرام

کردووەو، ئەگەر تیادا برا، ئەوا بژاردنی داناوە بۆی‌و، هەروەها سانسۆری داناوە، لەسەر کەسی گەمژەو کەودەن‌و شێت‌و، هتد... هەموویان بەمەبەستی پاراستنی (سامان)ن.

### ٣٦٣- (الحاجيات: پێداویستییەکان):

ئەمەیش برتییە لەو کاروبارانەی کە خەڵکی پێویستی پێیان هەیە، بۆلادانی سەختی‌و ناڕەحەتی لەسەریان‌و، ئەگەر ئەم پێویستییانە نەبن، سیستمی ژیان تێک ناچێت، بەڵام خەڵکی تووشی دژواری سەختی‌و گرفت‌و تەنگەتاوی دەبن‌و، ئەم پێداویستییانە سەرجەمیان پەیوەستن، بە پرسی لادانی سەختی‌و ناڕەحەتی لەسەر شانی خەڵکی، و شەریعەتی ئیسلامیش چەندەها ئەحکامی جۆراوجۆری بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەست‌و ئامانجە بەرپا کردووە، بۆ نموونە لە پەرستشەکاندا بوار و دەرفەت(الرخصة)ی، زۆری داناون، تا ناڕەحەتی لەسەر شانی خەڵکی لا بیات، بۆ وێنە، شەرع ڕۆژووشکاندنی حەڵاڵ کردووە بۆ کەسی نەخۆش‌و ڕێبوارو، هەروەها لە کاتی نەخۆشیدا بەدروستی داناوە،کە نوێژ بە دانیشتنەوە بکرێت، و هەروەها لە سەفەردا کۆبکرێنەوە، و لە کاتی نەبوونی ئاودا دەستنوێژگرتنی بە تەپو تۆز (تەیەممومم) بە دروست داناوەو، لە ناو کەشتی‌و فڕۆکەدا، کە ئاڕاستەکان بەردەوام ڕوو لە گۆڕانن، کەلەسەرەتاوە ڕووی کردە قیبلەو دواتر بەهۆی جموجۆڵ‌و گۆڕانە بەردەوامەکانەوە ئاڕاستەکەی گۆڕا، هیچ گرفتێکی تیادانییەو، شەرع بەدروستی زانیوە.

پاشان لە کڕین‌و فرۆشتنەکاندا، شەرع جۆرەها مامەڵەی داناون، کە لە یاساو ڕێسا گشتییەکاندا هەڵاوێری کردوون‌و، جیای کردوونەتەوەو، بەدروستی داناون، بۆ

وێنــه شــەرع مامەڵـەی (ســەلەم)[1] و کـەل‌و پــەل دروســتکردن‌و بەکرێـدان‌و، زەوی داچاندن (المزارعة)[2]، واتە: کشتوکاڵ، و کشتیاری، به دروسـت دانـاون، و هـەروەها تەڵاقی داناوه بۆ ڕزگار بوون لەو پرۆسه هاوسەرایەتییەی که ئـیتر کـەڵکی مانـەوەو بەردەوامێتی نەماوه !

پاشان لەسزا دانەکاندا، شەرع هاتووه، یاسای لادانـی سـزاکانی لـه کـاتی بـوونی گومـان‌و تەمومــژدا هێناوەتــه ئــاراوه، و هــەرگیز هــەر پرســێك تــەواو یــەکلایی نەبووبێتــەوەو، تەمومــژاوی‌و گومانــاوی بێــت، ســزای تیــادا جــێ بــەجێ ناکرێــت‌و، هەروەها خوێن دانی لەسەر کەس‌و کاری بکوژ داناوه، له کوشتنی هەڵـەدا تائـەرکی سەرشانی کابرای بکوژی هەڵـەکار کـەم بکاتـەوه، جـا سـەرەڕای دەقـه تایبەتـەکان (جزئیة)، دەقی گشتی هــەن، کــه بەڵگــەن، لەســەر ئــەوەی کــه شــەریعەتی ئیســلام ڕەچـاوی بەرژەوەندییـه پێویسـتییەکانی (المصـالح الحاجیـة)ی کـردووه، وەك ئـەم ئایــەت گەلــه، کــه دەفــەرموێت: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾[3]

---

[1] سەلەم: فرۆشتنی شتێکی دیاریکراوه، که لـه ئەسـتۆی فرۆشـیاردایەو، بەنرخێکی پـێش خراوو، زانایان پێی دەڵێن، فرۆشتنی تەنگانه، چونکه فرۆشتنی شتی نادیاره لەبەر ئـەوەی که هەردوولای سەوداکەرەکه پێویستییان پێی هەیه، خاوەن دارایـی پێویسـتی بـەوه هەیـه، که کەلوپەلێك بکرێت‌و، خاوەن کەلوپەلیش پێویستی به نرخی ئەو شته هەیه، پێش ئـەوەی بەرهەمی بهێنێت، بۆ ئەوەی سەرفی بکات، بۆ خۆی‌و کشتوکاڵەکەی، تـاوەکو پــێ بگـات، و کەواته: له بەرژەوەندییه پێویستیەکانه !

[2] المزارعـة، زەوی داچـاندن‌و، کشـتوکاڵ کـردن، بریتییـه لـه زەوی دان بـەو کەسـانەی کـه کشتوکاڵی لەسەر ئەکـەن، بـۆ ئـەوەی بەشـێکی ئـەو کەسـەی تیـادا بێـت، لـەوەی کـه لێـی دەدرێت، وەك نیوەیی، یان سێیەکی، یان زیاتر لەوه، یاخود کەمتر لەوه، بەپێی ڕێکـەوتنی هەردوولا.

[3] المائدة: (٦).

واتە: خودا نایەوێت، کە لە دینداریدا هیچ جۆرە ناڕەحەتییەك بخاتە سەرشانتان‌و سەغڵەتتان بکات‌و، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1] واتە، شیاوی باسە، کە لەم ئایینەدا هیچ جۆرە شتێکی ناڕەواو قورسی نەخستۆتە سەرشانتان، تا ئێوە نەتوانن ئەنجامی بدەن‌و، هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾[2] واتە: خودا ئاسوودەیی‌و کار ئاسانی دەوێت‌و، تەنگیی‌و ڕەحەتی ناوێت!

٣٦٤- (التحسينيات: ڕازاندنەوەو، جوانکارییەکان):

ئەم جوانکارییانە ئەوانەن، کە حاڵی خەڵکی والێدەکەن، کە لەسەر بنەمای داب‌و نەریتی باڵاو ڕەوشتی بەهێز بەرپابکرێت‌و، ئەگەر ئەمانە نەبن سیستمی ژیان تێك ناچێت‌و، دژواری‌و گرفتیش تووشی مرۆڤەکان نابن، بەڵام ڕەوتی ژیانیان پێچەوانەی ئاراستەی پیاوەتی‌و ڕەوشت بەرزی‌و سروشت پاکی وەردەگرێت‌و، شەرعیش ئەم بەرژەوەندییە جوانسازییانەی لە پەرستشەکان‌و کڕین‌و فرۆشتن‌و داب‌و نەریتەکان‌و سزاکاندا ڕەچاو کردووە.

بۆ نموونە لە پەرستشەکاندا، داپۆشینی شەرمگای داناوە، و لەبەر کردنی پۆشاکی زۆر باشی داناوە، لەکاتی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت‌و، بە کردنی خێری سووننەت‌و نوێژو ڕۆژووی سوننەت مرۆڤی بە هۆیانەوە کردۆتە مرۆڤێکی نزیك لە خوای مەزن.

---

[1] الحج: (٧٨).

[2] البقرة: (١٨٥).

و پاشان له كڕینو فرۆشتنەكاندا، پێویستی كردووه، كه نابێت كڕینو فرۆشتن به شته پیسەكانەوه بكرێتو هەروەها زیاده ڕەوی (الأسراف)ـی، حەرام كردووەو، مامەڵەی كەسێكی بەسەرمامەڵەی كەسێی تردا یاساغ كردووه.

ئینجا له نەریتەكاندا، كاركردنی به یاساو ڕێساو نەریتەكانی خواردنو خواردنەوه بەسوننەتێكی جوان داناوه، وەك خواردن بەدەستی ڕاستو، خواردن له بەردەوامی خۆتەوەو، دەستدرێژی نەكردنە، بۆ بەردەمی كەسی ترو، نەخواردنی شته پیسەكانو، خۆپاراستنەوه بەڕەوەشته بەرزەكانو لەها بالآكان.

پاشان له سزادانەكاندا، حەڕامی كردووه، كه لەكاتی كوشتنەوەی كەسێكدا كه كەسێكی تری كوشتبێت، یاخود لەشەڕدا كوژرابێت، نابێت لاشەكەی بشێوێندرێت، هەروەك كوشتنی ژنانو مندالآنو خواپەرستانی (دوورەوەكەوتوو له ئاوەدانیو خەڵكی، واته: ڕوهبانەكان)ی حەرام كردووه.

٣٦٥- تەواو كارییەكانی بەرژەوەندییەكان:

هەر یەكه لەم سێ پرسه (الضروريات)و (الحاجيات)و، (التحسينيات)، تەواو كارییان هەن، كه ئەم تەواوكارییانه دەبنه هۆكاری هاتنەدی بەرژەوەندییەكانو، هەروەها پاراستنیان به جوانترین شێوه.

بۆ نموونه لەشته پێویستەكاندا، (الضروريات) بانگدانو نوێژی به كۆمەڵ دانراون، كه تەواوكاری نوێژن، كه فەرزە له سەر شانی موسوڵمانو، هەروەها له كاتی هەرتاوانێكدا بۆ تۆڵه سەندنەوەكەی شەرع به پێویستی زانیوه، كه دەبێت تاوانبار ئەوەندەی تاوانەكەی سزا بدرێت، و زیادەڕەوی تیادا نەكرێت، و تاوانبارو تاوانكار هاوشێوەیی له نێوانیاندا هەبێت، تا مەبەستی تۆڵه سەندنەوەكە، كه ڕێگری كردنه له دووباره بوونەوەی كردەوەگەلێكی لەم جۆره بكرێت، و هەروەها سەختیو دژواری بچەژێت، بەهۆی ئەو تۆڵەیەوەو، هەروەها ڕێگر دەبێت لەبەردەم

بڵاوبوونـەوەی دوژمنكـاریو ڕقو قـینو، پرۆسـەی هاوسـەرایەتی بۆیـە دانـاوە، تـا وەچەكاری بەردەوام بێـتو، مـرۆڤ هـەر لەسـەر زەوی هـەبنو بـەردەوام بـن، بـەڵام سەرەڕای ئەمەیش هاوشانی بوونی بە پێویسـت دانـاوە، لـە نێـوان پیـاوو ژنـدا، بـۆ ئەوەی ئەم هاوشان بوونە ببێتە هۆكـاری پێكـەوە ژیـانێكی هێمنانـە لـە نێـوان ژنو پیاوداو، هـەردەم خۆشەویسـتی لـە نێوانیانـدا فەراهـەم بێـت، هـەروەك بەدروسـتی داناوە، كە مرۆڤی داواكار تەماشای ئەو ئافرەتە بكات كە دەیەوێت بیخوازێـتو، كـە داوێن پیسی حەرام كردووە، تا وەچەكان تێكەڵ نەبن، و لە یەكتری جیا بكرێنەوە، و سەرجەم ئەو كارانەیشی كە هۆكارن بۆ داوێن پیسی، وەك لەگەڵ ئافرەتدا بـوونی لـە چۆڵەوانیدا حـەرام كـردووەو، تەماشـا كردنیـی بـە زەوقـەوە یاسـاغ كـردووەو، هەروەها گەشت كردنی ئافرەتی بە تەنهاییو بێ كەسی مەحرەم حەرام كردووە، كە ئەمانە هەموو ئەگەر حەرام نەكرانایە، دواجار سەریان بۆ داوێن پیسـی ڕادەكێشـاو، بۆ پاراستنی عەقڵ عارەق خواردنەوەی حـەرام كـردو، سـزای دانـا بـۆ بخۆرەكـەی، ئەگـەر كەمیشـی خواردبێتـەوەو، تەنانـەت سەرخۆشیشـی نـەكردبێت، ئەمـەیش بـۆ بڕینی ئەو بیانوو پاساوەیە كە لە دوای خواردنەوەی ئـارەقی زۆر خراپـەی بـە دوادا دێت، واتە: هەر لەكەمیدا حەرامی كردووە، تا زۆرەكەی بـە دوادانەیـەتو، هـەروەها بۆ بەدەسهێنانیماڵو سامان كە جۆرەها مامەڵەی بـە حـەڵاڵ دانـاوە، هـاتووە ئـەو تەواو كارییانەیشی دانـاون لەسـەر مامەڵـەكان، تـا ئامانجەكـە كـە بـە دەسـتهێنانی سامانە بە شێوەیەكی دروستو شەرعییانە كامڵ ببێـتو بێتـەدی، بۆیـە سـەرجەمی جۆرەكـانی مامەڵـەی نادروسـتی وەك ئـەو مامەڵەیـەی كـە فریـودانی تیادابێـتو، مامەڵەی شتی نادیارو نەناسراوی ئەو شتەی مامەڵەكەی پێوە دەكرێـتو، چـەندەها جۆری تری مامەڵـەی لـەم شـێوازەی حـەرام كـردووەو، شـەرع ڕێگـری كـردووە، لـە ئەنجامدانیان.

پاشـان لـه (الحاجيـات) پێويسـتييەكاندا، كـە هـاتووە، جۆرەهـا مامەڵـەی وای داناونو بەشـەرعيی تەماشـای كـردوون، كـە هۆكـارن بـۆ لادانـی سـەختی و دژواری لەسـەر خـەڵكی، هـاتووە مـەرجی دروستيشـی بـۆ دانـاونو، ئـەو جۆرانـەی ياسـاغ كـردوون، كـە دەبنـە هۆكـاری نـاكۆكی نێـوان خـەڵكیو، كـە خـوێن دانـی لەسـەر كەسوكاری بكوژ داناوە، لەبەر خاتری ئاسانكاری لەسەر ئەو بكـوژەی كـە بـە هەڵـە كوشتنەكەی ئەنجامداوە، لەم پرسەدا شەرع ئـەو خـوێن دانـەی بـە شـێوەی قيسـت داناوە، لەسەر ئەو كەسوكارەی، ئەگـەر توانـای دانـی ئـەو خوێنـەيان هـەبوو، و بـۆ هەريەكـەيان بەشـێكی كـەمی لەسـەر دانـاوە، تابـە ئاسـانی بتوانێـت بيـداتو، جـیّ بەجێی بكات.

پاشان لـە (التحسـينيات)، جوانسـازييەكاندا، كـە شـەرع بـە سـوننەتێكی جـوانی داناوە، كە خێرو خێراتی زيادەو خۆبەخشانە ئەنجام بدرێت، ئەوەيشی دانـاوە، كـە خەڵكی لە موڵكو ماڵی مام ناوەندی خـۆی خێـر بكـات، نـەزۆر چـاك بێـتو، نـە زۆر خـراپ، ئەمـە بـەپێی ڕای حەنەفييـەكانو، هـەروەها كـردنو ئەنجامـدانی پەرسـتش گەلێكی سوننەتی بە هۆكاری تەواوكاری پەرستشەكان داناوە.

لە كۆتايی باسی ئەم تەواوكاری بەرژەوەندييەكاندا، (مكملات المصالح)، تێبينـی ئـەوە دەكرێـت، كـە (الحاجيـات: پێويسـتييەكان) بەتـەواوكاری (الضـروريات) دادەنـرێن، و پاشـان (التحسـينيات: جوانكارييـەكان) بـە تـەواوكاری (الحاجيـات) دادەنرێن.

٣٦٦- پلە بەندی بەرژەوەندييەكان، لە ڕووی بايەخ، و گرينگييەوە:

بەرژەوەندييـەكان بەهـەر سـیّ جۆرەكانيانـەوە، لـەڕووی گرنگيـیو بايەخـەوە چونيەك نين، بۆيە يەكەمينيان كەشياوی ڕەچاوكردنە، بريتييە لـە، (الضـروريات)و، پاشان (الحاجيات)و دواتر (التحسينيات)و، لەسـەر ئـەم بنەمايـە، ئـەو ئەحكامانـەی

که بۆ یەکەمینیان دانراون، گرنگترن، لەو ئەحکامانەی که بۆ دووەمینیان دانـراون‌و، پاشان ئەو حوکمانەی که بۆ دووەمین دانراون، گـرنگترو بایـەخترن لـەو حوکمانـەی که بۆ سێیەم دانراون‌و، پێویستی ڕەچاوکردنی ئەم بەرژەوەندییانە، دەبێـت بـەپێی ئاست‌و قۆناغەکەیان بێت، بەو ڕیزبەندییەی که گوتمـان، بـەو مانایـەی کـە دروسـت نییە، بایەخ بدرێت، بە (الحاجیات) ئەگەر ئـەم بایـەخ پێدانـەی زیـانی دەگەیانـد بـە (الضروریات)و، هەروەها دروست نییە، که بایەخ بـدرێت، بـە (التحسـینیات) ئەگـەر ئەم بایەخ پێدانەی زیانی دەگەیانـد بـە، (الضـروریات)و، (الحاجیـات)، و هـەروەها ڕەچاوکردن و بایەخدان بە (تەواوکارییەکان: المکملات) دروسـت نییـە، ئەگـەر ئـەم ڕەچـاوکردن‌و بایــەخ پێدانــەیان زیــانی هــەبوو، بــۆ ئەســڵەکانی خۆیــان، کــە (الضروریات)و، (الحاجیات)و (التحسینیات)ن‌و، بە پێـی ئـەم یاسـاو ڕێسـایانە، دەر خسـتنی شـەرمگا دروسـتە، هـەر چـەندە داواکـراوە کـە دا بپۆشـرێت، ئەگـەر ئـەو دەرخسـتنەی پێویسـت بـوو، بـۆ تاقیکردنـەوەی پزیشـکی‌و چارەسـەر وەرگـرتن، چونکە داپۆشینی شەرمگا (عورة)، کارێکی جوانکارییەو، وەرگرتنی چارەسـەر، بـۆ پاراستنی گیانە، کە ئەمەیان کارێکی پێویست (الضروریات)ـە، و هەروەها دروسـتە کە شتی پیس بخورێت، وەك گۆشـتی مردارەوبـوو، ئەمـەیش بـۆ پاراسـتنی گیانـە، چونکە پاراستنی گیان (ضروري)یەو، دوورست نییە، کە مرۆڤ لە دژواری‌و سەختی لا بدرێت، ئەگەر ئەم لادانە دەبووە هـۆی لـە نـاوبردنی شـتێکی (ضـروري)، بـۆ نمونـە پەرستشەکان واجبن، هەر چەندە جۆرێك‌و بەشێك لە سـەختی‌و دژواریـان تیادایـە، چونکە کردنیان پێویستە (ضروري)یە، بـۆ پاراسـتنی ئـایین، و بێگومـان پاراسـتنی ئاینیش لە بەرژەوەندییە پێویستیەکانە، (المصالح الضروریات).

هــەروەها ڕەچــاوی بەرژەوەنــدی جوانســازی (التحسـینیات) یــان پێویســتی (الحاجیات) ناکرێت، ئەگـەر ئـەم ڕەچـاوکردنە زیـانی دەگەیانـد، بـە بەرژەوەندییـە

(ضـروري) بيـەكانو، هـەروەها ڕەچـاوی (ضـروريات)تـيش، ناكرێـت، ئەگـەر ئـەم ڕەچاوكراوەيان بايەخی كەمتر بوو، لە جۆرێكی تری (ضروريات) كە بايەخی زياتری هـەبوو، و ئەگـەر ئـەم ڕەچـاوكردنە زيـانی دەگەيانـد، بـەوەيان كەبايـەخی زيـاترە كەواتە ڕەچاوی ئەوەيان دەكرێت، كە بايەخی زياترە بۆيە جيهادنـەكردن، و درێغـی كـردن تيايـدا دروسـت نييـە لەبـەر ترسـنۆكیو، گيـان خۆشەويسـتی چـونكە ئـەم دانيشتنەو جيهادنەكردنە هۆكارە بۆ لەناو بردنـی كـارێكی پێويسـت، كـە پاراسـتنی ئايينو، لادانی دوژمن كاریو پاراستنی (دار الأسـلام)، و ئـەم كارانـەيش (ضـروري) تـرن، لـە پاراسـتنی گيـان، هـەر چـەندە هـەر دووكيـان پێويسـتين، بـەلام لێـرەدا پاراسـتنی ئـايين پێويسـت تـرەو، هـەروەها خواردنـەوەی ئـارەق حـەلا لْكـراوەو، تەنانەت دروست نييە، كە خۆمانی لێ لا بدەين، ئەگەر خواردنەوەی هۆكـار بـوو، بـۆ پاراستنی گيان لە تيا چوون، چونكە لێرەدا پاراستنی گيان گرنگترەو، لە پێشترە لە پاراستنی عەقلْ.

٣٦٧- ئـەو ميتـۆد، و ياسـاو ڕێسـايانەی كـە لەسـەر بنـەمای ئـەم بەرژەوەندييانە بنيات نراون:

لەسـەر بنـەمای ڕەچـاوكردنی بەرژەوەندييـە (ضـروري)و (حاجيـات)و (تحيسنيات)ـەكان، كۆمەلێك ميتۆدو ياسای گشتی بەرهەم هاتوون كەشـەرعزانەكان لەسەر بنەمای ئەو بەرژەوەنديانە دەريان هێنـاونو، لـقو چـلْو پـۆپی زۆريـان لـەم بابەتە كردۆتەوە، ئەمەی لای خوارەوەيش چـەند نموونەيـەكن، لـەو ميتـۆدو ياسـاو ڕێسا گشتييانە:

١- (الضرار يُزال)، زيان لا دەچێتو لا دەبرێت.

لە نموونەی ئەو لقانەی كـە لەسـەر بنـەمای ئـەم ئەسـلە بـەرپاكراونو، لێـی جيـا بوونەتەوە، وەك چەسپاندنی مافی دراوسێيەتی (شـفعة) بـۆ ئـەو كەسـەی كـە ئـەم

مافەی پێ دەبڕدرێت‌و، هەروەها پێویستی بژاردنی ئەو شتەی کە کەسێك لە ناوی دەبات، یان خراپی دەکات‌و، مافی پەشیمان بوونەوە لە مامەڵەیەکدا، کە شتەکەی فرۆشیار کەم‌و کورتی تیادا بێت‌و، هەروەها کار کردن بە ڕێ‌و شوێنی خۆ پاراستنە پزیشکییەکان، لەڕۆژانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی‌و پەتا درمەکانداو هتد...

٢- (يُدفع الضرار العام بتحمل الضرار الخاص)، بە گرتنەبەرو کردنی ئەو زیانەی ڕووبەڕووی تاك دەبێتەوە، ڕێگا دەگیرێت، لە زیانی گشتی:

لە لق‌و چڵەکانی ئەم یاسابنەماییە وەك، تۆڵە سەندنەوە لە بکوژو بڕینی دەستی دزو ڕووخاندنی دیواری لارو خوار لە پەناو سەر ڕێگاکانداو، ڕێگەنەدان بە کار کردنی پزیشکی نەزان‌و دادوەرو موفتی گەندەڵ‌و خراپ‌و دەردنەخواردوو،و نرخ دانان لە سەر کاڵاکان، لە کاتی پێویستیداو، هتد...

٣- (يدفع أشد الضررين بتحمل أخفهما)، لە کاتی بوونی دوو کاری زیاناویدا پێکەوە ئەوا کامەیان زیانەکەی کەمترە ئەوەیان هەڵدەبژێرین‌و ئەنجامی دەدەین:

لە لق‌و چڵەکانی ئەم ڕێسایە وەك تەڵاقدانی ژن، لەکاتی ترسان لەزیانگەیاندن پێی‌و، یان لە ترسی نەتوانینی جێ بەجێ کردنی پێداویستییەکانی، و یان لەبەر ئەوەی کە پیاوەکە لەوێ نەبوو، کەوتبووە تاراوگەو، دابڕابوو، هەروەها دروستی کردنی نوێژ بەپێی پاك‌و خاوێنی تەواو، ئەگەر بۆی نەدەگونجا تەواو پاك‌و خاوێن بێت‌و، یاخود بەبێ داپۆشینی شەرمگا، ئەگەر بۆی نەکرابوو، کە بە تەواوی دای بپۆشێت‌و، هتد...

٤- (درء المفاسد أولى من جلب المصالح) لادانی خراپە باشترو لە پێشترە، لە فەراهەمکردنی چاکە:

لە لق‌و چڵەکانی ئەم یاسایە وەك، ڕێگرتن لە کەسی خاوەن سامان، لە سامانەکەیدا ئەگەر ئەو کەسە بەشێوەیەکی وا ئەو سامانەی بەکار دەهێنا، کە

زیانی بە خەڵکی تر دەگەیاندو، هەروەها ڕێگرتن لە ناردنەوەی هەندێ لەو کالاَیانەی کە خەڵکی لەناو خۆی وولاَتو ئەو جێگایەدا پێویستیان پێی هەبوو، هەرچەندە هەندێ قازانج لەکیسی هەندێ کەس دەچوو، بەلاَم لەبەر ئەوەی کە خەڵکەکە خۆی پێویستییەتی، هەر دەبێت ڕێگری لێ بکرێت.

٥- (الضرورات تبیح المحظورات)، ئەو شتانەی کە پێویستن، جاری وا هەیە، کە دەبنە هۆکاری حەلاَڵکردنی تەنانەت شتە حەرامەکانیش:

لە لەو چڵو دەرهاویشتەکانی ئەم بابەتە، وەك بەکار هێنانو خواردنو خواردنەوەی شتە حەرامەکان لە کاتی پێویستیداو، سنورردانان بۆ هەندێ لە شتە حەلاَڵەکان.

٦- (الضرورات تقدر بقدرها) شتە پێویستیەکان بەپێی ئاستی ئەو پێویست بوونەیان ڕەچاو دەکرێن، و حیسابیان بۆ دەکرێت:

لە لقو چڵەکانی ئەم بابەتە وەك، نەخواردنی شتی حەرام لە کاتی پێویستیدا، و زیاد لە ئاستی ئەو پێویستی بوونە، و واتە دەبێت چەند پێویستی کرد بۆ تێپەڕاندنی کارەکەت، ئەوەندە لەو حەرامە بخۆیت، یان بەکار بهێنیتو، بۆیە هەر شتێك بەهۆی پاساوو بیانووەوە حەلاَڵ بووبێت بە تێپەڕاندنو لاچوونی ئەو پاساوە، ئیتر حەلاَڵییەکەی نامێنێتو، حەرام دەبێتەوە.

٧- (ألمشقة تجلب التیسیر)، سەختی دەبێتە هۆکار بۆ ئەوەی، کە مرۆڤ پەنا بباتە بەر ئاسانکارییەکانو، ئەو قورسو سەختییە لەخۆی دوور بخاتەوە:

لە لقو چڵەکانی ئەم بابەتە، وەك دانانی دەرفەت (ڕوخصەتەکان) لە شەرعداو، توانینی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرایەتی ئەگەر ژنەکە بینی، پیاوەکەی کەمو کوڕی هەیە، و پێش ئەو گرێبەستە پێی نەزانیبووو، هەروەها دروستی قەرزەکردنو ناردنی دراوەکانو سانسۆر لەسەر دانان بەپێی شەرع.

٨- (ألحرج مرفوع) شتە سەختو دژوارەکان لە شەرعدا لادراونو کاریان پێ ناکرێت:

لە لقو چڵەکانی ئەم بابەتە، وەك وەرگرتنی شایەتیدانی ژنان، ئەگەر لەو پرسەدا پیاوان ئاگادار نەبوونو، هەروەها کار کردن بە لای زۆرینەی گومانی مرۆڤ، بە بێ ئەوەی دڵنیایی تەواوی هەبێت لە پرسی شایەتیداناو، بە مەبەستی وەرگرتنی ئەو شایەتییە.

٩- (لا يجوز إرتكاب ما يشق على النفس)، کردنی ئەو کارانەی کە بە کێرڤێکی بەرز سەختیو دژوارییان تیادایە، دروست نییە، کە ئەنجام بدرێن:

لە لقو چڵەکانی ئەم بابەتەیش وەك ڕێگرتن لە شەو نوێژ کردن لە تەواوی شەودا، واتە: هەمووی شەو خەریکی شەو نوێژ بێت، کە کارێکی سەختە، شەرع ڕێگری لێکردووەو، یاخود بەڕۆژوو بوون بە بەردەوامیو، خەڵوەتگیریو دوورەپەرێزی (الرّهبانية) بە ئەنجام نەدانی پرۆسەی هاوسەرگیری.

## (( بەشی سێیەم ))

# دژایەتی نێوان بەڵگەکان و، پێشخستنی بەڵگەیەکیان بەسەر ئەوی تریاندا و، سڕینەوە

## (( تعارض الأدلة، والترجيح والنسخ ))

٣٦٨- ڕێخۆشکردن:

مانای دژایەتی لە نێوان بەڵگە شەرعییەکاندا، لە بابەتەکانی زانستی ئوصوڵی فیقهدا بریتییە لە ناڕێکی نێوان ئەو بەڵگانەو، پێکەوە نەگونجانیان، بۆ نموونە کە بەڵگەیەکی شەرعی حوکمێکی دیاریکراو دەربخات، لە پرسێکی دیاریکراوداو، لە هەمان کاتدا بەڵگەیەکی تر لە هەمان پرسدا حوکمێکی تر داوا بکات و، دەربخات.

کەواتە: ناڕێکی و دژایەتی (التعارض)، بەم مانایە بێت، ڕوودانی لە ناوبەڵگەشەرعییەکاندا بەڕاستی و لە واقیعدا و بەکردەیی ڕوونادات، چونکە بەڵگەکان لە شەریعەتدا، بۆ گەیاندنی حوکمەکان و دەلالەت کردن لەسەر ئەو حوکمانە دانراون و، بەم پێیە بێت، کار کردن بە داواکاری ئەو حوکمانە شتێکی گونجاوو، دێتەدی و هەروەها مەرجی ئەرك لەسەر شان بوونیش (الشرط التكليف) دێتەدی، واتە بوونی زانست بەو حوکمانە، بە شێوەیەکی ژیرانەو دەبێت گەیشتبێتە ئاستی بالغ بوون و، ژیری، کەواتە: شتێکی نەگونجاوە، کە بەڵگەکان دژی یەکتری بن و بتوانین لە مەبەستەکانی تێ بگەین، چونکە دژایەتی (التعارض)، واتە: ناڕێکی (التناقض)، و بێ ئاگایی لە ئەحکامەکان و، نادیاریی مەبەستەکان، و فەوتانی مەرجەکانی ئەرك لەسەر شان بوون، (التكليف)، سەرجەم ئەمانە هەموویش لە شەریعەتی ئیسلامیدا دروست نین، و کاری لەم شێوازەیش لە خوای پەروەردگارو کار بەجێوە دوورە.

جا سەرەڕای ئەوەی کە ڕوودانی دژایەتی (التعارض) لە جیهانی واقیعدا کارێکی مەحاڵە، بەڵام سەبارەت بە تێڕوانینی موجتەهیدەکان دژایەتی نێوان بەڵگەکان کارێکی مەحاڵ نییە، چونکە جاری وا هەیە، کە بەهۆی کەمو کورتی لە تێنەگەیشتنی کابرای موجتەهیدداو، لاوازی هەستکردنەکەیو، کۆنترۆڵ نەکردنی سەرجەمی بەڵگەکانی ئەو بابەتەو، ڕەهەندە جیاوازەکانی، وا لە هزری هەندێ لەو موجتەهیدە دەکات، کە وا گومان ببەن، کە دژایەتی لە نێوان هەندێ لەو بەڵگانەدا هەیە، کە لەگەڵ بوونی ئەمەیشدا، لەم کاتەدا دژایەتییەکە ڕوکەشی (ظاهري) دەبێت، نەوەك حەقیقیو، ڕاستەقینەییو، لە ناواخندا، جا زانایانی زانستی ئوصولی فیقه، بۆ لادانی ئەم دژایەتییە ڕووکەشییە، لە دەقەکانو لە نێوان بەڵگەکاندا، کۆمەڵێك یاساو ڕێسای بنەماییان داناوەو، لە وێنەی ئەم ڕێسایانە وەك زانینی یاساکانی سڕیارو سڕاوە، (الناسخ والمنسوخ)و، ڕێگاکانی پێشخستنی هەندێك لە دەلالەت کردنی لەفزەکان بەسەر هەندێکی تریانداو، ڕێگاکانی تری بەلاداخستن (الترجيح)،و لادانی دژایەتی (إزالة التعارض)، کە لەم بەشەدا باسی لێوە دەکەین.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەم بەشە بۆ دوو (بەشە باس)دابەش دەکەین:

- بەشە باسی یەکەم: بۆ قسەکردنە لەسەر سڕینەوە (النسخ) بەتایبەتیو، ڕوونکردنەوەی ماناکەیو، جێگای ڕوودانیو، کاتی ڕوودانیو ئەو پرسانەی پەیوەستن پێیەوە.

- بەشە باسی دووەم: بۆ قسەکردنە لەسەر یاساو ڕێسا بنەماییەکانی پێشخستنو بەلاداخستن (الترجيح)و، لادانی دژایەتیو ناکۆکی نێوان بەڵگەکانو دەقەکان.

# ((بەشە باسی یەکەم))

## ((باسی سڕینەوە: النسخ))

٣٦٩- (النسخ) لە زمانی عەرەبیدا، بەمانای لابردن و لادانو گواستنەوە دێت.

پاشان لە زاراوەی زانایانی زانستی ئوصولی فیقهدا، بریتییە لە لادانی هەر حوکمێکی شەرعی، بە بەڵگەیەکی شەرعیی کە لە دوای حوکمی یەکەمەوە هاتبێتو، ئەم بەڵگەو حوکمی دووەمەیش بەسڕیار (الناسخ)، و حوکمی یەکەمیش بە سڕاوە (المنسوخ) ناوزەد دەکرێت، و ئەم پرۆسەی لا دانەیش بە سڕینەوە (النسخ) ناونراوە.

بێگومان سڕینەوە لە قورئانی پیرۆزدا ڕوویداوە، لە ڕوونترینو دیارو ئاشکراترینی ڕوودانی نەسخ لە قورئاندا، کە کەس نکۆڵی تیادا ناکات، بریتییە لە سڕینەوەو لادانی ڕووکردنە قودس (بیت المقدس) لە نوێژدا، بە ڕوونکردنە کەعبەی پیرۆز وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾[1] واتە: واتە: بێگومان بینیمانی پێغەمبەر (ﷺ) کە بەرەو ئاسمان چاودەگێڕی، و دەڕوانییو پێت خۆشە ڕووبکەیتە کەعبە، جێگەی ئیبراهیم پەیامبەر، (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەسا دڵنیابە، ئێمە لە نوێژەکاندا ڕووت بەرەو ڕووگەیەك وەر دەگێڕین، کە خۆت پێت خۆشە، واتە: (مەسجیدو لحەرام)، جا تۆیش ڕووت بەرەو (مسجد الحرام) وەر گێڕە، و ئێوەیش ئەی ئیمانداران، لە هەرکوێ بوون، دەبێ ڕووبکەنە لای مەسجیدولحەرامەوە.

---

[1] البقرة: (١٤٤).

جا نەسخ جاری وا هەیە، کە گشتییەو، سەراپای ئەو شتە دەگرێتەوە کە باسی کردووە، واتە سەرجەمی حوکمە یەکەمینەکە دەگرێتەوەو قاوی دەداتو دەیسڕێتەوە، هەر وەك لە وەرگێڕانی ڕووگەدا ڕوویدا، لە (بيت المقدس)ەوە، بۆ (مسجد الحرام)و، جاری وا هەیە، کە نەسخەکە تایبەتەو بەشێك لەو شتە دەگرێتەوە کە باسی کردووە، واتە: ئەو حوکمە یەکەمینە لا دەدات، بەڵام هەمووی نا... بەڵکو هەندێ لەو تاکانە دەگرێتەوە کە حوکمەکە بەسەریاندا جێ بەجێ دەبێتو، نموونەیش وەك ئەم ئایەتەی پەروەردگار کە سەبارەت بە بوختان کردن (قذف) دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا﴾[1] کە حوکمی ئەم ئایەتە لەلای حەنەفییەکان، بەو ئایەتە نەسخ کراوەتەوە، کە سەبارەت بە بوختانکردنی پیاوان بۆ ژنەکانی خۆیان دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾[2] ئەو کەسانەی کە تۆمەتی زیناو داوێن پیسی دەدەنە پاڵ هاوسەرانیانو، لە هەمان کاتدا، جگە لە خۆیان شایەتی تریان نییە، کە شایەتییان بۆ بدەن، کە ئەو ژنە زینای کردووە، چونکە چوار شایەت پێویستە بۆ چەسپاندنی زینا، جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەی سزای بوختانی لە کۆڵ بکەوێت، ئەگەر شایەتی نەبوو، ئەبێ هەریەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بەناوی خواوە شایەتی بداتو، سوێند بخوات بەخواو، بڵێت، من لە ڕاستگۆیانم کە ئەڵێم ئەم ژنەم زینای کردووەو، بەچاوی خۆم تاوانەکەیم بینیوە!

---

[1] النور: (٤).

[2] النور: (٦).

کەواتە: حوکمی پیاوەکە ئەوەیە کە هەر کات بوختانی خەراپە کاری بۆ ژنەکەی خۆی کردو، بەڵگەی پێ نەبوو، دەبێت پرۆسەی (ملاعنة) نەفرەتکاری ئەنجام بدات، واتە: لەبەردەم قازیدا سوێند بخوات، چوار جار بەزاتی پەروەردگار کە لە ڕاستگۆیانە، لەو گوتەیەدا کە زینای داوەتە پاڵ هاوسەرەکەی‌و لە پێنجەم جاردا سوێند بخوات، کە نەفرەت‌و لەعنەتی خوای لەسەر بێت، ئەگەر درۆ بکات‌و بوختانی کردبێت‌و، دواتر ژنەکەیش چوارجار سوێند بە خوا بخوات، کە مێردەکەی درۆ دەکات، لەو تۆمەتی داوێن پیسییەدا کە داویەتییە پاڵی، و لە پێنجەم جاردا بڵێت، غەزەب‌و خەشم‌و توڕەیی خوای پەروەردگارم لەسەر بێت، ئەگەر مێردەکەم ڕاست بکات، لەم تۆمەتەیدا کە بۆی کردووم، جا کە ئەم پرۆسەی نەفرەتکاری (ملاعنة)یە کۆتایی هات، ئیتر قازی لە یەکتریان جودا دەکاتەوە.

٣٧٠- هونەرو حیکمەتی سڕینەوە ((النسخ))

هەروەك گوتمان نەسخ بە واقعی لە شەریعەتدا ڕوویداوەو، حیکمەتیش لە نەسخ بریتییە لە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی بەندەکان، چونکە مەبەستی سەرەکی لەبەشەرع کردنی ئەحکامەکان، ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی مرۆڤەکانە، هەر وەك پێشتریش ڕوونمان کردەوە، جا کە دیترا کە بەرژەوەندی وا دەخوازێت، لەسەر دەمێکدا، کە فلانە حوکم بگۆڕدرێت، ئەوا ئەو گۆڕانەو ئامانجی بەشەرع کردنی حوکمەکە کۆك و تەبا دەبن، هەروەك چۆن کە نەسخ کۆك‌و هاوئاهەنگە لە گەڵ ئەو بنەمایەی کە لە شەریعەتدا دانی پیانراوە، بریتییە لە پلەبەندی (التدرّج) لە بەشەرع کردن‌و دانانی حومکەکانـدا، ئەمەیش وەك ڕەچاوکردنێکی بەرژەوەندییەکانی بەندەکان، نموونەیش لەم بارەیەوە وەك ئەوەی کە نوێژ لە سەرەتادا دوو ڕکات بوو، کە دانرابوو لە بەیانیان‌و دووڕکات لە ئێوارانداو، دواتر کرانە پێنج نوێژ لەو

پێنج کاتەیدا کە ئێستا هەیەو، بەو ڕکاتانەی کە دەیانزانین، دوای ئەوەی کە دەروونی مرۆڤەکان لەسەری ڕاهاتن‌و پێی دڵنیا بوویەوە.

٣٧١- سڕینەوەی (النسخ)و، تایبەت کردن (التخصیص):

جاری وا هەیە، کە نەسخ بە شێوەی تایبەتی‌و لا بەلایی لە گەڵ تایبەت کردن (التخصیص)دا، تێکەڵ دەبێت‌و هاوشێوەیی لە نێوانیاندا دروست دەبێت، چونکە تایبەت کردنی شتی گشتی (عام) پرۆسەیەکە بۆ لادانی ئەو حوکمە لەسەر هەندێ لە تاکە پێکهێنەرەکانی‌و، حوکمەکە کورت دەکاتەوە لەسەر ئەوانی تر کە ماونەتەوە، و تایبەت کردنەکە نەیگرتونەتە خۆی‌و، هەر بەم شێوازەیش نەسخ کردنەوەی تایبەت (جزئي) یاخود لاوەکی حوکمە گشتییەکە لە هەندێ لەو تاکانە لا دەدات‌و، حوکمەکە کورت دەکاتەوە لەسەر پاشماوەکەو ئەو هێندەی کە ماوەتەوەو، سەرەڕای ئەمەیش هەر جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، کە ئەویش ئەوەیە کە لە حاڵەتی نەسخدا لە سەرەتادا حوکمەکە سەر جەمی تاکەکانی گرتۆتەوەو، دواتر سەبارەت بە هەندێ لەو تاکانە بە بەڵگەی سڕیار (ناسخ)ـەکە، حوکمەکەی لاداوە، و حوکمەکە لەسەر ئەوانی تریان ماوەتەوە، بەڵام لە حاڵەتی تایبەت کردن (تەخصیص)دا، حوکمە گشتییەکە لە سەرەتادا پەیوەندی هەیە، بە هەندێ لە تاکە پێکهێنەرەکانییەوە، بەو مانایەی کە ئامڕازی تایبەت کردنەکە (المُخَصِّص) ئەوەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە، کە مەبەستی شەرع لە گشتی بوون (عام)، لە سەرەتای کارەکەدا بریتی نەبووە لە گرتنەوەی حوکمەکە بۆ سەرجەمی تاکەکانی (عام)ـەکە، بەڵکو حوکمەکە هەندێکیانی گرتۆتەوە، بۆیە لە تایبەتکار (المُخَصِّص)ـەکەدا، ئەوە بەمەرج گیراوە، کە دەبێت هاوشانی (عام)ەکە بێت‌و، یاخود بە لایەنی کەمەوە پێش کارپێکردنی هاتبێت، بە پێچەوانەی نەسخی تایبەت‌و لابەلایی (جزئی)، کە تیایدا بە مەرج گیراوە، کە دەبێت لە دوای کاتی کارپێکردنییەوە هاتبێت.

## ٣٧٢- جۆرەکانی نەسخ:

جاری وا هەیە، کە ڕاستەو خۆو ڕاشکاوانەیە، بە جۆرێك کە شەرع بەڕاشکاویو بەدەق نەسخەکەی دەربڕیوەو، نموونەیش وەك، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت:(كُنْتُ قَدْ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، ألا فَزُورُوهَا، فَأَنَّها تذكركم الأخرة)، واتە: پێشتر ڕێگریم لێکردبوون لەوەی کە سەردانی گۆڕستان بکەن، بەڵام لەمەودوا بچنو سەردانی ئەو شاری خامۆشانە بکەن، چونکە ئەم سەردانیکردنە دواڕۆژتان بیر دەخاتەوە.

جاری وا هەیە، کە نەسخ ناڕاشکاو (ضمني)یە، بەو مانایەی کە شەرع بە ڕاشکاویو بەدەق نەسخەکەی دەرنەبڕیوەو، بەڵام حوکمێکی داناوە، کە پێچەوانەی حوکمی پێشوویە، بەبێ ئەوەی کە دەقێکی ڕاشکاوانە هەبێت، لەسەر نەسخ کردنەوەی حوکمی یەکەم، و نەیشگونجێت، کە پێکەوە کۆیان بکاتەوە، و دواجار حوکمەکە لە دواترەوە هاتووە کە، بە شێوەیەکی ناڕاشکاوانە دەبێتە نەسخ کەرەوەی حوکمی پێشوو.

نموونەی نەسخی ناڕاشکاو (ضمني)، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزەی کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾[1] کە ئەم ئایەتە پیرۆزە مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە عیددەی ژنی مێرد مردوو، دەبێت ساڵێکی تەواو دابنیشێتو، ئەم حوکمەیش لە سەرەتای ئیسلامدا وابووەو، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾[2] و ئەم ئایەتە پیرۆزەیش دەلالەت

---

[1] البقرة: (٢٤٠).

[2] البقرة: (٢٣٤).

لەسەر ئەوە دەکات، کە ماوەی عیددەی ژنی مێرد مردوو، بریتییە لە چوار مانگو دە ڕۆژ، کەواتە بە ناڕاشکاوانە (ضمني) دەبێتە نەسخکەرەوەی حوکمی ئایەتی یەکەم، چونکە لە دوای ئەوەوە هاتووەتە خوارەوە.

٢٧٢- کاتی نەسخو، ئەو حوکمانەی کە دروستە نەسخ بکرێنەوە:

سەبارەت بە کاتی نەسخ، دەبێت تەنها لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕوویدابێت، و بۆیە نەسخ لە دوای کۆچی دوایی ئەوزاتە دروست نییەو نابێت، چونکە نەسخ بەهۆی سروش (وەحی) ییەوە دەبێتو، لە دوای نەمانی پێغەمبەر (ﷺ) وەحی بێگومان نامێنێتو، هەروەها لەبەر ئەوەی کە دەبێت، نەسخ کەرەوەکە لە ڕووی هێزەوە لە ئاستی نەسخ کراوەکە (منسوخ)ـەکەدا، بێت، هەر وەك دواتر باسی دەکەین، و هیچ شتێکیش جگە لە خودی وەحی لە ئاستی بەهێزی وەحیدا نییەو، بێگومان لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) وەحی پچڕاوەو، لەسەر ئەم بنەمایە بە هیچ شێوەیەك دروست نییە، کە لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەسخی هیچ شتێك لە ئەحکامەکانی شەریعەت ڕووبدات!

بەڵام ئەو ئەحکامانەی کە دروستە نەسخ بکرێنەوە، ئەو ئەحکامە لاوەکیو تایبەتانەن کە جێگۆڕکێو گۆڕانکاری قەبوڵ دەکەن، بەڵام ئەحکامەکانی تر نەسخ کردنەوەیان دروست نییە، وەك ئەحکامە ئەسڵییەکانی وەك حوکمەکانی بیروباوەڕ (عقائـد)، وەك باوەڕ بوون بە خواو ڕۆژی دواییو لێپرسینەوەو، هەروەها وەك حەرامی هاوەڵ بۆ خودا بڕیار دانو ستەمکارییو داوێن پیسیو، وەك خەسڵەتە زۆر جوانەکانو، ڕەوشتە مەزنەکانی وەك دادپەروەرییو ڕاستگۆییو چاکە کردن لەگەڵ دایكو باوکدا، کە ئەم حوکم گەلە ناکرێت، وا بزانرێت، کە لە کاتێکدا، یان حاڵەتێکدا، یان ڕەوشێکدا، و لەسەر شێوازێك دەبنو ڕوودەدەن، کە جێگۆڕکێ، یان گۆڕان بخوازن، کە ئەم ڕەوش گەلە، چەسپان، ئیتر ڕەوش، و حاڵەتو کاتەکان

به هەر جۆرێك بگۆڕێن، چونیەکە، و هەروەها ئەو حوکمە تایبەتانەی و لاوەکییانەی کە مۆرکی هەمیشەییان پێوە لکاوە ، و نەسخکردنەوەیان دروست نییە، وەك ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: (والجهاد ماضٍ إلى يوم القيامة ) جیهادو تێکۆشان لە ڕێگای خودادا تا ڕۆژی ڕەستاخێز بەردەوامە.

٢٧٤- ئەو ئامرازانەی کە دروستە پرۆسەی نەسخیان پێ ئەنجام بدرێت:

یاساو ڕێسای بنەڕەتی لە نەسخدا، بریتییە لەوەی کە بەڵگەی نەسخکار (الناسخ) دەبێت، لە ئاستی بەهێزی بەڵگەی شتە نەسخکراوەکە (منسوخ)ـەکەدا، بێت و یاخود لەو بەهێزتر بێت و، دەبێت لە دوایەوە هاتبێت، نەوەك لە پێشییەوە، لەسەر بنەمای ئەم یاساو ڕێسایە، چەندەها یاساو ڕێسای تری لێ بوونەتەوەو، چەندەها دەرەنجامی لێ کەوتوتەنەوە، لەوانە:

یەکەم: دروستە کە دەقەکانی قورئانی پیرۆز هەندێکیان بەهۆی هەندێکی تریانەوە نەسخ بکرێنەوە چونکە لە ڕووی بەهێزییەوە لە یەك پلەو ئاستدان.

دووەم: دروستە کە قورئانی ئیرۆز بە هۆی سوننەتی موتەواتیرەوە نەسخ بکرێت و، هەروەها بە پێچەوانەیشەوە، چونکە ئەوەی کە لە سوننەتدا هەیەو، موتەواتیرە وەك قورئان وایە، لەو ڕوانگەیەوە کە بەیەکلایی و دڵنیانیی جێگیر بووەو، چەسپاوە، واتە: (قطعية الثبوت)ەو، هەروەها ئەم سوننەتە موتەواتیرەیش وەك قورئانی پیرۆز لە هەمان سەرچاوەوە، کە سروش (وەحی)یە، سەرچاوەی گرتووە، و هاتووە.

سێیەم: دروستە کە سوننەتی (ئاحاد) بەهۆی سوننەتی ئاحادی ترەوە، نەسخ بکرێتەوە، یاخود بە سوننەتێکی لە خۆی بەهێزتر لە پلەو ئاستدا.

چوارەم: ئیجماع ناتوانێت ببێتە نەسخکەرەوەی دەقی قورئان، یاخود سوننەت، چونکە دەق کە (قطعي الدلالة) بووە، واتە: لە ڕووی دەلالەت کردنەوە ڕاستەوخۆ

یەکلایی بوو، و گومانی هەڵنەدەگرت، ئیتر قەدەغەیە کە ئیجماع لەسەر پێچەوانەکەی بنیات بنرێت‌و، ئەگەر دەقەکە فرەمانا (ظني الدلالة) بوو، و ئیجماع ساز کرابوو، لەسەر پێچەوانەی ئەو مانایەی کە دەیدات بە دەستەوە ئەمە مانای ئەوەیە کە بەڵگەیەکی تر بوونی هەیە، کە ئەو بەڵگەیە (لە پێشتر: راجح)ترە، لە دیدی ئەو شەرعزانانەی کە ئیجماعیان کردووە، لەسەر ئەو دەقە دەلالەت تەمومژ ئامێزە، واتە: (ظني الدلالة)یە، ئیتر ئەو بەڵگەیەی کە ئیجماعەکەی لەسەر بنیات نراوە دەبێتە نەسخکەرەوە (الناسخ)، و نەوەك خودی ئیجماعەکە.

**پێنجەم:** هیچ دەقێکی قورئان‌و سوننەت نابنە نەسخکەرەوەی ئیجماع، چونکە نەسخکەرەوە دەبێت لە دوای نەسخکراوەکەوە بێت‌و، دەقەکانی قورئان‌و سوننەتیش لە پێش ئیجماعەوە هاتوون چونکە ئیجماع وەك بەڵگەیەکی شەرعی لە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ)وە بایەخی هەیەو، وەك بەڵگە سەیردەکرێت، هەر وەك پێشتریش باسمان کرد.

**شەشەم:** ئەو ئیجماعەی کە لەسەر بنەمای قورئانی پیرۆز، یان سوننەت‌و یان قیاس بنیات نراوە، ئەمە دروست نییە، کە بە هۆی ئیجماعێکی ترەوە نەسخ بکرێتەوە، بەڵام ئەو ئیجماعەی کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بنیات نراوە، ئەمەیان دروستە کە بەهۆی ئیجماعێکی ترەوە نەسخ بکرێتەوە، ئەگەر بەرژەوەندییەکە گۆڕدراو، بینرا کە هاتنەدی بەرژەوەندییەکە ئەمجارەیان بە ئیجماع کردن دەبوو، لەسەر حوکمێکی جیاتر!

**حەوتەم:** ناکرێت قیاس ببێتە نەسخکەرەوەی دەقی قورئان یاخود سوننەت‌و، یاخود ئیجماع‌و، هەروەها بەهۆی ئەمانەیشەوە هەر نەسخ ناکرێتەوە، چونکە قیاس کاتێك پەنادەبەینە بەری، کە ئەو حوکمە لە قورئان‌و سوننەت‌و ئیجماعدا بوونی نەبێت‌و، هەروەها لەبەر ئەوەی کە لەمەرجەکانی قیاسدا ئەوە هەیە، کە نابێت

پێچەوانەی هەر حوکمێك بێت، کە لەو سێ سەرچاوەیەدا جێگیر (ثابت) بووبێت، دەنا ئیتر بایەخی نییەو حیسابی بۆ ناکرێت.

هەشتەم: نابێت قیاس ببێتە نەسخکەرەوەی قیاسێکی تر ، چونکە قیاس لەسەر بنەمای ڕەئی، و ئیجتیهادکردن بنیات نراوە، و لە لای ئەو موجتەهیدەی کە بە ئیجتیهادکردنی خۆی بەو قیاسە گەیشتووە، بەڵگەیەو هەر وەك بەڵگە (حجة)یش، تەماشای دەکات، بەڵام سەبارەت بە موجتەهیدەکانی تر بۆ ئەوان بەڵگە نییە!

بەڵام ئەگەر دوو قیاس لەیەك موجتەهیدەوە سەرچاوەیان گرت، ئەوا دژایەتی لە نێوانیاندا جێگیرەو چەسپاوەو هەیە، بەڵام یەکێکیان نابێتە نەسخکەرەوەی ئەوی تریان، چونکە قیاس لەسەر بنەمای ڕەئیو ئیجتیهاد بنیات نراوەو، ڕەئیش بواری نەسخکردنەوەی ئەحکامەکانی نییەو، لەم حاڵەتەدا لەسەر کەسی موجتەهید پێویستە کە کارو توێژینەوە بکات، لەسەر پێشخستنی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریانداو، کار بەوەیان دەکرێت، کە لەدیدی ئەو موجتەهیدەدا پێشی خستووە بەسەر ئەوی تریاندا، هەر وەك لە پرسی (ئیستیحسان)دا، وایە کە پرسێك دوو قیاس بۆ خۆی ڕادەکێشێتو، موجتەهید یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا پێش دەخاتو، بەزۆری ئەوەیان زیاتر پێش دەخات، کە (قیاس الخفي)یە، چونکە عیللەتەکەی بە هێزترەو، زیاتر کاریگەری لەسەر حوکمەکە هەیەو، هەر ئەمەیشە بە (إستحسان) ناسراوە، هەر وەك پێشتریش ڕوونمان کردەوە.

## (( بەشی دووەم ))

## (( دژایەتی و بەلایەکداخستن: التَعارُض وَالتَّرجیح ))

٢٧٥- گوتمان، کە بەڵگە شەرعییەکان، هەرگیز دژی یەکتری ناوەستنەوەو، بەڵکو ئەوەی کە نارێکیو پێچەوانەگەری لە نێوانیاندا دروست دەکات، ئەوە لە تێڕوانینی جیا جیای موجتەهیدەکانەوە دروست دەبێتو، بۆیە ئەم دژایەتیو پێچەوانەگەرییە شتێکی ڕووکەشییەو، لەئاستی تێڕوانینی موجتەهیدەکەدا ڕوو دەداتو، دژایەتییەکی ڕاستەقینە نییە، و ئەم دژایەتیو پێچەوانەگەرییە ڕووکەشییە، مانای ئەوەیە کە هەریەکە لەو دوو بەڵگە پێچەوانەیە کە دژایەتی لە نێوانیاندا هەیە، لەیەك کاتدا داوای حوکمێکی دیاریکراو دەکەن، لە پێشهاتێکی دیاریکراودا، کە کابرای موجتەهید توێژینەوەو بەدوادا چوونی لەسەر دەکات، بۆ ناسینو زانینی حوکمەکەیو، ئەم دوو حوکمەیش دژنو پێچەوانەنو جیاوازن لە یەکتری!

جا سەبارەت بەڕوودانی ئەم دژایەتییە ڕووکەشییە ئەوە بەمەرج گیراوە کە دەبێت ئەو دوو بەڵگەیە لە هێزدا هاوئاست بن، وەك ئەوەی کە هەر دووکیان ئایەتی قورئانی پیرۆزبنو، یاخود دوو فەرموودەی ئاحاد بنو، لەم حاڵەتەدا کەسی موجتەهید توێژینەوەو بەدوادا چوون لەسەر مێژووی هاتنی هەردوو دەقەکە دەکات، ئەگەر مێژووی هەردووکیانی زانی، ئەوا حوکم دەدات کە دواییینەکەیان نەسخکەرەوەی پێشووەکەیانە، و نموونەی ئەمەیش وەك ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾[1] واتە: ئەو کەسانەی لە ئێوە لەسەرەمەرگدانو

[1] البقرة: (٢٤٠).

دەمرن‌و، ژنەکانیان دوای خۆیان بەجێ دێڵن، باپێش ئەوەی کە گیانیان دەربچێت ڕاسپێرن‌و وەسیەت بکەن، کە ژنەکانیان ئەگەر ویستیان تاماوەی ساڵێك دەرنەکرێن‌و، هەر لە جێی خۆیان بمێننەوەو، خەرجییان بدەن، هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗا﴾[1] واتە: ئەو پیاوانەی کە لێتان دەمرن‌و، ژنەکانیان بەجێ دێڵن، ئیتر لە گەڵیاندا جەوتبن، یان نا... ئەبێ ئەو ژنانە چوار مانگ‌و دەشەو چاوەڕوان بن.

کە ئایەتی یەکەم ئەوە دەگەیەنێت، کە عیددەی ئەو ژنەی کە مێردەکەی مردووە بریتییە لە ساڵێك‌و، ئەمەیش لە سەرەتای ئیسلامدا وابووە.

پاشان ئایەتی دووەم: ئەوە دەگەیەنێت، کە عیددەی ژنی مێرد مردوو بریتییە لە چوار مانگ‌و دەڕۆژو لەبەر ئەوەی کە ئەم ئایەتەیان دواتر هاتۆتە خوارەوە، بۆیە دەبێتە نەسخ کەرەوەی ئایەتی پێشوو، بۆیە حوکمی ئەمیان دەچەسپێنرێت.

هەروەها نموونەیەکی تر، لەم بارەیەوە، هەر وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە، کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗا﴾[2] و ئینجا لە جێگایەکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾[3] کە لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا، ئایەتی یەکەم دەلالەت

---

[1] البقرة: (٢٣٤).

[2] البقرة: (٢٣٤).

[3] الطلاق: (٤).

لەسەر ئەوە دەكات، كە عیددەی ژنی مێرد مردوو بریتییە لە چوار مانگو دەرۆژ، و هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان ژنی سكپڕ، و ژنـی ئاسـایی، و بـەڵام ئایـەتی دووەم، مانای ئەوە دەدات بە دەسـتەوە، كـە عیـددەی ئـەو ژنـە سـكپڕەی كـە مێردەكـەی مـردووە، بریتییـە لـە منداڵبوونەكـەو، بـە هاتنـەدی كۆرپەكـە عیددەكـەی لەسـەر لادەچێت، و پاشان هاوەڵی بەرزو بەڕێز، (عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود)، "خـوای لـێ ڕازی بێت"، ڕای وابووە، كـە ئایـەتی دووەم، لـە هاتنـەخوارەوەدا بـە دوای ئایـەتی یەكەمەوە هاتووە، و بۆیە سەبارەت بە ژنی سكپڕ دەبێتـە نەسـخكەرەوەی ئایـەتی یەكەمو، بۆیە عیددەی ژنی سكپڕ، بەدانانی سكەكەیەتی، ئـیتر چـونیەكە ماوەكـەی درێژ بێت، یان كورت!

٢٧٦- ئەگـەر مێـژووی هـاتنی ئـەو دوو دەقـە، كـە دژیو پێچـەوانەگەری لـە نێوانیانـدا هەیـە، نـەزانرا، ئـەوا كەسـی موجتەهیـد پەنادەباتـە بـەر پێشخسـتن (ترجیح)ـی، یـەكێك لـە دەقـەكان بەسـەر ئـەوی تریانـدا، بـە یـەكێك لـە ڕێگـاو ڕێبازەكانی تەرجیح، كە لەخوارەوە هاتوون:

یەكەم: (النص) پێش دەخرێت، بەسەر (الظاهر)دا: [1]

وەك ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە كـە لـە دوای ئـەوەی ئـەو ژنانـەی دیـاریكرد كـە هاوسەرایەتی كردن لە گەڵیاندا حەرامە، فـەرمووی: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ﴾ [2] واتە: جگە لەوانە ئیتر ئافرەتی تر هەموویان حەڵاڵن مارە بكرێن، كە ڕووكەشی ئـەم ئایەتە دەلالەت لەسەر ئەوە دەكـات، كـە تەنانـەت مـارەكردنی ژن لەچوار دانـەیش زیـاتر هـەر دروسـتە، لـەو ژنانـەی كـە دروسـتە مـارەبكرێن، بـەڵام ئـەم (ڕووكـەش:

---

[1] لەبەشی یەكەمی، بەشـە باسـی سێیەمدا پێشـتر ئـەوەمان گوزەرانـد، كـە لـەفزی دەلالـەت ڕوون (الواضح الدلالة) دەبێتە چوار بەشەوە كە بریتیین لە (الظاهر)و، (النص)، و (المفسر)و، (المحكم).

[2] النساء: (٢٤).

الظـاهر)ـــه، ئـهم ئايەتـه پێچـەوانەيەتی كـه دەفـەرموێت: ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾[1] واته: دەی ئەو ژنانه ماره بكەن كه پێتان دەشـێن، دووان – دووان، سيان – سييان، چوار – چوار ، واته هەريەكێكتان دەتـوانن، هـەتا چـوار ژن ماره بكەن، به مەرجی عەدالەتو توانـايی ژيانـدنيان! كـه ئـهم ئايەتـه دەقێكـه لەسـەر ئـەوەی كـه حەرامـه، مـارەكردنی ژن لـه چـوار دانـه زيـاتر، بۆيـه ئـهم دەق (نص)ـه، پێشدەخرێت (ترجيح) دەدرێـت، بەسـەر ڕووكەشـی (الظـاهر)ـــی، ئايەتـه يەكەمه پێشووەكەدا، و بۆيه مـارەكردنی ژن لـه چـوار دانـه زيـاتر كـارێكی ياسـاغو حەرامه.

– دووەم: (المُفَسّر) پێش دەخرێـت بەسـەر (الـنص)دا : نموونـەی ئەمەيشـيان وەك ئەم فەرمودەيە، كه پێغەمبەر (ﷺ) دەفـەرموێت: (المُستَحاضَـة تَتَوضـأ لِكُـلّ صَلاةٍ)، واته: ئەو ژنەی كه نەخۆشی خـوێنی بـێ نوێـژی هەيـه، و بـەردەوام لـه بـێ نوێژيدايه، دەبێت بۆ هەموو نوێژكردنێك دەسـتنوێژێك بگرێـت، كـه ئـهم فەرمودەيـه دەقه لەسەر ئەوەی كه ئافرەتێ بەردەوام له بـێ نوێژيـدا بێـت، دەبێـت بـۆ هـەموو نوێژكردنێك، هەرچەنده لەيەك كاتيشدا بێت، دەبێت دەسـتنوێژ بگرێتـەوە، چـونكه ئـەم مانايـه لـه فەرموودەكـه لـه هـزری مرۆڤـدا دەفامرێتـەوە، و هـەر ئـەوەيش لـه بنەڕەتدا مەبەستەكەيە، لەدەستەواژەی فەرمودەكه، بەڵام هـەر مانـای تـر (تأويـل) هەڵدەگرێت، و فەرموودەيـەكی تـری پێغەمبـەر (ﷺ) لـه گێڕانەوەيـەكی تـردا دژی ئەم گێڕانەوەيەی يەكەم هاتووه، كه دەفەرموێت: (المُستَحاضَة تَتَوضأ لِكُلّ صَلاةٍ)، واته: ئافرەتێ بەردەوام له بێ نوێژيدا، بێت، كه ئەمه نەخۆشييەكەو توشی هەنـدێ ئافرەت دەبێت، لەسەريەتی كه له كـاتی هـەموو نوێژێكدا دەسـتنوێژێك بگرێتـەوە،

---

[1] النساء: (٣).

واتە: لە کاتی نوێژێکدا تەنها یەك دەستنوێژی لەسەرە، هەر چەندە ئیتر لەوکاتەداو بەو تەنها دەستنوێژەوە چەندەها نوێژی تریش "لە نوێژی سوننەت" بکات، و ئەم مانایە ئیتر فرەمانایی (تأویل) هەڵناگرێت، و بۆیە بە (مُفَسّر) ناوزەد دەکرێت، و دواجار بەسەر گێڕانەوەی یەکەمدا، کە (نص)ـە، پێش دەخرێت، و کار بە ناواخنی ئەم دووەمینەیان دەکرێت.

– سێیەم: (مُحْکَم) پێش دەخرێت، بەسەر غەیری خۆیدا لە (الظاهِر)، و (نص)، و (مُفَسّر):

نموونەی ئەمەیشیان وەك ئەم ئایەتەی خوای پەروەدگار کە دەفەرموێت: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ﴾[1] کە ئەمە دەقێکە لەسەر دروستی مارەکردنی ئەو ژنانەی کە حەرام نییە مارە بکرێن و پێشتر باسی کردوون و، بەپێی ئەم گشتگیرییەی کە هەیەتی، ئەوەیش دەگرێتەوە، کە ژیانی هاوسەرایەتی، لە گەڵ خێزانەکانی پێغەمبەریشدا (ﷺ)دروست بکرێت، لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) بەلام ئایەتی:﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا﴾[2] ئایەتێکی کار پێکراوە کە ئەوە دەسەلمێنێت کە نابێت و حەرامە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای کۆچی دوایی ئەو زاتە مارە بکرێنەوە، بۆ هەر کەسێکی تر، بۆیە ئەم ئایەتە پێش دەخرێت، بەسەر دەقی ئایەتی یەکەمدا، و تەرجیح دەدرێت بەسەریداو، دواجار حوکمەکە وای لێ دێت، کە حەرامە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای وەفاتی ئەو ژیانی هاوسەرایەتییان لەگەڵدا پێك بهێنرێت، چونکە دایکانی ئیمانداران.

---

[1] النساء: (٢٤).

[2] الأحزاب: (٥٣).

- **چوارەم:** ئەو حوکمەی کە بە دەستەواژەی دەق (عبارة النص) چەسپاوە، پێش دەخرێت، بەسەر ئەو حوکمەیدا کە بە ئامازەی دەق (إشارة النص) چەسپاوە:

نموونەی ئەم بابەتەیش، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ﴾[1] و هەروەها ئایەتی: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا ﴾[2].

کە ئایەتی ئەکەم: بە ڕێگای دەستەواژە (عبارة) دەلالەت دەکات، لەسەر واجبی تۆڵەسەندنەوە لە بکوژو، ئایەتی دووەم: بە ڕێگای ئامازە (إشارة) دەلالەت دەکات لەسەر تۆڵە نەسەندنەوە لە بکوژی دەست ئەنقەست، چونکە تۆڵەو سزاکەیی بە مانەوەی هەتا هەتایی لە دۆزەخدا داناوەو، ئەم جۆرە سزایەش تایبەت کراوە بە کوشتنی دەست ئەنقەستەوەو، سزاکەیشی ڕوون کراوەتەوەو، ئەمەیش بەڕێگای ئامازە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە سزای تری لەسەر پێویست نییە، لەسەر بنەمای ئەو یاسا بنەڕەتییەی کە دەڵێت: (إن الأقتصار في مقام البيان، يفيد الحصر)، واتە: کورتکردنەوەو تایبەتکردنی هەر حوکمێك بە شتێکەوەو، لە جێگەیەکدا کە بۆ ڕوونکردنەوەو شرۆڤە کردن هاتبێت، ئەوە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە ئەو حوکمە تایبەتە بەو شتەوە!

بەڵام لێرەدا ماناو تێگەیشتنی دەقەکە، لایەنی (دەستەواژەیی: العِبارة)ی، پێش خراوە بەسەر لایەنی (ئامازەیی: الأِشارَة)دا، و بۆیە تۆڵە سەندنەوە، و کوشتنەوەی بکوژی دەست ئەنقەست واجبە.

---

[1] البقرة: (١٧٨).

[2] النساء: (٩٣).

پێنجەم: ئەو حوکمەی کە بە ئامـاژەی دەق (إشارة النص) جێگیر بووەو، چەسپاوە، پێش دەخرێت بەسەر ئەوەیاندا کە بەدەلالەتی دەق (دلالة النص) چەسپاوە:

نموونەی ئەمەیشیان وەك ئایەتی: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾[1] واتە: ئەوەی کە کەسێك بە هەڵە دەکوژێت، دەبێت بەندەیەکی موسوڵمان ئازاد بکات، هەروەها ئایەتی: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا﴾[2].

کە بە پێی ڕێ و ڕێبازی دەستەواژە (العبارة) لە دەقی یەکەم ئەوە دەفامرێتەوە، کە کەفارەت دان لەسەر بکوژی بەهەڵە کارێکی پێویستە، و هەروەها بە پێی ڕێگاو ڕێبازی دەلالەت کردن، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، کە دیسان کەفارەتیش لەسەر بکوژی دەست ئەنقەست هەر پێویستە، چونکە ئەم لە پێشترە لە بکوژی بە هەڵە لە دانی کەفارەتدا، کە واجب ببێت لە سەری، چونکە تاوانی کوشتنە کە هۆکارە بۆ دانی کەفارەتەکەو، بێگومان ئەم تاوانکردنە لە کوشتنی دەست ئەنقەسدا، توندو قێزەونترە، وەك لە کوشتنی بەهەڵەدا، بۆیە واجبی ئەو کەفارەتە لەسەر کابرای دەست ئەنقەست لە پێشترو زیاترە، وەك لەسەر واجبی ئەو کەفارەتە لەسەر کابرای بکوژی بەهەڵە.

هەروەها لە ئایەتی دووەم: لە ڕێگاو ڕێبازی ئاماژە (إشارة)، ئەوە دەفامرێتەوە، کە بکوژی بەهەڵە لە دنیادا کەفارەتی لەسەر نییە، چونکە ئایەتەکە سزاکەیی بە مانەوەی هەتا هەتایی لە دۆزەخدا کورتو تایبەتە کردۆتەوەو، ئەم کورتو تایبەت

---

[1] النساء: (٩٢).

[2] النساء: (٩٣).

کردنەوەیەش لە پێگەی ڕونکردنەوەی بابەتەکەدایە بۆیە هەر سزایەکی تری لە هەر جۆرێك بێت، لێ دوور دەخاتەوەو، ئەم مانایەی کە بە ئاماژە (إشارة) دەستمان کەوتووە، لە گەڵ ئەو مانایەی کە لە ئایەتی یەکەم بە پێی ڕێگا و ڕێبازی دەلالەت دەستمان کەوت، دژی یەکترن‌و، پێچەوانەن، بۆیە ئەو مانایەی کە لێوەی فامراوەتەوە، بە ئاماژە (إشارة)پێش دەخرێت، و ئەرجەحترە لەو مانایەی کە بەدەلالەت لەسەر بکۆڵی بەدەست ئەنقەست پێویست نییە.

- **شەشەم**: لە کاتی دژایەتی‌و پێچەوانەگەریدا، دەلالەتی دربڕدراو (دلالة المنطوق) پێش دەخرێت، بەسەر دەلالەتی پەنهان‌و ناڕاستەوخۆدا، (دلالة المفهوم):

- نموونەی ئەم بابەتەیش وەك ئەم ئایەتە پیرۆزەکە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً ﴾[1] واتە: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە، (سوو) چین لەسەر چین مەخۆن‌و وەری مەگرن، وەك سەردەمی نەفامی، بۆ نموونە (١٠٠) دیناریان دەدا بە (٣٠٠) دینار کە حەرامە، کە ئەگەر لەم ئایەتە پیرۆزەدا، دژەمانا (مَفْهُوْمُ المُخالَفَة) وەربگرین، ئەوا لەگەڵ ئەو ئایەتە پیرۆزەدا پێچەوانە دەبێتەوەکە دەفەرموێت:﴿وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾[2] واتە: جا ئەگەر دەست لە سوو خۆری هەڵگرن، و پەشیمان ببنەوە لێی، ئەوا سەرمایەکانی ماڵی خۆتان بە تەنهاو بێ سوو، بسەننەوە لە قەرزارەکان، ئیتر نەئێوە لە قەرزارەکان ستەم بکەن‌و، زیادەیان لێ وەر مەگرن‌و نەئەوان ستەم لە ئێوە بکەن‌و، کەمتان پێ بدەنەوە.

---

[1] آل عمران: (١٣٠).

[2] البقرة: (٢٧٩).

جا ئەم ئایەتە بەدەر بڕین (منطوق) مانای حەرامی سوو خواردن دەدات بەدەستەوە، کە هەر چەندە کەمیشە هەر پێش دەخرێت بەسەر یەکەمدا.

**٢٧٧- کۆکاریو کۆککردن، (الجَمْع وَالتَّوفیق):**

ئینجا دوای ئەم گێرەو کێشەی کە باسمان کرد، ئەگەر هەر نەمانتوانی نەسخکەرەوەکە (الناسخ) بدۆزینەوەو، بیناسینو، ئەو ڕێگاو ڕێچکەو ڕچەو ڕێبازانەی کە باسمان کرد بۆ (تەرجیح) کردنی یەکێکیان بەسەر یەکێکی تریاندا دەستمان نەکەوتنو، هەر وەك باسیشمان کرد، هەردوو دەقەکە لە هێزدا، لە یەك پلەدا بوونو، هاو ئاست بوون، ئەوا کەسی موجتەهید پەنا دەباتە کۆکاری (الجمع)و کۆککردنی نێوانیان (التوفیق)، لە نێوان ئەو دوو دەقە پێچەوانەو دژە یەکترەدا، و بۆیە بەڕێگایەك لە ڕێگاکانی (الجمع والتوفیق) پێکەوە کۆکیان دەکاتو ڕێکیان دەخاتو، کار بەهەردوو دەقەکە دەکاتو، نموونەی ئەم بابەتەیش وەك:

أ. خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ لِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ﴾[1] واتە: پێویست کراوە لەسەرتان، کاتێك یەکێکتان لەسەرەمەرگدا بوو، ئەگەر ماڵو سامانی لە پاش بەجێما، وەسیەت کردن بە باشی بۆ باوكو دایكو خزمانێك کە کەلەپوریان بەر نەکەوێت بەجوانیو ڕێكو پێکی، پێویست کراوە، لەسەر پارێزکاران.

ئینجا پەروەردگار لە جێگایەکی تردا دەفەرموێت: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ

---

[1] البقرة: (١٨٠).

وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾[1] واتـه: خـوداى مـەزن ئامۆژگاريتـان دەكات دەربارەى كەلەپورى ڕۆڵەكانتان، بۆ هەر نێرێك هەيە، لە ميراتـدا بـە وێنـەى بەشى دوومێ، خۆ ئەگەر منداڵە كانتان تەنها ئافرەت بـوون دووانو زيـاد لـە دووان، ئەوا بۆيان هەيە دووبەش لە سێ بەشى ئەوەى كـە مـردووە كـە بـەجێى هێشـتووە، بەڵام ئەگەر يەك ئافرەت بوو، ئەوە نيوەى ميراتەكەى بۆ هەيە، وە بۆ هـەر كـام لـە دايكو بـاوكى مردووەكـە شـەش يـەك هەيـە، لـەوەى كـە بـەجێى هێشـتووە، ئەگـەر مردووەكـە منـداڵى هـەبوو، بـەڵام ئەگـەر مردووەكـە منـداڵى نـەبووو، دايـكو بـاوكى ميراتگـرى بـوون، ئـەوە سـێيەك بـۆ دايكەكەيـەتى، بـەڵام ئەگـەر مردووەكـە چـەند برايەكى هەبوو ئەوا شەش يەك بۆ دايكەكەيـەتى لـەپاش دەركردنـى وەسـيەتێك كـە وەسيەتى پێ كرابێت، لەلايەن مردووەكـەوە، يـان دانـەوەى قـەرزێك كـە لـە سـەرى بێـت، جـا باوكـەكانتانو كوڕەكانتـان نـازانن كامـەيان بـە سـودترن بۆيـان و، ئـەو دابەشكردنە لە لايەن خواوە پێويست كراوە، بەڕاستى خودا هەميشە زاناى دانايە.

كە ئايەتى يەكەم وەسيەتى بۆ دايكو باوكو خزمان بە باشى پێويست كـردووەو، ئايەتى دووەم ئـەوە دەگەيـەنێت كـە خـواى مـەزن بەشـە كەلـەپورى دايـكو بـاوكو كوڕەكـانو خزمـانى ديـارى كـردووەو، ئـەم كـارەى بـەجێ نەهێشـتووە، بـۆ حـەزو ويستى كابراى مـيرات دەر تائـەو ديـارى بكـات، بـەڵكو خـوداى مـەزن خـۆى ديـارى كردووە.

---

[1] النساء: (١١).

جا ئەم دووئایەتە پیرۆزە دژی یەکترین، بەڵام دەکرێت، کە کۆککردن (التوفیق) لە نێوانیاندا بکەین، بەو جۆرەی کە ئایەتی یەکەم وا مانا بکەین، کە وەسیەت کردن بۆ دایکو باوکو ئەو خزمانەی کە بەهەر هۆکارێك بێت، لە هۆکارەکان وەك ئەوەی کە ئاینێکی تری هەبێت، کە لە پور نابەنو، ئایەتی دووەم، وا لێك بدەینەوە، کە بۆ ئەو میراتبەرانەیە کە لە ئایەتەکەدا باسکراون.

ب. خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾[1] و هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[2] جا هەندێ لە شەرعزانان بەلای ئەوەدا چوون، کە ئایەتی دووەم: نەسخی ئایەتی یەکەمی نەکردۆتەوە، سەبارەت بەو ژنە سکپڕەی کە مێردەکەی مردووەو، لەسەر ئەم بنەمایە شەرعزانەکان هاتوون، ئەم دوو ئایەتەیان پێکەوە کۆك کردووە، و فەرموویانە: ئەو ژنە سکپڕەی کە مێردەکەی مردووە، لەو دوو عیددە کورتو درێژەدا، دەبێت درێژخایەنەکەیان هەڵبژێرێت، بەو مانایەی ئەگەر سکەکەی دانا، لە پێش تەواوکردنی چوار مانگو دەڕۆژ بەسەرمردنی مێردەکەیدا، ئەوا عیددە چوار مانگو دەڕۆژییەکەی هەر دەبێت تەواو بکاتو، ئەگەر ئەو کاتە تەواو بووو، هەر منداڵی نەبوو، ئەوە هەر دەبێت بەردەوام بێت، لەسەر عیددەکەی خۆی تاکاتی منداڵبوونی.

٢٧٨- یەکێکی تر لە ڕێگاو ڕێبازەکانی کۆکاری وکۆککردن (الجمع و التوفیق) ئەگەر هاتوو یەکێك لەو دەقانە (عام) بوو، و ئەوی تریان (خاص) بوو، و یاخود یەکێکیان (مطلق) بوو، و ئەوی تریان (مُقَیَّد) بوو، بریتییە لە تایبەتکردنی

---

[1] البقرة: (٢٣٤).

[2] الطلاق: (٤).

(عام)ـەکە، بە هۆی (خاص)ـەکەوە، و بۆیە کار بە (خاص)ـەکە، دەکرێت، لەوەیدا کەلەسەری هاتووە، و لەدوای ئەویش کار بە (عام)ـەکە، دەکرێت، و (مطلق)ـەکە، پێش دەخرێت، بەسەر (مُقَیَّد)ـەکەدا، و یاخود کار بە (مُقَیَّد)ـەکە، دەکرێت، لە جێگای خۆیداو، کاریش بە موتڵەقەکە دەکرێت، لە جێگای تردا، لەسەر ئەو شێوازەی کە ڕوونمان کردەوە، لە بەشە باسەکانی (عام)و (خاص)و (مطلق)و (مقید)داو، هەر لەوێش نموونەمان لەسەر ئەمانە هێنا.

٣٧٩- یەکێکی تر لە ڕێگاو ڕێبازەکانی کۆککردن (التوفیق)، بریتیە لەوەی کە یەکێك لەو دەقانە بەو شێوازە ماناو شرۆڤە بکرێت، کە دژایەتی نەکات لەگەڵ دەقەکەی تردا.

٣٨٠- پێشخستنیو تەرجیحدان بەپێی بەهێزی بەڵگەکان:

ئەگەر بەڵگەکان لە ئاستو پلەی بەهێزیدا جیاواز بوون، ئەوا لێرەدا پێشخستنو تەرجیح لەسەر بنەمای بەهێزی بەڵگەکان دێتە گۆڕێ، هەر چەندە لە ڕاستیدا ئەم پێشخستنو تەرجیحەدانە، لێرەدا بریتییە، لە تەرجیحدانی نێوان دووشتی پێچەوانەو دژ بەیەك چونکە دژایەتییەکە لە نێوان چەند بەڵگەیەکی جیاواز لە هێزدا نییەو، بەڵکو دژایەتیو پێچەوانە بوونەوەکە لە نێوان بەڵگە گەلێکی هاوئاستدایە لە هێزدا، هەر وەك لە سەرەتای ئەم بەشەدا، ئاماژەمان پێی دا، لە ڕێگاو ڕێبازەکانی ئەم جۆرە تەرجیحدانە وەك:

١- دەقی قورئان یاخود سوننەت پێش دەخرێتو تەرجیح دەدرێت بەسەر قیاسدا، چونکە قیاس بەڵگەیەکی (ظني)یە، و لە کاتی بوونی دەقدا کاری پێ ناکرێت.

٢- کۆڕای زانایان (ئیجماع) پێش دەخرێتو تەرجیح دەدرێت، بە سەر ئەوەی کە لە دوو تۆی قیاسدا داواکراوە، چونکە ئیجماع یەکلایی (قطعي)یەو، قیاس

نایەكلایی (ظني)یە، و دواجار شتی (ظني)، هێزی دژایەتی كردنی بەڵگەی (قطعي) نییە.

٣- فەرموودەی موتەواتیر تەرجیح دەدرێت بەسەر فەرمودەی ئاحاددا.

٤- ئەو فەرموودە ئاحادەی كە كەسێكی دادپەروەری شەرعزان دەیگێڕێتەوە، پێش دەخرێتو تەرجیح دەدرێت بەسەر ئەو فەرموودەی ئاحادەیدا، كە كەسێكی دادپەروەر، بەڵام ناشەرعزان گێڕابێتییەوە.

٥- ئەگەر دوو قیاس پێچەوانەگەریو دژایەتی هەبوو، لە نێوانیاندا ئەوا كار بە بەهێزترەكەیان دەكرێت، وەك ئەوەی كە عیللەتی یەكێكیان دەقی لەسەر بێت، كە ئەمە بەهێزترەكەیانە، و عیللەتی ئەوی تریان هەڵهێنجراو بێت، و یاخود عیللەتی یەكەمیان زیاترو بەهێزانە تر كاریگەری هەبێتو، یاخود زیاتر گونجابێت، لەگەڵ حوكمەكەدا، لە عیللەتەكەی تر بۆیە یەكەمینیان پێش دەخرێتو، تەرجیح دەدرێت بەسەر ئەوی تریاندا.

**٣٨٠- لادان لە هەر دوو بەڵگە دژ بەیەكەكە:**

ئەگەر سەرجەمی رێگاو رێبازەكانی رەواندنەوەی دژبەیەكی و پێچەوانەیگەریو هەروەها تەرجیحدان داخرانو دەستمان نەكەوتن، ئەوا كەسی موجتەهید خۆی لە بەبەڵگەكردنو بە بەڵگە هێنانەوەی هەر یەكێك لەو دوو بەڵگە دژ بەیەكە لا دەدات، و دەچێت بۆ بە دواداچوونو توێژینەوە بۆ دەستخستنی بەڵگەیەكی تر، كە لە پلەدا لەمان كەمتر بێت، هەروەك چۆن ئەگەر دوو دەق دژی یەكتری بوونو، نەدەكرا كە تەرجیح لە نێوانیاندا بكرێت، ئەوا كەسی موجتەهید پەنا دەباتە بەر قیاسكردن!

# بەندی چوارەم

## ئیجتیهاد، و ( لاسایی کردنەوە: التَّقلید )، و ( ڕاجیایی: الخِلاف )، لە شـەریعـەتـی ئـیسلامـیـدا

## بەشی یەکەم

### باسی ئیجتیهاد[1]

٣٨٢ـ **ئیجتیهـاد لـە زمـانی عەرەبیـدا:** بـە مانـای کۆشـش کـردن و خسـتنەگەڕی تواناکانی مرۆڤە، بۆ کردنی کارێك لە کارەکان.

وە لە زاراوەی زانایانی زانستی ئوصوڵی فیقهدا، بریتییە لە خستنەگەڕی تواناکـانی کەسـی موجتەهیـد و کۆشـش کردنـی بـۆ دەستخسـتنی بـوونی زانسـت بـە حوکمـە شـەرعییەکان، بـە ڕێگـای هـەڵهێنجان (الاسـتنباط)، جـا لـە ڕوانگـەی ئـەم پێناسـە زاراوەییـەی موجتەهیـدەوە، ئـەم چـەند ڕاسـتییەی لای خوارەوەمـان بـۆ ڕوون دەبێتەوە:

**یەکەم:** ئەوەیـە کـە کەسـی موجتەهیـد توانـای خـۆی بخاتـە گـەڕ، واتـە ئەوپـەڕی کۆششی خۆی بەکاربهێنێت، بەجۆرێك کە هەست بکات، ئیتر لەوە زیاتر لـە توانـا و دەستی نایەت.

**دووەم:** دەبێت ئەو کەسەی کە ئەو کۆششەی خۆی بەکاردەهێنێت، کەسێکی موجتەهید بێت، بەمانای وشە، بۆیە کەسی غـەیرە موجتەهیـد، هەرچـەندە کۆشـشیش بکـات ، لـەم بوارەدا، هەر بایەخی نییە، چونکە موجتەهید نییە، و ئـەهلی ئیجتیهـادیش نییـە، و بۆیـە ئیجتیهاد لە کاتێکدا وەرگیراوە، کە لە ئەهلی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبێت.

---

[1] (الـموافقات)، ب٤، ل٥٧ و دواتر، (فواتح الرحـموت، شـرح مسـلم الثبـوت)، ل٣١٣ و دواتـر، (الـمستصفى)ـی، پێشەوا غەزالـی، ب٢، ل١٠٣ و دواتر.

**سێیەم:** پێویستە ئەو کۆششەی کە کەسی موجتەهید دەیکات، مەبەستی پێی ناسین و زانینی حوکمە شەرعییە کردارییەکان بێت، نەك شتی تر، بۆیە ئەو کۆشش و هەوڵانەی کە لە پێناو ناسینی حوکمە زمانەوانییەکان و عەقڵی و هەستییەکان دەخرێنە گەڕ، سەر بەو جۆرە ئیجتیهادە زاراوەییە نایەنە ئەژمار، کە زانایانی زانستی ئوصوڵی فیقهـ، پێناسەیان کردووە، و چوارچێوەیان بۆ داناوە.

**چوارەم:** لە ناسین و زانینی ئەحکامە شەرعییەکاندا، ئەوە بە مەرج گیراوە کە دەبێت، بە ڕێگای هەڵهێنجان (الاستنباط) بزانرێن و بناسرێن، واتە، ئەو حوکمە شەرعییانە بە سوودوەرگرتن لە بەڵگەکانیان و تێڕامان لێیان و توێژینەوە لە سەریان دەستمان بکەوێت، بۆیە بەم پێودانگە بێت، لەبەرکردنی باسەکان و دۆزەکان، یاخود زانینیان لە دەمی موفتییەکانەوە، یاخود بە وەرگرتن و زانینیان لە کتێبە زانستییەکانەوە، هیچ شتێك لەمانە ناچنە ناچنە چوارچێوەی ئیجتیهاد لە زاراوەدا، و لە قاڵبی ئەو دەچنە دەرەوە.

### ٢٨٣ـ کەسی موجتەهید:

لە پێناسەی ئیجتیهادەوە مەبەست و مانای کەسی موجتەهید دەردەکەوێت، و ڕوون دەبێتەوە، و دواجار موجتەهید ئەو کەسەیە کە توانای تێگەیشتن (مَلَکَة)ـی، هەبێت، بۆ هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییە کردارییەکان، لە بەڵگە تەفصیلییەکانەوە، کە ئەمەیش لە لای زانایانی ئوصول، بە (شەرعزان: فەقیهـ) ناونراوە، بۆیە کەسێك بە موجتەهید، یاخود شەرعزان دانانرێت، ئەگەر حوکمە شەرعییەکانی بە ڕێگای لەبەرکردن و بەسەردا خوێندنەوە زانیبێت، یاخود لە کتێب و دەمی زانایانەوە وەری گرتبێت، بە بێ توێژینەوە و تێڕامان و سەرنجدان و هەڵهێنجان.

توانایش لە سەر ئیجتیهاد کردن، بە هاتنەدی ئەو مەرجانە دەبێت، کە مرۆڤ پێی دەبێتە موجتەهید.

**٢٨٤ـ مەرجەکانی ئیجتیهاد:**

**یەکەم: زانینی زمانی عەرەبی:**

پێویستە کەسی موجتەهید زمانی عەرەبی بزانێت، بە جۆرێك كە بۆی بکرێت، لە قسەی عەرەبەکان تێ بگات، و مانای وشەی ناو ڕستەکانیان و شێوازی دەربڕینیان حاڵی ببێت، ئەمەیش یان بە سروشت و سەلیقەی خۆی دەبێت، یان بە فێربوونی زانستەکانی زمانی عەرەبییە، هەر لە زانستی (نەحو)، (صەرف)، تا (بلاغة، ڕەوانبێژی) و (ئەدەب) و (مَعانی) و (بَیان)، لەم ڕوانگەیەوە فێربوونی زمانی عەرەبی، لە سەر ئەم شێوازە بۆ کەسی موجتەهید کارێکی پێویستە، چونکە دەقەکانی شەریعەت بە زمانی عەرەبی هاتوون، بۆیە تێگەیشتنیان و سوودوەرگرتن لێیان بە دەرهێنانی حوکمەکانیان، تەنها بە زانینی زمانی عەرەبی دەبێت، بە شێوەیەکی زۆر باش و چاك، بە تایبەتی ئەوەیش کە دەقەکانی قورئان و سوننەت بە ئەوپەڕی شێوازی پلەی ڕەوانبێژی (بلاغة)، و زمانپاراوی (فَصاحة) و ماناڕوونی (بَیان) هاتوون، بۆیە بە تەواوی ناتوانین لێیان تێ بگەین، و تام لە ماناکانیان بکەین، و هەست بەو مانایانە بکەین، کە دەیدەن بە دەستەوە، تا زمانێکی عەرەبی باش نەزانین، و پەی بە شێوازەکانی دەربڕینی نەبەین، و نهێنییە ڕەوانبێژی و ڕوونەکانی ئەم زمانە ئاشکرا نەکەین.

هەروەها سەرجەمی ئەو مانایانەی کە وشە و دەستەواژەکانی ئەم زمانە ئاماژەی بۆ دەکەن، دەبێت تیایاندا شارەزا ببین، وە بە ئەندازەیەك دەبێت ئەو کەسە موجتەهیدە ڕۆ بچێت، لە زانینی زمانی عەرەبیدا، کە توانای هەبێت لە تێگەیشتن لە دەقەکان و پەی بردن بە مانا نزیك و دوورەکانی، بەڵام لە کەسی موجتەهیددا، ئەوە بە مەرج نەگیراوە، کە ئەوەندە عەرەبی زانیش بێت، وەك چۆن پێشەوا مەزنەکانی زمانی عەرەبی و زمانزانە عەرەبە ناسراوەکانی تر زانیویانە ، بەڵکو

ئەوەنـدە بەسـە کـە بـە ئەنـدازەی پێویسـت بێـت، و بـۆ تێگەیشـتن لـە دەقـە شەرعییەکان، بە تێگەیشتنێکی تەندروست، کە ئەوەنـدە بەرچـاوی ڕوون بکـات، مەبەست و ئامانجی دەقەکان بزانێت.

**دووەم: زانینی قورئانی پیرۆز:**

لەو مەرجانەی کە کەسی موجتەهید، پێویستە پێوەی پابەند بێت، زانینی قورئـانی پـیرۆزە، چونکە قورئـان بنـەمای بنـەماکان و سەرچـاوەی گشت بەڵگەکانـە، بۆیـە پێویستە لەسەر کەسی موجتەهید، سەرجەم ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بزانێـت، بـە زانینێکی گشتی و بە درێژیش ئایەتەکانی ئـەحکام بناسێت و بزانێت، چونکە لـەم ئایەتانەوە حوکمە شەرعییە کردارییەکان هەڵدەهێنجێت، کە هەندێ لـە زانایـان بـە (٥٠٠:پێنجسەد) ئایەت، مەزەندەیان کردووە.

بەڵام لە ڕاستییدا ئایەتەکانی ئەحکام تەنها ئەم ژمارەیە نین، چونکە بە سەرنجدانی ورد و تێڕامانی قووڵ و هەستکردنی تـەواو، دەکرێـت حـوکم لـە ئایەتـەکانی تـریش هـەڵبهێنجین، و تەنانـەت ئەگـەر لـە ئایەتـەکانی چـیرۆك (القَصَـص) و وێنـەکانی ڕابـردووش بێـت، کـە بەهـەر حـاڵ لەسـەر کەسـی موجتەهیـد پێویسـت نییـە، کـە سەرجەمی ئایەتەکانی ئەحکامی لەبەر بێت، بـەڵکو پێویسـتە لەسـەری کـە جێگـای ئایەتەکان، لە قورئانی پیرۆزدا بزانێت، تا ئاسان بێت بۆی کە بگەڕێتـەوە سـەریان، لـە کـاتی پێویسـتدا، و زانایـانیش بایـەخیان بـە کۆکردنـەوەی ئـەم ئایەتانـە و ڕاڤەکردنیان و ڕوونکردنەوەی ئەو ئەحکامانە داوە، کە دەلالـەتی لەسـەر دەکـەن، و لەم بوارەشدا پەڕاوی زۆریان دانـاوە، وەك پـەڕاوی (أحکـام القـرآن)ـی، (ئەبوبـەکر ئەحمەدی کوڕی عەلی ڕازی) ناسـراو بـە (جصّـاص)، کـە لـە سـاڵی (٣٧٠ك) کۆچـی دوایی کـردووە، و هـەروەها کتێبـی (أحکـام القـرآن)ـی، ئەبوبـەکری ئـیبن عـەرەبی مـالیکی، کـە لـە سـاڵی (٥٤٣ك) کۆچـی دوایـی کـردووە، هـەروەك ژمارەیـەکیش لـە

موفەسیرەکانی قورئانی پیرۆز بایەخێکی تایبەتییان بە ڕاڤەی ئایەتەکانی ئەحکام داوە، و لەسەریان زۆر وەستاون و هەڵوێستەیان کردووە، و ئەو ئەحکامانەی کە لە ئایەتەکان وەردەگیرێن، ڕوونیان کردوونەتەوە، و قسەی شەرعزانەکانیان لەسەر ئەو ئایەتە ئەحکامانە گواستووەتەوە، لەو تەفسیرانەیش تەفسیری قورطوبی، کە لە ساڵی (٧٦١ك) کۆچی دوایی کردووە، کە ناوی ناوەتە (الجامع لأحكام القرآن)، و هەروەها تەفسیری (طوبروسی)، کە لە شەرعزانەکانی سەدەی شەشەمی کۆچی بووە، و ناوی ناوەتە (مجمع البيان في تفسير القرآن)، کە ئەم کتێبانە و هاوشێوەکانیان کارئاسانییان بۆ کەسی موجتەهید کردووە، لەم سەردەمەدا، کە بە هۆیانەوە بگەڕێتەوە، بۆ ئایەتەکانی ئەحکام و هەستکردن و پەی بردن بەو مانا و ئەحکامانەی کە دەلالەتیان لێ دەکەن.

هەر سەر بەم ڕیزبەندی زانینی قورئانی پیرۆزەیش، زانینی باسی (ناسیخ و مەنسوخ : سڕیار و سڕراوە)یش، هەیە، لە ئایەتەکانی قورئاندا، ئەم جۆرەیش هەرچەندە کەمن، بەڵام هەر زانینیان بۆ کەسی موجتەهید پێویستە، لەو پەڕاوانەیش کە لەم بوارەدا نووسراون، وەك پەڕاوی (الناسخ والمنسوخ)ی، پێشەوا ئەبو جەعفەر ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی ناسراوی بە (نَحّاس)، کە لە ساڵی (٣٣٨ك) کۆچی دوایی کردووە.

سەرەڕای ئەمانەیش لەسەر کەسی موجتەهید، پێویستە کە هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئایەتەکانی ئەحکام (أسباب النزول) بزانێت، چونکە زانینی ئەم هۆکاری هاتنە خوارەوەیە، یارمەتی دەدات، کە بە باشی لە مانا و مەبەستی ئایەتەکە تێ بگات.

## سێیەم: زانینی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):

دەبێت کەسی موجتەهید، سوننەتی دروست و ساغ (صَحيح) و سوننەتی لاواز (ضَعيف) لە یەکتری جودا بکاتەوە، و ئەحواڵی گێڕەرەوەکانیان شارەزا بێت و سەری لێ دەر بکات، و ئاستی دادپەروەری و ئاستی لەبەرکردن و خواناسی و شەرعزانییان بزانێت، و سوننەتی موتەواتیر و مەشهوور و ئاحاد لەیەکتر جیا بکاتەوە، و مانای فەرموودەکان بزانێت و هۆکاری گوتنی ئەو فەرموودانە شارەزا بێت، و پلەی فەرموودەکان لە دروستی و هێز و پلە و یاساکانی بەلایەکدا خستن (التَرجيح)، لە نێوانیاندا شارەزا بێت و بزانێت، و هەروەها لە فەرموودە (ناسخ) و (منسوخ)ـەکانیش، شارەزا بێت، و مەرج نییە، کە سەرجەمی فەرموودەکان بزانێت، و بەڵکو ئەوەندە بەسە، کە فەرموودەکانی ئەحکام بزانێت، و هەروەها مەرج نییە، کە لە ناسینی ئەو فەرموودانەدا هەموویانی لە دڵدا لەبەر بێت، و بەڵکو ئەوەندە بەسە کە پەڕاوە صەحیحەکانی فەرموودەی لە لا بێت، و جێگاکانی فەرموودەی ئەحکام تیایاندا شارەزا بێت، هەروەك ئەوەندەش بەسە کە پەڕاوەکانی (الجرح والتعديل)ـی، پێشەوایانی فەرموودەی لە لا بێت، تا حاڵی گێڕەرەوەکان بزانێت، جا ئێمە گووتمان کە ئەوانەی باسمان کردن بەسە بیانزانێت، چونکە گەیشتن بە ناسینی سوننەت لەسەر ئەو شێوازەی کە باسمان کرد، لە لایەن خودی کەسی موجتەهیدەوە، بووەتە کارێکی ئەستەم و گران لەم سەردەمەماندا، بۆیە زۆر پێویستە کە پشت ببەستین لە سەر قسە و فەرمایشت و بیروڕای زانایان و پێشەوایانی فەرموودە.

زانایانیش بایەخیان داوە، بە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی ئەحکام و پەڕاوی زۆریان تیادا داناوە، بەپێی بەشەکانی شەرع (أبواب الفقه)، ڕیزبەندییان بۆ کردووە، و ڕاڤەی کورت و درێژیشیان لە سەر نووسیون، ئەو حوکمانەی کە تیایاندا هەن،

ڕوونیان کردوونەتەوە، و لە گەڵ ڕای مەزهەبەکانی شەرعزانانی وڵاتە جیاوازەکانـدا، (بەرابەری:مُقارَنَة)یـان، کردوون، و قسەیان لەسەر (ڕشتە: سَنَد)ـەکانیان، کردووە، کە ئەمەیش کارئاسانی کردووە، بۆ کەسی موجتەهید کە بگات بە فـەرموودەکانی ئەحکام، و مانـاو حوکمـەکانیان بزانێـت، و نموونـەی ئـەم کتێبانـەیش وەك پـەڕاوی (نيل الأوطار، شرح منتقى الأخبار)ـی، شێخ موحەممەدی کوڕی عـەلی شـەوکانی، و سەرەڕای کتێبە صـەحیحەکانی سـوننەت و شـەرحەکانیان، کـە تـەنیا فـەرموودەی ئەحکامیان لە خۆنەگرتووە، و بەڵکو جگە لەمانە فەرموودەی تریشیان تیادایە.

## چوارەم: زانینی زانستی ئوصوڵـی فیقهـ:

زانسـتی ئوصـوڵی فیقهــ، بـۆ هــەموو کەسـێکی موجتەهیـد و شـەرعزان پێویسـتە، هەروەك لە پێشەکییەکەیشدا باسمان کرد، چونکە بە هـۆی ئـەم زانسـتەوە، کەسـی موجتەهید بەڵگەکانی شەرع و ئاستی ڕیزبەندییان لە کاتی گەڕانـەوە بـۆ سـەریان و چـۆنێتی هـــەڵهێنجانی حوکمـــەکان لێیانـــەوە دەزانێـــت، و هـــەروەها ڕوانگـــەکانی دەلالەتکردنی لەفزەکان لە سەر ماناکانیـان و هێـز و پلـەی ئـەو دەلالەتانـە شـارەزا دەبێت، و ئاست و ڕیزی پێشخسـتن و دواخسـتنی هـەرکامیان بـە سـەر ئەویتریانـدا دەزانێت، و هەروەها (یاسا و ڕێساکانی، بەلایەکدا خستـن: قَواعِدُ التَرجيحْ) لە نێوان بەڵگەکانـدا و باسـەکانی تـریش، کـە لـە زانسـتی ئوصولـــی فیقهـدا توێژراونەتـەوە، شارەزا دەبێت و دەزانێت، و زانایانیش لە کۆن و لـە ئێسـتادا پـەڕاوی زۆریـان لـەم زانستەدا نووسیوە، کە بووەتە هۆکاری ئاسانکاری، لە سەر زانایان، کـە هەڵوێسـتە لەسەر باس و یاسا و ڕێساکانی ئەم زانستە بکەن.

## پێنجەم: زانینی جێگاکانی ئیجماع:

لەسەر کەسی موجتەهید پێویستە کە جێگاکانی کۆڕا (إجماع) بزانێت و شارەزا بێت و بەرچاوڕوون بێت، لە سەریان، و دژەڕا نەبێتەوە، لە گەڵیاندا، لەو باسانەیدا کە خەریکی توێژینەوە و ئیجتیهادکردنە لەسەریان.

## شەشەم: زانینی مەبەست و ئامانجەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة):

یەکێکی تر لە مەرجەکانی کەسی موجتەهید، ئەوەیە کە مەبەستەکانی شەریعەت و عیللەت و هۆکاری ئەحکامەکان و بەرژەوەندی خەڵکی و مرۆڤەکان بزانێت و شارەزا بێت، تا بتوانێت ئەو حوکمانە هەڵبهێنجێت، کە شەریعەت دەقی لەسەر نەهێناون، و لە ڕێگای قیاسەوە، و یاخود لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و نەریت (عادة)ـی، خەڵکی، کە لە کاتی مامەڵەکردنیاندا لەسەری ڕاهاتوون و بەرژەوەندییان بەستراوە پێیەوە، و لەم ڕوانگەیەوە یەکێك لە پێویستییەکانی ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی خەڵکی و هەڵهێنجانی حوکمەکان لەسەر بنەمای ئەو بەرژەوەندییانە بریتییە لە پەی بردن بە نەریت و عورف و عادەتەکانی خەڵکی، چونکە ڕەچاوکردنی ئەم نەریتانە لەڕاستییدا ڕەچاوکردنی خودی بەرژەوەندییە شەرعییەکانی ئەوانە.

## حەوتەم: بوونی ئامادەیی خۆڕسك (فِطري) لە کەسی موجتەهیددا، بۆ بە موجتەهیدبوون:

لێرەدا مەرجێکی تریش هەیە، کە بە ڕای ئێمە مەرجێکی زۆر پێویستە، هەرچەندە زانایانی ئوصول بە ڕاشکاوی دەقیان لەسەر نەهێناوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کەسە زانایە خۆی ئامادەکارییەکی خواڕسك و خۆڕسکی هەبێت، لە دەروونیدا بۆ ئیجتیهادکردن بەوەی کە عەقڵیەتێکی فیقهی لەگەڵ هەستێکی ناسك و پاراوو و بیرێکی پاك و تیژ و بەرچاوڕوونی و باش حاڵی بوون، و ژیکەڵەیی و زیرەکی هەبێت، چونکە بە بێ ئەم ئامادەکارییە خواڕسك، و خۆڕسکە (فِطري) و سروشتییە

ئـەو کەسـە ناتوانێـت ببێتـە موجتەهیـد، هەرچـەندە ئـەو ئامرازانـەی ئیجتیهـادی خوێندبێت و فێر بووبێت، کـە لـە مەرجـەکانی ئیجتیهـاددا، باسمـان کـردن، چـونکە ئەگەر لەو ئامادەکارییە سروشتی و خوارسکەی نەبوو، بۆ ئیجتیهادکردن، ئـەوا ئـەو کەسـە ناکاتـە موجتەهیـد، ئـەم قسـەیەشمان هـیچ نامۆییـەکی تێـدا نییـە، چـونکە کەسێك کە زمانی عەرەبی و زانسـتەکانی و کێشـی شـیعرەکانی فێـر بێـت و بزانێـت ئەمە نایکاتە شاعیر، ئەگەر ئامادەکارییەکی خۆرسکی و سروشتی تیادا نـەبێت، بـۆ شیعر و شاعیر بوون، جا حاڵەتەکە لە ئیجتیهادیشدا هەروایە، موجتەهیـدە نـاوازە و مەزنـەکان ئەوانـە نـین، کـە لـە کەسـانی زیـاتری خۆیـان زاناییـان بـە زانسـتەکانی ئیجتیهادکردن و ئامراز و دەستگیرەکانی ئەو پرۆسەیە هەیە، بـەڵکو ئەوانـەیانن کـە لە کەسانی تری غەیری خۆیان ئامادەکاری سروشـتی و (فِطـری)یـان، بـۆ ئیجتیهـاد کردن هەیە.

**٢٨٥- ئەو بوارانەی کە ئیجتیهاد کردن تیایاندا دروستە، لە گەڵ ئـەو بوارانەیـدا، کە ئیجتیهادکردن تیایاندا، دروست نییە:**

سەرجەمی حوکمە شەرعییەکان بۆ ئـەوە نـاگونجێن کـە ئیجتیهادیـان تێـدا بکرێـت، هەربۆیەش هەندێ لە زانایانی زانستی ئوصوڵی فیقهـ، فەرموویانە کە ئـەو حوکمـەی کـە ئیجتیهـادی تیـادا دەکرێـت، بریتییـە لـەو حوکمـە شـەرعییەیان کـە بەڵگـەی یەکلاکەرەوە (قَطعي) لە سـەر نییـە، واتـە: ئـەو حوکمـە شـەرعییانەی کـە بەڵگـەی (قَطعي) و یەکلاکەرەوەیان لەسەرە، ئەوانە ئیجتیهادتیـادا کـردن، و ڕاجیـایی تیـادا کـردن، نایانگرێتـەوە، وەك پێویسـتیی نوێـژکردن، و ڕۆژووگـرتن، و یاسـاغی داوێـن پیسی و هاووێنەکانیان، و لەوانەی کە دەقی یەکلاکەرەوە لەسەریان هاتووە و هەیە و حاڵ وباڵیان ئاشکرا و زانراوە، نەزان و زانا، وەك یەك ئـەیانزانن و کـەس پاسـاوی لە نەزانینیان نییە.

بەڵام سەبارەت بەو حوکمانەی کە دەقی (قَطعي) لەسەریان نییەو نەهاتووە، بەڵکو بە بەڵگەی گوماناوی (ظني) جێگیربوون، و یاخود دەلالەت کردنەکەیان گوماناوییە، لەسەر ئەو حوکمە، ئەمانەن کە ئیجتیهاد تیایاندا دەکرێت، جا ئەگەر ئەو حوکمانە بە دەقی گوماناوی جێگیر بووبن، واتە (ظنيّة الثبوت) بوون، کە ئەم حاڵەتەش لە سوننەتدا هەیە، ئەوا لێرەدا کەسی موجتەهید توێژینەوە دەکات، لەسەر ئاستی جێگیر بوونی ئەو دەقە و ئەندازەی دروستی و بەهێزی ڕشتە (سەنەد)ـەکەی، و متمانەبوون بە گێڕەرەوەکانی و پشت پێ بەستنیان و ئەو شتانەی تری هاوێنەی ئەمە، کە پێویستیان بە توێژینەوە و تێڕامان هەیە، و موجتەهیدەکانیش لەم پرسانەدا جیاوازن و ڕاجیایی گەورەیان هەیە، بۆیە جاری وا هەیە، کە فلان فەرموودە لە لای موجتەهیدێك چەسپاوە و جێگیرە، و لە لای موجتەهیدێکی تر ناجێگیرە و کاری پێ ناکات.

بەڵام سەبارەت بەو حوکمانەی کە دەلالەتکردنەکەیان گوماناوی و نایەکلایی (ظنيّ)یە، ئەمانە ئیجتیهادکردن تیایاندا لەسەر ئاشکراکردنی مانا و مەبەستەکەیان وەستاوە، ئەویش بە زانینی هێزی دەلالەتکردنی ئەو لەفزە، لەسەر ئەو مانایە و تەرجیحدانی دەلالەتێکیان بەسەر ئەویتریاندا و شەرعزانەکانیش لەم پرسانەدا ڕاجیییان هەیە، هەرچەندە لەسەر پێودانگە گشتییەکان و یاسا و ڕێسا چوارچێوەدارەکان بۆ دەلالەتکردنی لەفزەکان، و تەرجیحدانیان بەسەر یەکتریدا کۆك و تەبان، بەڵام هەر سەرەڕای ئەمەیش لە هەندێ لەم پێودانگانەیشدا جیاوازییان هەیە، و جا جیاوازی و ڕا جیاییەکانیان لە پرسی هەڵهێنجان (استنباط)دا، هەر زۆر فراوانترە، هەروەك ڕاجیایی ئەوان سەبارەت بە ناواخنی پرۆسەی فەرمانکردن (أمر)، و ڕێگری لێ کردن (نهی)، و هەروەها (قطعي) و (ظني) بوونی دەلالەتکردنی (عام)، لە سەر تاك (أفراد)ـەکانی، پێکهێنەری ئەو عامە،

باسی موطلەق و پەیوەندی بە موقەییەدەوە، و پرسی تریش لەم بارەیەوە، کە ئاماژەمان بە هەندێکیاندا، لە جێگای خۆیاندا، لە ئارادا هەیە.

هەروەها ئیجتیهاد لەو پرسانەیشدا ڕوو دەدات، و دەکرێت، کە شەرع دەقی لەسەر دانەناون و دەرنەبڕیون، بۆیە ناچار کەسی موجتەهید، پەنا دەباتە بەر بەڵگەی تری شەرعی، لە قیاس و ئەوانی تر، بێگومان تێڕوانینی موجتەهیدەکان سەبارەت بە ئاستی دروستی ئەم بەڵگانە جیاوازە، و هەروەها لەسەر چۆنیەتی هەڵهێنجان لێیانەوە هەر ڕاجیان، و دیسان لەسەر ئەو حوکمانەیش کە لەسەر بنەمای ئەو بەڵگانە هەڵهێنجراون، لە نێوان یەکتردا، جیاوازی و ڕاجیاییان هەیە.

**٣٨٦ـ ئیجتیهاد نەبەستراوە، بە کات و شوێنەوە:**

نەبەسترانی ئیجتیهاد بە کات و شوێنەوە، بەو مانایە دێت کە ئیجتیهاد تایبەت نییە، بە کاتێکەوە، یان بە شوێنێکەوە، لەکاتێکدا کە تایبەت نەبێت بە کات و شوێنێکی ترەوە، چونکە بنەمای ئیجتیهاد بریتییە لە هاتنەدی ئەو مەرجانە لەکەسەکەدا و ئەمەیش بەدیهاتنی لە هەموو سەردەمێکدا کارێکی گونجاوە و مەحاڵ نییە، بۆیە کورتکردنەوەی و تایبەتکردنی بەسەردەمێکەوە، و داماڵینی لە سەردەمێکی تر، کارێکی دروست نییە، بێگومان منەت و فەزڵی خودای مەزن زۆر فراوانە و بێ سنوورە، و چۆن پێشینانی گرتۆتەوە و پاشینەکانیش دەگرێتەوە و دەقی فەرمایشتی زانایانیش لەسەر ئەوە هەیە، کە دروست نییە، هیچ سەردەمێك خاڵی بکرێت لە کەسانی موجتەهید، کە ئەو کەسە موجتەهیدە هەڵبسێت، بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە خودا ناردوویەتی بۆ سەر مرۆڤەکان، لە ڕێگای پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) و ئەویش پێی گەیاندون، و ئەو فەتوایەی کە هەندێ لە زانایان دەریانکردووە، سەبارەت بە داخرانی دەرگای ئیجتیهاد، ئەمە لە خەمخۆری ئەوانەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ترساون شەریعەت تووشی

بێسەروبەری نەزانان و بانگەشەکارانی ئیجتیهاد ببێتەوە، واتە، ئەهلی ئیجتیهاد نەبن و بانگەشەی بۆ بکەن، بۆیە ئەم فەتوا و فەرمایشتەی ئەوان بەو ئاقارەدا دەبرێت، کە مەبەستیان لە داخرانی دەرگای ئیجتیهاد، لەو کەسانەیە کە ئەهلی زانست و کاری ئیجتیهاد نین.

کەواتە لەم ڕوانگەیەوە ئیجتیهاد، تا ڕۆژی دوایی هەر بەردەوامە و بۆ هەموو لایەکیش کە ئەهلی ئەو کارە بێت دروستە و ڕێگەپێدراوە، بەو مەرجەی کە لەو کەسەدا مەرجەکان و ئامرازەکانی ئیجتیهاد کردن هاتبنە دی، بۆیە تەنها کەسانی ئەهلی ئیجتیهاد دەگەن بەو پلەیە و بەو پۆستە پیرۆزە، کە ئەویش ئەو کەسانەن کە بەڕاستی و حەقیقەت موجتەهیدن و ئەهلی ئیجتیهادن.

کەواتە ئیجتیهاد تایبەت نەکراوە، و زەوت نەکراوە بۆ گرووپێکی دیاریکراو، یان بۆ ڕەچەڵەك و نەژادێکی دیاریکراو، و یان شارێکی دیاری کراو، و یان سەردەمێکی دیاری کراوی جیا لە سەردەمی تر، بەڵکو ئیجتیهادکردن بۆ هەموو کەسێك ڕێگەپێدراوە و دروستە، بەو مەرجەی کە ئامراز و مەرجەکانی ئیجتیهادکردنی تیادا هاتبنەدی، چونکە شەرعی خوای پەروەردگار بۆ سەرجەمی مرۆڤایەتی هاتووە، و لەسەر هەموویشیان پێویستە کە ڕاییپەڕێنن و لە ئەحکامەکانی تێ بگەن، و خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾[1].

و هەروەها لەبەر ئەوەی ئیجتیهاد کردن، بەرزترین پایەی زانستە و زانستیش بۆ هەموو لایەك موباح و ڕێگەپێدراوە، و تەنانەت شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامیش بە کارێکی جوان و باشی داناوە، و ستایشی ئەوانەی کردووە، کە پێی هەڵدەستن و

---

[1] سورة محمد: ٢٤، ئایا ئەوە بۆچی ئەوانە وردبینی لە قورئاندا ناکەن و گوێی بۆ ناگرن؟! یا ئەوەیە دڵەکانیان لە ئاستی ڕاستی دا قفلْ دراوە؟!

فەرمانی کردووە، بە کاری زیاتر کردن تیایدا، و خەڵکی فێری ئەوە کردووە، کە بڵێن: ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾[1].

## ٢٨٧ـ حوکمی ئیجتیهادکردن:

ئیجتیهادکردن واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە ئەهلی ئیجتیهادە، بە جۆرێك کە سروشتی ئەو ئیجتیهادکردنە تیایدا بێت، سەرجەمی هۆکار و ئامرازەکانی ئیجتیهادی بۆ ئامادە و فەراهەم هاتبن، لەسەر کەسی موجتەهیدیش پێویستە لە ڕێگای تێڕامان و توێژینەوە لە بەڵگەکان بگات، بە دەستخستنی حوکمە شەرعییەکان و ئەوەی لە ڕێی ئیجتیهادی ئەو کەسەوە دەمانگاتێ، بریتییە لە حوکە شەرعییەکە و لەسەر خودی خۆی پێویستە کە پراکتیزەی بکات، و شوێنی بکەوێت، و دروست نییە بۆی کە وازی لێ بهێنێت و لاسایی (تقلید)ـی، کەسانی تر بکاتەوە، و ئەو کەسە ئەگەر لە ئیجتیهادکردنەکەیدا پێکابێتی، ئەوە دوو جار پاداشتی هەیە و ئەگەر هەڵەی کردبێت، یەك پاداشتی هەیە، و لەم ڕووەوەیە کە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) هاتووە، کە دەفەرموێت: (إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)، واتە: ئەگەر دادوەر ئیجتیهادی کرد، و پێکای، ئەوە دوو پاداشتی هەیە، و ئەگەر هەڵەی کرد تیایدا، ئەوە یەك پاداشتی هەیە.

## ٢٨٨ـ گۆڕین، یان هەڵوەشاندنەوەی ئیجتیهاد:

تێڕامان و خستنەگەڕی توانا و وزە، بە مەبەستی گەیشتن بە حوکمی شەرعی، بنەمای ئیجتیهاد کردنە، جا کە کەسی موجتەهید لەسەر پرسێك توێژینەوەی کرد و تێی ڕاما و سەرنجی لێی دا، و ئەوپەڕی توانای خۆی خستە کار بۆی، تا بگاتە حوکمێك لەو پرسەدا، ئەوا ئەو حوکمە سەبارەت بە خودی ئەو موجتەهیدە واجبە،

---

[1] سورة طه: ١١٤، بڵێ: خوایە زانستم زیاد بکە.

و دەبێت پێوەی پابەند بێت، و هەر ئەویشە کە دەتوانێت لەسەر بنەمای ئەو ئیجتیهادە، فەتوا دەربکات، و بەڵام ئەگەر ئیجتیهادەکەی لەسەر خودی ئەو پرسە گۆڕدرا، ئەوا لەسەریەتی کە کار بە ناواخنی ئیجتیهادە نوێیەکەی بکات، و لە ڕوانگەی ئەم ئیجتیهادە نوێیەوە فەتوا دەربکات، و واز لە قسەی یەکەمی خۆی بهێنێت.

جا ئەگەر کابرای موجتەهید، دادوەر (حاکم) بوو، بەپێی ئیجتیهادی خۆی لە پرسێکدا، حوکمێکی دیاری کراوی دەرکرد، ئەوا بۆ دادوەرێکی تر دروست نییە، کە ئەو ئیجتیهادە هەڵبوەشێنێتەوە، چونکە لێرەدا یاسا و ڕێسا وایە کە ئیجتیهاد بە ئیجتیهادی تری وەك خۆی، هەڵناوەشێنرێتەوە، و بەڵام ئەگەر پرسێکی ترت، وەك پرسی یەکەم خستە بەردەم هەمان دادوەر و لەسەر ئەم پرسەیان ڕایەکی نوێی لێ دەرکەوت، ئەوا لێرەدا پێویستە لەسەری کە کار بە ئیجتیهادە نوێیەکەی بکات، و بەڵام سەبارەت بەوەیان کە لە سەرەتادا و یەکەمجار حوکمی لەسەردا، ئەوەیان هەڵناوەشێنرێتەوەو دەڕوات و ئەمەیش مانای ئەوەیە کە حوکمە دادوەرییە تێپەڕیوەکان، دادوەری مسوڵمان پابەند ناکەن، بە گەڕانەوە بۆ سەریان، و هەر لەسەر ئەم بنەمایەش دادوەران لە ئیسلامدا کاریان کردووە، و نموونەی ئەمەیش، وەك، ئەوەی کە پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب،(خوای لێ ڕازی بێت)، لە پرسی (حَجَرِيَّة)، کە پرسێکی تایبەتە بە میراتبردن، فەرمانی بەوەدا کە کوڕی باوك و دایکی لە میرات بێبەش دەبن، و پاش ماوەیەك هەمان پرس خرایەوە بەردەم پێشەوا عومەر (خوای لێ ڕازی بێت)، و ئەمجارەیان وا بڕیاری دا، کە ئەو کوڕە باوك و دایکییانە، لە گەڵ کوڕە دایکییەکاندا میرات دەبەن، جا لێرەدا ئەو گرووپەی کە بە فەتوای یەکەم کاریان لەگەڵدا کرابوو، ڕەخنەیان گرت، و پێشەوا عومەریش

(خوای لێ ڕازی بێت) لە وەڵامیاندا، فەرمووی: ئەوە حوکمێك بوو، کە پێشتر کردمان و ئێستاش ئەم حوکمەیە کە دەیکەین!

جا سەبارەت بەم باسی (الحَجَريَّة)، زانایان لەسەری بوون، بە دوو گرووپەوە، گرووپێکیان ڕایان وایە کە دەبێت برا دایکی و باوکییەکان بکرێن بە هاوبەشی برا تەنها دایکییەکان، گرووپەکەی تر ڕایان وایە کە برا دایکی و باوکییەکان لە میراتەکە بێبەش دەبن و نابن بە هاوبەشی برا تەنها دایکییەکان، مەسەلەکەیش بریتییە لە (مێرد، دایك، یان داپیرە، برای دایك و باوکی، چەند برایەکی دایکی))، جا ئەم مەسەلەیە بۆیە ناونراوەتە (الحَجَرِيَّة)، چونکە دەگێڕنەوە کە برا دایك و باوکییەك گووتوویەتی: قوربان وا دابنێ کە باوکمان بەردێکە و فڕێ دراوەتە ناو ئەو ئاوە!

بەهەرحاڵ لەم باسی ژمارە کارییەی میرات دەربچین و بچینەوە سەر باسی زانستە پیرۆزەکەی ئوصولی فیقهـ، هەر سەبارەت بە ئیجتیهاد، ئەوە بزانە کە ئەگەر ئیجتیهاد پێچەوانەی دەقێکی (قطعي) بوو، ئەوە ئەوکاتە ئەو ئیجتیهادە هەڵدەوەشێتەوە، و کاری پێ ناکرێت و بێ بایەخە، چونکە ئەوە لە ڕاستیدا، هەر ئیجتیهاد نییە.

### ٢٨٩ـ دابەشکردن، یاخود تایبەتکردنی ئیجتیهاد:

مانای دابەشکردن و تایبەتکردن (تَجَزُّء)ی، ئیجتیهاد، بریتییە لەوەی کە کەسێکی زانا لە پرسێکدا، موجتەهید بێت، و لە پرسێکی تردا موجتەهید نەبێت، واتە، لە هەندێ پرسدا توانای ئیجتیهادکردنی هەبێت و لە هەندێ پرسی تردا توانای نەبێت، بە لەبەرچاوگرتنی هاتنەدی ئامرازەکانی ئیجتیهادکردن، لەو کەسەدا و تایبەت بەو پرسانە، وەك ئەوەی کە کەسێك سەرجەمی بەڵگەکانی میرات و دەقەکانی و ئەوەی دەربارەی هاتووە، لە سوننەت و گوتەی زانایان، هەمووی کۆنترۆڵ کردبێت و بیزانێت، ئەوا ئەم کەسە بۆی هەیە، کە لەو پرسانەدا ئیجتیهاد بکات، هەرچەندە کە

توانای نییە لە پرسەکانی تردا ئیجتیهاد بکات، لەبەرئەوەی کە مەرج و ئامرازەکانی ئیجتیهادی لەو پرسەدا هێشتا تیادا نەهاتووەتە دی، و هەندێ لە زانایان ئەم دابەشکردن و تایبەتکردنەی ئیجتیهادیان قەدەغە کردووە، بەڵام قسەی یەکەم لەپێشتر و (ڕاجیح)ترە، و ڕەوتی موجتەهیدی پێشینەکان لەسەر ئەو شێوازەی قسەی یەکەم ڕۆیشتوون و هەیانبووە، کە لە زۆر پرسدا پرسیاریان پێ کردووە، بەڵام وەڵامی هەندێکیانی داوەتەوە، و لەسەر ئەوانی تر وەستاوە، و فەرموویەتی: (لا أدري : نازانم).

# بەشی دووەم

## باسی ( التَّقليد : لاساییکردنەوە )

**٣٩٠- ( التَّقليد : لاساییکردنەوە ) لە زمانی عەرەبیدا :** لە (قَلاَّدة: گەردنبەند)ـەوە، وەرگیراوە، کە بریتییە لەو ئامرازی گەردنبەندەی کە مرۆڤ گەردنی کەسێکی تری پێوە دەبەستێتەوە و لە زاراوەدا پێشەوا غەزالی، دەفەرموێت: "بریتییە لە وەرگرتنی قسەیەك بە بێ بەڵگە"، و هی تریش گوتوویانە کە : "تەقلید: بریتییە لە کارکردن بە بێ بەڵگە، بە قسەی کەسێك کە قسەی ئەو کەسە بەڵگەیەك نییە، لە بەڵگەکان"، و زانایانی تریش هەر قسەی لەم بابەتە و بەم مانایەیان کردووە، و فەرموویانە: تەقلید بریتییە: "لە وەرگرتنی قسەی قسەکەر، تۆش نازانیت، کە لە کوێوە گوتوویەتی".

لەم پێناسانەوە ئەوەمان دەست دەکەوێت، کە تەقلید، بریتییە لە وەرگرتنی ڕای بەرامبەر، بە بێ زانین و ناسینی بەڵگەکەی و ئاستی بەهێزییەکەی، وەك ئەو کەسەی کە بە دروستی دەزانێت، گرێبەندی هاوسەرێتی بەهۆی بوونی کەموکوڕییەوە هەڵبوەشێندرێتەوە، لەبەرئەوەی کە فلان موجتەهید ئەو قسەیەی کردووە، بە بێ ئەوەی کە بەڵگەکەی و ئاستی بەهێزی بەڵگەکەی بزانێت و بناسێت.

**٣٩١- حوکمی لاسایی کردنەوە ( التقليد ):**

شەریعەت لە ئەسڵدا سەرزەنشتی لاساییکردنەوە (تقلید)ـی، کردووە، چونکە کەوتنە شوێن شتێکە بە بێ بەڵگە و نیشانە، و سەرەڕای ئەوەی کە دەبێتە هۆی دەمارگیرییەکی ناشیرین و سەرزەنشتکراو لە نێوان کۆمەڵی لاساییکەرەواندا.

زانایان سەبارەت بە دروستی تەقلید کردنەوە، لە ئەحکامە شەرعییە کردارییەکاندا ڕاجیاییان هەیە، گروپێك بە لای ئەوەدا ڕۆیشتوون، کە بە ڕەهایی (مُطْلَقاً) دروست نییە، و لە سەر کەسی ئەرك لەسەرشان (مُكَلَّف) بەپێویستیان داناوە، کە دەبێت

ئیجتیهاد بکات و خۆی فێری ئامراز و مەرجەکانی بکات و گرووپێکیش ڕایان وایە کە بە ڕەهایی دروستە، بۆ سەرجەم ئەو کەسانەی کە توانای ئیجتیهاد کردنیان هەیە، و بۆ سەرجەمی ئەوانەیش کە توانایان نییە، و هەندێ لە زانایان لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوە و بەدواداچوونی زیاتریان کردووە و ڕایان وایە کە ئەگەر کەسێك توانای ئیجتیهادکردنی نەبێت، و تیایدا دەستەوسان بێت، ئەوا بۆ ئەم کەسە تەقلیدکردنەوە کارێکی دروستە، بەڵام تەقلید بۆ کەسی موجتەهید و توانادار لە سەر ئیجتیهادکردن حەڕامە، و ئەم قسەیەش قسەو ڕایەکی لەپێشتر (ڕاجیح)ـە.

و زانایان قسەیان زۆر کردووە لەسەر پرسی تەقلید، بە بەرگری لێکردن بێت، یان بە هێرشکردنە سەری، لە نێوان هەردوو گرووپەکەدا کێشمەکێش و زبری و توندی زۆر ڕوویداوە.

جا ئەوەی کە من لەم دۆزەدا دەیبینم ئەوەیە کە ئەم پرسە ڕوون و ئاسان و ئاشکرا و بێ گرێ و گۆڵە و پێویست ناکات بکرێتە جێگای مشتومڕ و درێژدادڕی، لەبەرئەوەی کە لە گشت کەسێکی موکەللەف داواکراوە کە گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بکات، و دەقی زۆر ڕاستەوخۆیشی هەن، کە بەڵگەن لەسەر ئەو قسەیە، هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾[1]، و هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ﴾[2]، یان ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا

---

[1] سورة آل عمران: ١٣٢، بە گوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن و لە فەرمانیان دەرمەچن، بەڵکو خودا بە میهرەبانی خۆی ڕەحمتان پێبکات.

[2] سورة الحشر: ٧، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەتانداتێ، وەریگرن، و فەرمانبەرداریی بکەن، و ئەوەی لێتان قەدەغە دەکات، وازی لێ بێنن.

شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[1]،

یان دەفەرموێت:﴿ اتَّبِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ﴾[2].

کەواتە ئەو شتەی کە لەسەر سەرجەمی موکەللەف، بە بێ جیاوازی پێویستە ئەوەیە کە گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی بن، (صلی الله علیه وسلم)، و بێگومان واجیبوونی کارێکی لەم جۆرەیش پێویستی بە زانینی ئەو شەرعە هەیە کە خودا لە قورئاندا باسی کردووە، و یاخود لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ڕایگەیاندووە، جا زانینی ئەو شەرعەی خوایش بە گەڕانەوە دەبێت بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت و سوودوەرگرتن لێیان، و لە دوای تێگەیشتنیان و زانینی مەبەستەکانیان، جا ئەگەر کەسی موکەللەف حوکمەکەی بە ڕاستەوخۆیی لەو دەقانەوە دەست نەکەوت، ئەوا ڕووە و ئیجتیهاد کردن مل دەنێت، و هەروەك شەرع فەرمانی پێکردووە، بۆیە لەچوارچێوەی شەریعەتدا و لەبەر ڕۆشنایی میتۆد و بنەما گشتییەکاندا، و لە ژێر سێبەری ئامانج و مەبەست و ماناکانیدا ئیجتیهاد دەکات، ئەمەیش ئەو ڕێگا ڕاست و قایمەیە، کە بە هۆیەوە ئەحکامەکان دەزانین و دەناسین، و بێگومان گرتنی ئەم ڕێگایەش پێویستی بە ئەندازەیەکی دیاریکراو لە زانایی و هەستەوەری هەیە، و ئەمەیش بە پێی حاڵەتی کەسەکە و زانابیەکەی کەم و زیاد دەکات، تا دەگات بەو ئاست و سنورەی کە پلەی باڵای ئیجتیهادی بۆ شیاو دەبێت، جا ئەگەر کەسی موکەللەف (بەربان)، نەیتوانی بەم ڕێگایە ئەحکامەکان بزانێت و بناسێت، ئەوا لەسەریەتی کە بەو شێوازە کار بکات، کە خودای مەزن

---

[1] سورة النساء: ٦٥، سوێند بەو خودایەی دروستکەری ئەمانەیە، ئەمانە نابنە ئیمانداری ڕاستەقینە، تا وایان لێ دێت، کە بە ڕەزای دڵو باوەڕەوە، تۆ دەکەنە حەکەم (دادوەر)، لەو ناکۆکییانەدا، کە لە ناویاندا ڕوو دەدات، و هیچ گرێ لە دڵیاندا نەبێ، لەو حوکمەی کە تۆ دەیدەیت، و بە تەواوی ملکەچت دەبن، و بە گوێت دەکەن.

[2] سورة الأعراف: ٣، دوای ئەم قورئانە بکەون، کە خودا نازڵی کردووەتە سەرتان.

فەرمانی پێکردووە، بۆیە دەبێت پرسیار لە زانایان بکات، دەربارەی ئەو حوکمەی کە لە هەر پێشهاتێکدا هەیە، و ئەو دەیەوێت بیزانێت،وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾[1]، و لە سەری پێویست نییە کە پرسیار لە زانایەکی دیاری کراو بکات، و تەنها بە خودی ئەو کەسە زانایەوە پابەند ببێت، چونکە خوا تۆپزی نەکردووە لە سەری، کە بەم شێوازە بێت، و هیچ جۆرە پابەندبوونێك ئەگەر شەرع داینەنابێت بایەخی نییە، و ئایەتە پیرۆزەکەیش فەرمانی پێکردووە کە پرسیار لە (ئەهلی عیلم: زانایان) بکات، نەك زانایەکی دیاری کراو، و بەڵکو ئەوەی لە سەرە کە کامیان زیاتر وا بڵاوە و ناوی دەرکردووە کە هەرە زاناترین و بەرێزترین و دادوەرترینیان و لەخواترسترینیانە دەبێت، ئەمەیان هەڵبژێرێت، و ئەمەیش هەمان ئەو کارەیە کە ئەو مرۆڤە توانای هەیە بیکات، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾[2]، خودای مەزن زیاد لە توانا ئەرکی نەخستۆتە سەر دروستکراوەکانی.

ئەمە ئەو باسەیە کە ئێمە دەیزانین، سەبارەت بە پرسی ئیجتیهاد و تەقلید و دەقەکانی قورئانیش هەر دەلالەت لەسەر ئەم مانایە دەکەن، و پێشینە چاکەکانیشمان لەسەری رۆیشتوون، و بێگومان کەسی موجتەهید لە رێگای هەڵهێنجان و ئیجتیهادەوە ئەحکامەکان دەزانێت و دەناسێت، و خەڵکی ئاساییش پرسیار لە موجتەهیدەکان دەکەن، لە سەر حوکمە شەرعییەکان و خۆی پابەند ناکات بەوەوە کە تەنها پرسیار لە کەسێکی دیاری کراو بکات و لە کەسێکی تری نەکات.

---

[1] سورة النحل: ٤٣ – سورة الأنبياء: ٧ ، دەی ئەگەر خۆتان نازانن، لەوانە بپرسن کە ئاگایان لەو کتێبانە هەیە، کە لەرێگای پێغەمبەرانەوە بۆ خەڵکمان ناردوون، واتە، لە (زانایان: العُلَماء) بپرسن.

[2] سورة البقرة: ٢٨٦ ، خوای گەورە، داوا لە هیچ کەسێك ناکات، مەگەر بە ئەندازەی توانایی خۆی.

## ٣٩٢ـ تەقلیدکردنی مەزهەبەکان:

مەزهەبە ئیسلامییەکان، قوتابخانەی فیقهین، بە ناوی دامەزرێنەرەکانیانەوە ناسراون، کە موجتەهیدی مەزن بوون، و زانست و ئیجتیهاد و ڕاستاڵی و خواناسییان پێوە بینراوە و هەیانبووە، و ئەم مەزهەبانەیش هەیانە کە بە کۆچی دوایی شوێنکەوتەکانیان و پەیڕەوانیان سڕاوەتەوە و شوێنەواری نەماوە، و بیروڕا و فەرمایشتەکانیشیان نەماون، و تەنها ئەوەندەیان نەبن، کە لە پەڕاوە فیقهییەکاندا، و لە پرسە پڕ لە ڕاجیاییەکاندا ماون و هەن، و نموونەی ئەو مەزهەبە تیاچووانەش وەك مەزهەبی پێشەوا (ئەوزاعی) و (سوفیانی ثەوری)، و ... هتد، و مەزهەبی تریش هەن، کە تا ئێستاش ماون و شوێنکەوتەیان هەیە و پەڕاوی تایبەتیان هەیە، کە فەرمایشت گەلی شەرعزانەکانی مەزهەبەکەیان تیایدا گێڕدراوەتەوە، جا ئایا تەقلیدکردنی ئەم مەزهەبانە دروستە، یان نا...؟!

گوتمان کە لەسەر کەسی موجتەهید پێویستە کە ئەحکامەکان بناسێت، لە سەرچاوە سەرەکییەکانیانەوە، و لە ڕێگای تێڕامان و ئیجتیهادەوە، و تەقلیدکردنی بۆ دروست نییە، بەڵام کەسی دەستەوسان و بێ توانا لە ئیجتیهاد کردندا، بۆ ئەمەیشیان گوتمان کە لەسەری پێویستە پرسیار لە زانایان و ئەهلی عیلم بکات، و ئەم پرسیارکردنەیشی لە ئەهلی عیلم جاری وا هەیە کە زارەکییە، و جاری واش هەیە کە بە گەڕانەوەیە بۆ فەرمایشتەکانیان، کە لە دووتوێی پەڕاوە متمانەپێکراوەکاندا نووسراون، کە بەهێزترینی ئەو فەرمایشتانەی تیادا هاتووە و بە دروستی گواستراونەتەوە، و لەم ڕوانگەیەوە لەسەر کەسی ئاسایی پێویستە کە شوێن مەزهەبێکی دیاریکراو لەو مەزهەبە ناسراوانە بکەوێت، کە تا ئێستا ماون، و بە دروستی بۆ ئێمە گواستراونەتەوە، بەڵام ئەوەیش پێویستە کە ئەم چەند خاڵەیش لە هزرماندا ئامادەیی هەبێت:

**یەکەم:** بێگومان سەرجەمی مەزهەبە ئیسلامییەکان مەزهەبی فیقهین، و بۆ ڕاڤەکردنی دەقە شەرعییەکان و هەڵهێنجانی حوکم لێیانەوە، بۆیە ئەم مەزهەبانە میتۆدی فیقهین، لە هەڵهێنجان و ناسینی ئەحکامەکاندا و شەرعی نوێ نین، داهێنراین و هیچ شتێکی تر نین، کە جیا بن، لە ئیسلامەتی.

**دووەم:** شەریعەتی ئیسلامی کە تەنها دەقەکانی قورئان و سوننەتە، لە هەموو مەزهەبێك گەورەتر و فراوانترە و هیچ مەزهەبێك نییە، کە لەم گەورەتر و بەرفراوانتر بێت.

**سێیەم:** شەریعەتی ئیسلامی بەڵگەیە بەسەر هەموو مەزهەبێکدا، بەڵام هیچ مەزهەبێك بەڵگەو حوججە نییە، بەسەر شەریعەتی ئیسلامییەوە.

**چوارەم:** مۆڵەتی ڕێگەپێدان بۆ شوێنکەوتنی ئەم مەزهەبانە ئەوەیە کە ئەم مەزهەبانە شوێنی دەستکەوتنی ناسینی ئەحکامەکانی شەریعەتن، بۆ پەیڕەوانیان، واتە، پێگەیەکن بۆ ئێمە، تا ئەو حوکمانە بەهۆیانەوە بناسین کە خودا لە قورئاندا یان لە سوننەتدا ناردوونی، و ئاراستەی کردوون، جا کە زانرا مەزهەبی فلانە کەس لە فلان پرسدا هەڵەیە، ڕای ڕاستتر لە لای غەیری ئەوە، ئەم ڕا دروست و ڕاستەیش بە پێی پێویست دەرکەوت و ئاشکرا بوو، کە ڕای ساغ و پێکاوەکەیە، ئەوا لەسەر پەیڕەوکاری ئەو مەزهەبە پێویستە کە لەو پرسەدا، لە مەزهەبەکەی خۆی لابدات و بچێتە سەر ڕای دروست و پێکاوەکە.

**پێنجەم:** دروستە بۆ کەسی پەیڕەوکاری مەزهەبێکی دیاریکراو، کە لە هەندێ پرسدا شوێنی قسەی مەزهەبێکی تر بکەوێت، چونکە لەسەری پێویست نییە، کە پابەند بێت، بە سەرجەمی ئیجتیهادەکانی ئەم مەزهەبەی خۆیەوە، بەڵام بەو مەرجەی کە ئەم وەرگرتنی ڕای مەزهەبی ترە، بە بەڵگەوە بێت، کە بووبێتە هۆکاری لادانی لە مەزهەبەکەی خۆی لە هەندێ لەو پرسانەدا، هەروەك بۆی هەیە،

که پرسیار له هەر شەرعزانێك بکات، لە غەیری مەزهەبەکەی خۆی و لەسەر هەر حوکمێك و لەهەر پرسێکدا بێت و کار بەو فەتوایەش بکات، که بۆی دەردەکەن.

**شەشەم:** لەسەر کەسی تەقلیدکار پێویستە که دڵ و دەروونی خۆی له دەرمارگیری بێزراو بۆ مەزهەب پاك بکاتەوە، چونکە مەزهەبەکان دابەشکردنی ئیسلام نین، هەروەها ئاینی سرپیار (ناسخ)ی، ئاینی ئیسلام نین، بەڵکو ئاراستەوانی ڕاڤەکردنی شەریعەت و حاڵی بوون لێی و دەلاقەی گەیشتن بە ئیسلامن و ڕەوش گەلێکن بۆ گەڕان و توێژینەوە و تێگەیشتنی و شێوازی ئەکادیمین لە هەڵهێجاندا، و سەرجەمیان دەیانەوێت بگەن بە زانین و ناسینی ئەوەی کە خودای پەروەردگار ناردویەتی و کردوویەتی بە شەریعەت.

**حەوتەم:** هەرگیز بە ڕاجیایی ناو مەزهەبەکان تەنگەوتاو نابین، چونکە ڕاجیایی لە تێگەیشتن و هەڵهێنجاندا کارێکی سروشتی و بەڵگەنەویستە، چونکە لەو شتانەیە کە عەقڵی مرۆڤ پێویستی پێی هەیە، چونکە لە ڕاستییدا عەقڵەکان و هەستەکان و تێگەیشتنەکان بە تەواوەتی لە یەکتری جیاوازن، بۆیە لە هەڵهێنجان و تێگەیشتنیشدا بێگومان جیاواز دەبن، بەڵکو ئێمە شانازی بەو ڕاجیاییە ئەکادیمی و زانستی و فیقهییەوە دەکەین، کە گەنجینەیەکی فیقهی زۆر گەورەی بۆ بەجێهێشتووین، بە بەڵگەی گەشەسەندنی فیقهـ، تەنانەت بە زیندوویی فیقهی دەزانین، و هەروەها بەڵگەیشە لەسەر بەرفراوانی بیرکردنەوەی شەرعزانە مەزنەکانمان، کە بە ئەرکی خۆیان هەڵساون بۆ خزمەتکردنی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام.

**هەشتەم:** دواجار لەسەرمانە کە قەدرو ڕێزی سەرجەمی موجتەهیدەکانمان لە مەزهەبە جیاوازەکان بزانین، و شکۆمەندییان ڕابگرین، و ڕێزیان لێ بگرین، و بە ئەدەب بین بەرامبەریان، و نزایان بۆ بکەین، و ئێمە باوەڕمان وایە، کە ئەگەر

پێكابێتیان، یان هەڵەیان كردبێت، هەر خاوەن پاداشتن، بەو شێوازەی كە خودای مەزن فێری كردووین، دەربارەیان دەڵێین: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾[1].

[1] سورة الحشر: ١٠، ئەوانەی هاتن و دێن، دوای ئەوان دەڵێن، خوایە لە ئێمەش و ئەو برا دینییانەشمان خۆش ببە، كە پێشمانكەوتوون لە برواداران، و هیچ ڕق و كینەیەك مەخەرە دڵمانەوە، دەربارەی برواداران، ئەی پەروەردگارمان، بە ڕاستی هەر تۆیت، بەخشندەی میهرەبان.

# بەشی سێیەم

# ڕاجیایی لە شەریعەتی ئیسلامدا

**- ڕێخۆشکردن:**

**٢٩٣- (شێخ الأسلام، ئیبن تەیمیە)، "ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، دەفەرموێت: (خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین، بە کۆبوونەوە و یەکبوون و هاوپەیمانێتی و ڕێگری لێ کردووین لە جیاخوازی و ڕاجیایی)،[1] ئەوەی کە "شێخ الأسلام"، فەرموویەتی، لە ڕاستییدا هەقیقەتێکە کە قورئان دەریبڕیوە و سوننەتی پێغەمبەریشی (صلی الله علیە وسلم) لەسەر هاتووە، و خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾[2]، و هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ ﴾[3].**

**لە سوننەتیشدا فەرموودەی زۆر لەم بوارەدا هاتووە، لەوانە ئەو فەرموودەیەی کە پێشەوا موسلیم لە پەڕاوە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە، کە تیایدا هاتووە کە دەفەرموێت: (.... ولا تختلفوا، فان من کان قبلکم اختلفوا فهلکوا)، واتە: ڕاجیایی و ناکۆکی مەکەن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە وایان کرد، بۆیە بە هیلاکدا چوون.**

---

[1] مَجموع فتاوى، شيخ الأسلام، إبن تيمية، ب١٩، ل١٦.

[2] سورة آل عمران: ١٠٣، هەمووتان دەست بە دینی ئیسلامەوە بگرن، تا لە کەوتنو هەڵدێران ڕزگار بن، و لە ناو خۆتاندا پەرتەوازە مەبن، وەك ئەهلی کیتاب، لە ناو خۆیاندا بوون، بە تاقم تاقم، یا مەبەست ئەوەیە وەك سەردەمی جاهیلیەت مەمێننەوە، کە بە گژی یەکترا دەچوون.

[3] سورة آل عمران: ١٠٥، ئەی مسوڵمانەکان! ئێوە وەك ئەو ئەهلی کیتابییانە مەبن، کە سەبارەت بە (خودا بە یەك زانین)، و (ئەحواڵی ڕۆژی قیامەت)، جیاوازی کەوتە نێوانیان، پاش ئەوەی کە ئایەتیان بۆ هاتو ڕێگای ڕاستیان پیشاندرا، و پێغەمبەران ئامۆژگارییان دەکردن!

له پەڕاوی پێشەوا تیرمیزیدا، فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) گێڕدراوەتەوە، کە تیایدا هاتووە، کە دەفەرموێت: (وید الله مع الجماعة، ومن شذَّ شذَّ إلى النار)، واتە: دەستی دەسەلاتی پەروەردگار لە گەڵ کۆمەڵدایە، و هەرکەس ڕیزپەڕ بێت، ڕووەو ئاگر مل دەنێت، جا ئەم دەقانە و هاوێنەکانیان لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاکی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، لە یەك شتدا کۆدەبنەوە، کە ئەویش بریتییە لە فەرمانکردن بە یەکڕیزی و یەکبوون و هاوپەیمانێتی، و ڕێگری کردن لە جوداخوازی و ڕاجیایی و ناکۆکی و ناتەبایی.

**ـ مانای (أخْتِلاف) و (خِلاف):**

**٢٩٤ـ** (أخْتِلاف)، جیاوازی و ناتەبایی لە زمانی عەرەبیدا، واتە: ڕێك نەکەوتن لەسەر شتێك، بە جۆرێك کە هەر یەکێك لەو کەسانە ڕێگایەکی تایبەت بەخۆی بگرێتەبەر، کە جیا بێت لە ڕێگای ئەویتریان، و لە سەرجەم ڕووەکانی حاڵەت و قسە و بیروڕاکانییەوە، کە دیسان هەر بە مانای ناڕێکی دێت، بۆیە هەر شتێك کە نایەکسان بوو، ئەوە ناتەباو ناڕێكو پڕ لە جیاوازییە، و(خِلاف)یش، هەر بە مانای دژایەتی دێت، و چاوگەکەی (مُخالفة) و (خلافاً)ـە، سەر بە بابی (مُفاعلة)یە، و لەفزی (خِلاف) هەر مانای لەفزی (أخْتِلاف) دەدات بە دەستەوە، هەرچەندە کە ماناکەی گشتی ترە لە مانای (أخْتِلاف)، چونکە (خِلاف) بە مانای (ضد: دژ) هاتووە، و مەرج نییە، کە هەموو دوو شتێکی جیاواز، دژی یەکتریش بن، هەرچەندە کە هەموو دوو شتێکی دژ، پێچەوانەی یەکترین و لێك جیاوازن.(١)

---

[١] لسان العرب، ب١، ل٤٣٠ و دواتر، المفردات، للراغب الأصفهاني.

٣٩٥- (أخْتِلاف) به مانا زاراوەییەکەی لە لای شەرعزانان بە مانای جیاوازی هاتووە، و لە بیرورا و ئایین و دین و بیرو باوەڕەکاندا، کە مرۆڤ، بە هۆیانەوە بەختەوەر دەبێت، یان بەدبەخت دەبێت، لە دواڕۆژ و دونیایشدا.[1]

٣٩٦- (خِلاف) دیسان هەمان ئەو مانایەی هەیە، کە وشەی (أخْتِلاف) لە بەکارهێنانی لای شەرعزانەکاندا هەیە، بەڵام (پێشەوا شاطبی) لە پەڕاوی (الموافقات)دا، بە لای ئەوەدا ڕۆیشتووە، کە (خِلاف)، بریتییە لەو ڕاجیایی و جیاوازییەی کە لە حەزو ئارەزووی گومڕاکانەوە سەرچاوەی گرتووە، نەك لە پشکنین و ئاشکراکردنی مەبەست و ئامانجی شەرعەوە، و ئەویش بە بەدواداچوون کردن، بۆ بەڵگە شەرعییەکان، بۆیە بێ بایەخە و سەنگی بۆ دانانرێت، چونکە لە ئارەزووەوە سەرچاوەی گرتووە، و هەر بەم شێوازەیش ئەو شتانەی کە جیاوازی لە گەڵ ئەو مانایانەدا کە شەریعەتی ئیسلامی بە یەکلایی و دڵنیایی (قَطعي و يَقيني) بڕیاری داوە، لە سەر دروستی و ساغیان، ئەمانیش بێ بایەخن، و شایانی گوێپێدان نین، بەڵام (أخْتِلاف)، لە لای (پێشەوا شاطبی) بریتییە لەو ڕاجیاییەی کە لە موجتەهیدەکانەوە دەرکەوتووە، لە بیروڕاکانیاندا سەبارەت بە پرسە ئیجتیهادییەکان ئەوانەی کە دەقی (قطعي)یان، لە سەر نییە، و یاخود هەر بریتییە لەوەی کە هەر خۆی دەڵێت، (أخْتِلاف) ئەو ڕاجیاییەیە کە لەو پرسانەدا دێتە پێشەوە کە لە نێوان دوو لایەنی ئاشکرا و دیاردا سەرهەڵدەدات، کە ئەو دوو لایەن و ئاراستەیە بە هۆی ناڕوونی هەندێ لە بەڵگەکان و بێ ئاگایی لەسەریان، لە دید و تێڕوانینی موجتەهیدەکاندا دەبێتە هۆی بەرپابوونی کێشمەکێش و ناتەبایی و دژیەکی.[2]

---

[1] الموافقات، للشاطبي، ب٢، ل١١٠ - ١٤٤.

[2] الموافقات، للشاطبي، ب٢، ل١١٠ - ١٤٤.

٢٩٧- له ڕاستییدا، ئەم جیاوازییەی کە (پێشەوا شاطبی) فەرموویەتی، لە نێوان (خِلاف) و (أخْتِلاف)دا، تەنها زاراوەیەکە و بەس، و هیچ ڕشتە (سەنەد)ێکی، تیادا شك نابەین، و شەرعزانان (خِلاف) و (أخْتِلاف)یان، لە یەك مانادا بەکارهێناوە، کە ئەویش بریتییە لەو پرسەی کە شەرعزانەکان لە پرسەکانی ئیجتیهاددا، لەسەری کۆك و تەبا نابن، بە بێ ڕەچاوکردنی ڕێژەی پێکان و هەڵەکردن، یاخود ئەو ڕا ڕیزپەڕانەی کە لەسەری گوتراون و دەگوترێن، و نموونەی ئەم بەکارهێنانەیش، وەك ئەم فەرمایشتەی (شێخ الأسلام، ئیبن تەیمیە)، کە دەفەرموێت: "لە ژمارەیەك لە قیاسەکان زۆر بەهێزترە، کە ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە لە باس و توێژینەوەی مەزهەبەکان و ڕاجیایی (خِلاف)ەکانی، ناو زانستی ئوصولی فیقهدا، ڕۆچوون، حەزیان بەلایدا هەیە"،[1] و هەروەها دەفەرموێت: "ڕاجیایی (خِلاف) لە نێوان زانایاندا نییە، کە لەسەریان پێویست نییە"،[2] و لە پەڕاوی (المُقَدّمَة)ی، ئیبن خەلدووندا، هاتووە، کە دەڵێت: "بزانە کە لەم فیقهەوە کە لە بەڵگە شەرعییەکانەوە وەرگیراوە، موجتەهیدەکان بە هۆی جیاوازی هەستکردن و پەی بردن و تێڕوانینەکانیانەوە، دووچاری ڕاجیایی زۆر بوون، کە دەبێت هەردووچاریشی ببن، بە بەڵگەی ئەو زانیارییانەی کە پێشتر باسمان کردن".[3]

جا لە قسەکانی (شێخ الأسلام، ئیبن تەیمیە)، و (ئیبن خەلدوون)ەوە، ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە مەبەست لە ووشەی (خِلاف) بریتییە لەو ڕاجیاییەی کە لە شەرعزانەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، بە بێ ڕەچاوکردنی بەهاکەی و ئاستی پێکان و هەڵەکردن تیایدا، و هەر ئەمەیشە مانای (أخْتِلاف).

---

[1] مَجموع فتاوی، إبن تیمیة، ب٢، ل٤٢.

[2] مَجموع فتاوی، إبن تیمیة، ب٣، ل١١٧.

[3] مُقدمة إبن خَلدون، ل٤٥٦.

**ـ ئەوەی کە لە پرۆسەی دوورەپەرێزی لە ڕاجیایی (النهي عن الإختلاف) دەستمان دەکەوێت:**

٣٩٨ ـ کە ئیسلام فەرمانی کردووە، بە کۆکبوون و هاوپەیمانێتی و ڕێگری کردووە، لە جیاوازی و ڕاجیاوازیی، جا ئەم ڕێگریکردنە و ئەو فەرمانکردنە، بەڵگەن لەسەر چەند شتێکی گشتی، لەوانە:

**یەکەم:** ڕاجیایی (أخْتِلاف) پرسێکە، دەکرێت کە لە نێوان مرۆڤەکاندا ڕوو بدات، چونکە ئەگەر ڕوودانی نەگونجاو (مُستحیل) بوایە، ئەوا شەریعەتی ئیسلامی ڕێگری لێ نەدەکرد، و داوای لە کەسانی ئەرك لەسەر شان (مُكَلّف) نەدەکرد، کە وازی لێ بهێنن و نەکەونە ناوییەوە، چونکە نەهی کردن و ڕێگری کردن لە کەوتنە ناو شتی نەگونجاو (مُستحیل) کارێکی هەوانتەیە، بێگومان شەرعی کاربەجێی ئیسلام و خوای مەزن لە گشت جۆرە هەوانتەیەك بەدوورن!

**دووەم:** جا کە هاتووە، ڕاجیایی (أخْتِلاف) شتێك بوو، کە ڕوودانی و سەرهەڵدانی لە مرۆڤەوە کارێکی ئاسایی بوو، کەواتە دیسان دەکرێت، کە خۆمانی لێ بپارێزین و لێی دوورەپەرێز بین، و دەکرێت کە دژە ڕاجیایی کە (کۆکبوون: إتفاق)ـە، ئەنجام بدەین، هەروەك ئەوەیش لە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامییەوە زانراوە، کە ئەرك ئەوەندەیە بە ئەندازەی توانا دەخرێتە سەرشان و لە شتی نەگونجاو (مستحیل)دا، ئەرك خستنە سەرشان ڕوو نادات و نابێت بکرێت.

**سێیەم:** لە کاتێکدا کە ڕاجیایی (أخْتِلاف)، لە شەریعەتی ئیسلامیدا، ڕێگری لێ کراوە، کەواتە کارێکی سەرزەنشتکراوە، چونکە لە بنەمادا یاسا وایە کە سەرزەنشتکردن (الذم)، و ڕێگری لێکردن (نهی) بە دوادا دێت، و یاخود لە هاوشانیدا دێت، مەگەر لە پرسە هەڵاوێرکراوەکاندا (إستثنائي).

**چوارەم:** کە هات و ڕاجیایی (أخْتِلاف) کارێکی ڕێگری لێکراو و سەرزەنشتکراو بوو، هەر کەسێ کەوتە ناوییەوە، یاخود گیرۆدەی بوو، و ڕەنگی ڕاجیایی گرت، ئەوە بەرپرسیارێتی لەسەر شانە و سزای لەسەرە، هەروەك یاسای شەرع، سەبارەت بە کردنی کارە ڕێگری لێکراوەکان و سەرزەنشتکراوەکان وایە.

**- چەند پرسیارێك لە خۆمان:**

**۳۹۹-** هەروەك گوتمان کە ڕاجیایی (أخْتِلاف) دەکرێت، ڕوو بدات، دەشکرێت خۆمانی لێ بپارێزین، هەروەها کارێکی ڕێگری لێکراوە و سەرزەنشتکراوە، و خاوەنەکەی تووشی سزا دەبێت، جا لێرەدا پرسیار لە خۆمان دەکەین، لەسەر ئاستی گونجانی ڕوودانی ڕاجیایی لە نێوان مرۆڤەکاندا، بەو مانایەی کە ئەم ڕوودانەی دەگمەنە یان زۆرە، و یاخود گەیشتووە بەو پلەیەی کە هەر دەبێت ڕوو بدات، و یاخود تا چەندە پێویستە کە ڕوو بدات؟ ئایا یاخود مسوڵمانان لە ڕوودانی ئەم ڕاجیاییە لە نێوان خۆیاندا پارێزراون و هەڵاوێر کراون لەو بنەمایە، یان....؟ دواتر ئایا ڕاجیایی یەك جۆرە، یان چەند جۆرێکە؟ ئایا سەرزەنشتکردن سەرجەمی ئەو جۆرانە دەگرێتەوە، "ئەگەر چەند جۆرێك بن"، یاخود تەنها چەند دانەیەکیان دەگرێتەوە؟ دواتر ئایا فاکتەرەکانی ڕوودانی ئەم ڕاجیاییە چییە؟ و چۆن دەکرێت خۆمانی لێ بپارێزین؟ و ئایا سزا سەرجەمی ڕاجیاکاران دەگرێتەوە؟ و چەندەها پرسیاری تر کە دێن بە هزری مرۆڤدا، و لەم بابەتەدا، کە هەموو پرسیارێکیان چەندەها لق و چڵی شێوە پرسیاری تری زۆری لێ دەبێتەوە.

لەڕاستییدا ئەم باسە زۆر بەرفراوانە، و لە توێژینەوەیەکی سادە و یاخود لە نووسینی وتاری ناو گۆڤارێکدا، و بەم بەرفراوانییە جێگای نابێتەوە، و کۆنترۆڵ ناکرێت، بەڵام سەرەڕای ئەم بەرفراوانییە، من لێرەدا وام بە باش زانی کە لەم بوارەدا پوختەباسێك بنووسم، و درێژە باس و خستنەڕووی تەواوی بابەتەکە هەڵدەگرم بۆ جێگایەکی تر، إن شاء الله.

# یەکەم: ڕوودانی ڕاجیایی ( وقوع الإختلاف )

**ـ سروشتی مرۆڤ:**

٤٠٠ ـ مرۆڤەکان لە هەڵکەوتە و شێواز و ڕەنگدا جیاوازن، بە جیاوازییەکی زۆریش، بە جۆرێك کە هەرگیز ناتوانین دوو کەس هاوشێوەی تەواو و وەك یەك لە لاشە و هەڵکەوتەدا بدۆزینەوە، و لەڕاستییدا ئەم جیاوازییە لە گەورەترینی بەڵگەکانن لەسەر گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار، و قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بەو جیاوازییە کردووە، و ئاگاداری لەسەر دەلالەتەکیشی داوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ﴾[1]، پاشان جیاوازی مرۆڤەکان تەنها لە شێوە و شێوازدا نەوەستاوە، بەڵکو بۆ لایەنی دوورتر و ترسناکتریش درێژ بووەتەوە، واتە، بەخششەکان و ئامادەسازییەکان و حەزەکان و لایەنگیری و ژیری و زیرەکی و هەستکردنەکان و سروشت و ئارەزووەکان و ڕەهەندی ترسناکی تر، کە ناواخنی ڕاستەقینەی مرۆڤ پێك دەهێنن و جیاوازی مرۆڤەکان لەم بوارەدا زۆر زۆرە، و کۆنترۆڵ کردنی و باسکردنی هەموو نەگونجاوە و لە تواناەدا نییە، و بەڵکو خودی مرۆڤەکەیش ناتوانێت کە پەی ببات بە ناواخنی دەروونی خۆی، و ئەوەی هەیەتی لە حەزو ئارەزووەکان و ئەندێشە و خورپە و ئاڕاستەگیری و هەڵچوونەکان و گۆڕانکارییەکان و فاکتەرەکانی ڕازی بوون و تووڕەیی و خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوە، و پێشڕەوی و پاشکەوتەیی و هتد.... کە ئەمانە هەموو لە دەروونی مرۆڤدا شەپۆل دەدەن، و هەر لەبەر ئەم ڕاستییەیش بوو، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە نزاکانیدا

---

[1] سورة الروم: ٢٢، هەندێ لە ڕابەر، و بەڵگەڕوونەکانی خوای گەورە، دروستکردن و فەراهەم هێنانی ئاسمانەکان و زەوییە، و هەندێکی تر، لە بەڵگە، و نیشانە ڕوونەکانی خودا، جیاوازی زمان و ڕەنگتانە، کە هەر یەکەو جۆرێکە.

بەردەوام ئەم دەقەی یاخود هاوشێوەی ئەم دەقەی دەفـەرموو: (یـا مقلـب القلـوب، ثبت قلبـي علـى الإيمـان)، واتـە: ئـەی ئـەو زاتـەی کـە گۆڕانکـاری بەسـەر دڵەکانـدا دەهێنیت، دڵم لەسەر باوەڕ جێگیر و دامەزراو بکە.
پاشان لێرەدا بە ڕۆچوونی نازانم کە بڵێم، مـرۆڤ ئەگـەر بیـەوێت کـە دڵ و دەروونـی خۆی وەسف بکات و ناواخنەکەی بخاتـە ڕوو، ئـەوا دەستەوسـانە لـەم کـارە و ئـەم جیاوازییە زۆرانەیش مەزنترین بەڵگەن لەسەر دەسەڵاتی خوای پەروەردگار.
٤٠١. لە ڕوانگەی ئەم جیاوازییەی نێوان مرۆڤەکانەوە، جیاوازی و ڕاجیایی ئـەوان لـە بـیروڕا و تێڕوانینـەکان و بیروباوەڕەکانـدا سەرچـاوەی گرتـووە، و هـەروەها ئاسـان بینینی ڕاستی و هەست پێکردنی و ڕووبەڕوو ڕۆیشتنی و یـان دوور لێکەوتنـەوەی و خۆشەویستی بۆی، و یاخود ڕقبوونەوە لێی، و یان بڕین بۆی، و یاخود بەسـەریەوە بڕین، ئەمانە هەموو لە مرۆڤەکاندا جیاوازن، تا کار گەیشتووەتە ئاستێك کە هەنـدێ کەس گەیشتووەتە پلەی نابینـایی ڕەهـا، لـە ئاسـت بینینـی ڕاسـتییدا و نکۆڵی لـە بوونی ئەو بەدیهێنەرە مەزنە دەکات، کە خوای پەروەردگاری جیهانیانە، و تەنانەت هەندێ کـەس هـەر نکۆڵی و ئینکـاری بـوونی خـوا دەکـەن، و خـەریکی پەرستشـی غەیری خوا دەبن، لە پەرستنی مانگا و بەرد و درەخـت و مـرۆڤ، ئەمـەیش بەڵگەیـە لەسەر ئاستی بـوونی ئـەوەی کـە لـە دەروونـی مرۆڤـدا هەیـە، لـە ئامادەسازییەکی ترسناك بۆ ڕۆچوونە ناو گومڕایی و نەزانی و گەمژەیی، و شـتێکی بەڵگەنەویستیشـە کە ئەم ڕاجیاییە لە بیروڕا و تێڕوانین و بیروباوەڕدا، لە نێوان مرۆڤەکاندا، ئیـدی بـێ سەروبەری و جیاوازی و بەختەوەری و بەدبەختی دنیاو دواڕۆژی بەدوادا دێت.

## - ڕاجیایی "إختلاف" شتێکە دەبێت، هەر ببێت و ڕوو بدات:

٤٠٢- ئەو ڕاجیاییەی کە باسمان لێوە کرد، یەکێکە لە پێداویستییەکانی ڕەوش و پێکهاتەی مرۆڤ، و ئەگەر خوا بیویستایە ئەوا مرۆڤی سەرجەم لەسەر یەك شێواز دروست دەکرد، و لەبەریەك فۆتۆکۆپی دەکردنەوە، و یەك وێنەی لە سەرجەمیان دەنەخشاند، بەڵام خوای پەروەردگار ئەمەی نەویستووە، چونکە ئەگەر بەم شێوازەی بکردایە، ئەوا مرۆڤ، بەم شێوازە نەدەبوو، کە دەیبینین، و نەژادێکی تری دەبوو، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾[1].

جا لە تەفسیری (پێشەوا فەخرەدینی ڕازی)دا، سەبارەت بە شرۆڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتووە، کە دەفەرموێت: "مەبەستی جیاوازی و ڕاجیایی خەڵکییە، لە ئایین و ڕەوشت و کردەوەکاندا"،[2] جا خوای پەروەردگار ئەگەر بیویستایە ئەوا سەرجەمی خەڵکی لەسەر یەك سروشت و شێواز و توانا دروست دەکرد، بە بێ بوونی هیچ جۆرە جیاوازی و ناکۆکییەك لە نێوانیاندا، و ئیتر لێرە بەدوایشەوە جیاوازای لە بیروهزر و بیروباوەڕیشیاندا دروست نەدەبوو، بەڵام خوای مەزن ئەمەی

---

[1] سورة هود: ١١٨ – ١١٩، ئەگەر پەروەردگارت ویستبای هەموو خەڵکی دنیای دەکردە یەك ئوممەت، و یەك کۆمەڵ، و هەموو دیندار، و مسوڵمان دەبوون، بەڵام لەبەر هەر حیکمەتێك، کە خۆی دەیزانێ، ئەو کارەی بەو شێوەیە نەکرد، و لەولایشەوە ئەگەر وای کردبا (جەبر، و زۆر) ڕووی دەدا، ئیتر ئەو کاتەیش پاداشت و تۆڵە نەدەبوو، بەڵام بە درێژایی ڕۆژگار، هەر ناتەبا، و ناکۆك و لێك ترازاو دەبن، و لە سەر یەك بەرنامەو ئایین کۆ نابنەوە(١١٨) مەگەر کەسێك پەروەردگارت بەزەیی پیا بێتەوە، و بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، و لەو ناکۆکیی و هەراو کێشەیە دوور ڕاییگرێت، و دیارە ئەو کەسانە هەرگیز کێشە دروست ناکەن، و لە ناو یەکدا ناکۆك نابن، و لە بنەڕەتدا، بۆ ئەوە دروستی کردوون، بکەونە بەر سۆز، و میهرەبانی خۆی، و لەو دەستەو کۆمەڵە بن، کە خودا میهرەبانیی لە گەڵدا کردوون، و ناتەبا، و پەرتەوازە نەبوون.

[2] تفسیر الرازي، ب٨، ل٧٦.

نەویستووە، چونکە ئەو جۆرە مرۆڤەی کە لەسەر زەوی بوونی هەیە، ئەمە سروشتی نییە، بۆیە بەم شێوازەی دروست کردن، کە ئێستا هەن، جا ئەو ڕاجیاییەی کە لەم جۆرە دروستکرانە سروشتییەوە سەرچاوەی گرتووە، و گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە تەنانەت جیاوازی لە ڕاستییە ئاشکرا و ڕوونەکانیشدا دەربکەوێت، لەم جیاوازی و ڕاجیاییە ناپەسەندەیشەدا، تەنها ئەوانە بە ساغی دەرچوون، کە میهرەبانی خودا پیایاندا ڕاگەییوە، و ڕێگای ڕاستیان دۆزیوەتەوە، و لەسەر پرسی هەق و ڕاستی ڕاجیاییان نییە، بەڵکو کۆکن لەسەری، و هەرچەندە لە گەڵ خەڵکانی ناهەقدا ڕاجیاییان هەیە، لەکاتێکدا کە ڕەوتی ناهەقی، لە ناو خۆیشیاندا هەر جیاوازن و ڕاجیان.[1]

(پێشەوا ئەبوبەکری ئاجوری)، دەفەرموێت: خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا، ئەوەی فێر کردووین کە دەبێت هەر ڕاجیایی لە نێوان دروستکراوەکانیدا هەبێت، ڕوو بدات، تا کەسانێك کە خودا دەیەوێت گومڕا ببن، ئەوانەی کە دەیەوێت ڕێگای ڕاست بگرینەبەر، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی هێناوە، کە دەفەرموێت:﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾[2]، [3].

٤٠٢- جا لێرەدا ئەوەی کە شایەنی باسە ئەوەیە کە ئەوەی گوتمان سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ، و ئەوەی لێیەوە سەرچاوەی دەگرێت، لەوەیدا کە هەر دەبێت ڕاجیایی لە نێوانیاندا ڕوو بدات، ئەمە ناکاتە ئەوەی کە ئەو جیاوازییە دەبێت هەر

---

[1] فتح البيان في مقاصد القرآن، للسيد صديق حسن خان، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی تیادایە، و هەروەها پەراوی (في ظلال القرآن)ی، شەهید سەیید قوطب، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، ب١٢، ل١٤٩.

[2] سورة هود: ١١٨ ، ئەگەر پەروەردگاری مەزن، ویستبای هەموو خەڵکی دنیای دەکردە، یەك ئوومەت!

[3] كتاب الشريعة، للآجري، ل١٤.

بەبێ بەند و مەرج، و بە بێ گومـان و لەسـەرجەمی کـات و سـات و دۆخەکانـدا ڕوو بدات، هەروەك ئەمە ناکاتە ئـەوەی کـە ئیـدی هـەرگیز ناگونجێت، کـۆکی و تـەبایی هەرچەندە کاتییش بێت، لە نێوان مرۆڤەکاندا بێتە ئاراوە، هـەروەها ناکاتـە ئـەوەی کە کۆکبوونی مرۆڤەکان لە نێوان خۆیاندا لەسـەر هـەق و ڕاسـتی کـارێکی مـەحاڵ و نەگونجاو بێت، بەڵکو ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوەی گوتمان لـە جیـاوازی نێـوان مرۆڤەکان لە سروشت و حەز و هەستکردن و هتد....  یاندا، ئەمە ئامادەسـازییەکی پێویستی وا لە مرۆڤدا دروست دەکات، کە لە دوای سـازبوونی بـارودۆخ و هاتنـەدی مەرجەکان و فاکتـەرەکان، و لاچـوونی ڕێگرییـەگان، ئـیتر مرۆڤــ، ڕووە و ڕاجیـایی ناپەسەند مل بنێـت، بـەڵام ئەگـەر سروشـتی تەندروسـتی مرۆڤــ، مابوویـەوە، ئـەوا مرۆڤــ، هەست بە ڕاستی دەکات و ئیدی فاکتەرەکانی ڕاجیـایی ناپەسـەندی لەسـەر لادەچێت، چونکە خودای مەزن لەسەر ناسینی زاتی خوا و هەستکردن و پەی بـردن بە ڕاستی و حەقیقەت دروستی کردوون، بەڵام ئـەم سروشـتە دەکرێـت کـە جاروبـار پیس ببێت و لابدات، و هەق نەبینێت، و دواجار خاوەنی سروشـت گـەلی لـەو جـۆرە تووشی ڕاجیایی ناپەسەند ببن، و هەروەها بە لاڕێدا ڕۆیشتنی مرۆڤیش هەر شـتێکی چاوەڕوان کراوە، چونکە مرۆڤــ، دروستکراوە، لە سەر شێوازێك، کە بە لاڕێدا چوون لە گەڵی گونجاوە و بۆی هەیە، کە تیایـدا ڕوو بـدات، و سـەرجەمی فەرمایشـتەکانی خودا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵگـەن، لـە سـەر ئـەم ڕاسـتییە، و خـوای پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1].

---

[1] سورة الروم: ٣٠، دەی ڕووی خۆت ڕاست بکەرە ئاینی ئیسلام، بە جۆرێ کە لا بدەی، لە هەموو کارێکی بەتاڵ

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ وَيُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟ حَتَّى أَنْتُم تجدونها)، واتە: هەموو کەسێك کە لە دایك دەبێت، هەر لەسەر سروشتی پاکیی و یەکتاپەرستی دێتە بوون، ئەوە باوك و دایکینی کە دەیکەنە، جوولەکە، یان گاور، یان زەردەشتی، و هەروەك چۆن ئاژەڵ بێچوویەکی تەواو ساغ دەهێنێتە دنیاوە، ئایا لەو بێچووەدا هیچ ناکاملّی و ناتەواوییەك بەدی دەکەن؟! ئەوە ئێوەن کە گوێ یان لووتی دەبڕن، و کەموکورتی تێدەخەن، جا ئەم باسە هاوشێوەی ئامادەسازیی مرۆڤە، بۆ بەدەستهێنان، یاخود لەدەستدانی سەلامەتی و شیفا، لەکاتی سازبوونی فاکتەرەکان و مەرجەکانی بەدەستهێنان، یاخود لەدەستدانی ئەو شتە.

## ـ ڕاجیایی نێوان مسوڵمانان:

٤٠٤ـ کە هات، ڕاجیایی نێوان مرۆڤەکان یەکێك بوو، لە پێداویستییەکانی سروشتی مرۆڤ، لە سەر ئەو شێوازەی کە ڕوونمان کردەوە، ئایا ئەم حاڵەتە مسوڵمانانی تووشی ئەوە کردووە، کە ئیتر ئەوانیش، وەك خەڵکی تر جیاوازی و ڕاجیایی لە نێوانیاندا هەبێت و ئاسایی بێت؟!

لە ڕاستییدا قورئانی پیرۆز داوای بێداری لێکردووین، لە ڕاجیایی کردن لە نێوان خۆماندا، و سزایشی لەسەری بۆ داناوین، و هەروەها سوننەتی پاکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هۆشداری لەم بارەیەوە پێداوین، و سەرەڕای ئەمەیش ڕاجیایی ئەبێت، هەر لە نێوان مسوڵماناندا ڕوو بدات، هەروەك چۆن پێغەمبەر (صلى

---

، لە سەر ئەو فیترەت، و سروشتە پاکەی خودا، کە دروستکراوەکان (مەخلوق)ـی، لە سەر دروست کردووە، و کەس ناتوانێت، ئەوەی خودا کردی، بیگۆڕێ ، ئەمەیە ئاینی ڕاست، بەلّام بەشی زۆری خەڵکی نازانن.

الله عليه وسلم) بەڵێنی داوە، کە دەفەرموێت: (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرٍ لَاتَّبَعْتُمُوهُمْ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: (فَمَنْ)،[1] واتە: (بێگومان لەمەولا دەکەونە شوێن خوو نەریتی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون، بست بە بست و، گەز بە گەز، تاوەکو بە رادەیەک، ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن، بە کوندا ئێوەش شوێنیان دەکەون!)، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، مەبەستت گاور و جولەکەکانە؟ فەرمووی: (ئەی کێ؟)، واتە: بەڵێ! شوێنی ڕەوشتی ئەوان دەکەون، و بێگومان ڕەوشت و نەریتی خەڵکان و گەلانی پێشوو، بریتی بووە، لە جیاوازی و ڕاجیایی و کێشمەکێش، هەروەك لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێت: (افترقت اليهود على احدى وسبعين فرقة، وَ تفرقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة، وتفرّقت أمّتي على ثلاث وسبعين فرقة)[2]، واتە: جوولەکە ڕاجیاییان تێ کەوت، و دابەشبوون بۆ حەفتا و یەك گرووپ، و گاورەکانیش هەروا، دوای جیاوازی تێکەوتن بوونە حەفتا و دوو گرووپەوە، ئوممەتی منیش جیاوازییان تێ دەکەوێت، و دەبنە حەفتاو سێ گرووپەوە.

٥٠ـ جا لێرەدا، لەوانەیە بگوترێت ئەگەر لە زانستی خوادا بووە، و هەروەها پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: کە ئەم جیاوازی و ڕاجیاییە لە نێوان مسوڵمانانـدا ڕوو دەدات، ئیتر هۆشداری دانی ئەوان لە ڕاجیایی چ حیکمەت و فەلسەفەیەکی تیادایە؟

وەڵامی ئەمەیش ئەوەیە کە ئەو جیاوازی و ڕاجیاییەی کە ڕوو دەدات، تەواوی ئوممەتەکە، ناگرێتەوە، و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی پێداوین کە: (لا

---

[1] مُختصر صحيح مُسلم، لِلمنذري، ب٢، ل٢٩١.

[2] فيض القدير، شرح الجامع الصغير، للمناوي، ب٢، ل٢٠.

تزال طائفة من أُمّتي ظاهرين على الحق، لا يضرّهم من خالفهم حتّى تقوم الساعة)، واته: بەردەوام کۆمەڵێك هەن لە ناو ئوممەتەکەمدا، کە لەسەر ڕەوتی ڕاست بەردەوامن، و دژایەتیکارانیان ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن تا ڕۆژی دوایی، یاخود فەرمایشتێکی هاوشێوەی لەمەی فەرمووە، درودی خوای لە سەربێت.

بێگومان هۆشداریدان لە جیاوازی و ڕاجیایی سوودی بۆ ئەم کۆمەڵە هەیە، بۆیە هەر بە دەستگرتن بەو حەقەوە دەمێننەوە، و کۆکن لەسەری و ڕاجیایی تیادا ناکەن، و هەروەها تەنها بوونی زانست بەوەی کە خوا پێی ناڕەحەتە کە (ڕاجیایی)یـــە، و ئەوەی خوا حەزی پێ دەکات، کە (یەکبوون) و تەبایی و داننان بە ڕاستی ئەو هەواڵەیدا کە خوا پێی داوین، گشت ئەمانە خێروبێرن بۆ مسوڵمانان، چونکە دڵنیایی زیاتریان تێدایە بۆ مسوڵمانان، و سەبارەت بە هەواڵەکانی شەریعەتی خوا کە ڕایگەیاندوون، و پاشان ئەم هۆشدارییە دانە لە ماناکانی پەیامی خودان و بێگومان زانراوە کە گەیاندنی ماناکانی پەیامی پەروەردگار، واجبە، هەرچەندە کە لە زانستی خوای پەروەردگاردا هەبووە، کە هەندێ لە خەڵکی یاخود هەموویان، وەڵامیان نابێت بۆ ئەو مانایانە، و یاخود بۆ هەندێکیان، و پاشان بەرپرسیارێتی، ئەوەی بەدوایدا دێت، لە سزا، تەنها لە دوای ڕاگەیاندنەکەوە دەبن و جێبەجێ دەکرێن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾[1]، کەواتە هەر دەبێت هۆشداری بدرێت، لە ڕاجیایی و پەرتەوازەیی و ڕێگری لێ بکرێت، تا وەك بەڵگە و حوجەجە بەسەر خەڵکییەوە هەبێت.

---

[1] سورة الإسراء: ١٥، ئێمە تۆڵە، و سزای هیچ خەڵکێکمان نەداوە، تا پەیامبەرێکمان بۆ نەناردبن، ڕێیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە!

## دووەم: جۆرەکانی ڕاجیایی و ڕاجیاییکاران

**- جۆرەکانی ڕاجیایی:**

٤٠٦ - پێشتر گوتمان، کە ڕاجیایی نێوان مرۆڤەکان کارێکی سروشتییە و هەرکات هۆکارەکان و بارودۆخەکەی هاتەدی، ئەوا ئەو ڕاجیاییەش سەرهەڵدەدات و بەرجەستە دەبێت، بۆیە هەرکات ڕوویدا جێگای سەرسوڕمان نییە، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە ئەمە ناکاتە ئەوەی کە سەرجەمی جۆرەکانی ڕاجیایی سەرزەنشتکراوو خراپ بێت، و یاخود سەرجەمی ڕاجیاییکاران خراپ بن، بەڵام لەڕاستییدا ئەم پرسە پێویستی بە درێژەباسی زیاتر هەیە، چونکە بە بەدواداچوونی دەقەکانی شەریعەت، حاڵ و باڵی ڕاجیاییکاران بۆمان دەردەکەوێت، کە ڕاجیایی (أِختلاف) سێ جۆرە:

**یەکەم:** ڕاجیایی و ڕاجیاییکارانی سەرزەنشتکراو.

**دووەم:** ڕاجیایی و ڕاجیاییکارانی ستایشکراو.

**سێیەم:** ڕاجیاییەکی دروست و وەرگیراو، و ڕاجیاییکارانی ئەم جۆرەیش خاوەنی پاداشتی خۆیانن.

### یەکەم: ڕاجیایی سەرزەنشتکراو (الأختلاف المذموم):

٤٠٧- ئەمەیش دیسان چەند جۆرێکە و خراپترین و ناشیرینترینی ئەم جۆرە ڕاجیاییە سەرزەنشتکراوانە، بریتییە لە ڕاجیایی کافرانە، چونکە بەم هۆیەوە مرۆڤەکان دابەش دەبن بۆ ئەوانەیان کە بڕوایان بە خودای مەزن هەیە و ئەوانەی کە بڕوایان پێی نییە، و هەروەها بۆ ئەوانەی کە باوەڕدارن بە خودا و پەیامەکەی و ئەوانەیان کە باوەڕدار نین، بە خوداو پەیامەکەی، و قورئانی پیرۆزیش لە چەندەها ئایەتدا، ئاماژەی بەم ڕاجیاییە کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿ هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي

﴿رَبِّهِمْ﴾[1]، ڕاڤیار (ئیبن کەثیر)، لە تەفسیرەکەیدا ئاماژەی بەوەداوە، کە مەبەستی پەروەردگار لە (هَٰذَانِ خَصْمَانِ) ئەو دوو گرووپە، بریتین لە باوەڕداران و بێباوەڕان، و ئەوەیشی گوتووە، کە ئەم ڕایە لە (موجاهید) و (عطاء)ـەوە، گێڕدراوەتەوە، و ڕای هەڵبژێردراوی (طبری)یە، و ئیبن کەسیریش بە ڕای لە پێشتری داناوە، و هەروەها ئەمە ڕای (زەمەخشەری)، دانەری تەفسیری (کشاف)ـە، و پێشەوا (فەخرەدینی ڕازی)یش، ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە، کە گوتوویەتی: مەبەستی کۆمەڵی بڕواداران و کۆمەڵەکانیانە، لە گەڵ بێ باوەڕان و گرووپەکانیان، و سەرجەمی کافران دەچنە ناو ئەو دەستەواژەیەوە،[2] و شتێکی ڕوونیشە، کە بێ باوەڕان پێچەوانەی بڕواداران، و پێچەوانەبوونەوە، و ڕاجیاییەکەیشیان سەرزەنشتکراوە.

٥٠٨ـ یەکێکی تر لە ڕاجیاییە سەرزەنشتکراوەکان، ڕاجیایی گرووپەکانی شوێنکەوتەی ئارەزوو و بیدعەچییەکانن، کە خۆشیان دەدەنە پاڵ بەرنامەی ئیسلام، بۆیە بە شوێنکەوتەی ئارەزووەکان (أهل الأهواء) ناوزەد کراون، چونکە شوێن ئەو دەستە دەکەون، کە نەفسیان داوای دەکات و دژی ڕێگای ڕاستیشە، بەڵام بە مانای ئاماژە دووری ناڕەوا دەیشەرعێنن، کە ئەم کارەیش دەروونی مرۆڤی بڕوادار وەریناگرێت، مەگەر کاتێك کە ئەو دەروونە تێکەڵی ئەو ئارەزووپەرستییە ببێت.

---

[1] سورة الحج: ١٩، ئەم دوو دەستە، و تاقمە کە (کافر)، و (مسوڵمان)ـن، لە بارەی خوای مەزنەوە، دوژمنی یەکن، و هەرایانە، (کافرەکان) هاوبەشی بۆ دادەنێن، و بتەکانیان دەکەن، بە هاوبەش، و (مسوڵمانەکان)یش، دەڵێن، کەس هاوبەشی نیە.

[2] تفسیر إبن کثیر ب٣، ل٢١٢، تفسیر الکشاف، ب٣، ل١٥، تفسیر الرازي، ب٢٥، ل٢١.

نموونەی ئەم گرووپانەیش وەك (خەواریجەكان)، كە قورئانیـان بـە پێـی ئـارەزووی خۆیان ڕاڤە دەكرد، دژی ئـەو ڕاسـتییە دەوەسـتانەوە كە كۆمـەڵی مسـوڵمانانی لـە سـەر بـوو، و لێیـان جیادەبوونـەوە و خـوێنی ئیمانـدارانیان حـەڵاڵ دەكـرد، و فـەرموودەی زۆریـش لـە بـارەی سەرزەنشـتكردنی خەواریجـەكان و لادانـی شـەڕو خراپـەیان و تەنانـەت كوشتاركردنیشـیان هـاتووە، و پوختـەی ئـەو فەرموودانـەیش ئەوەیـە كـە مرۆڤـ، هـەركات بـووە شـوێنكەوتەی ئارەزووەكـانی ئـیتر ئـەوە لەناوجەرگەی گومڕاییدا دەگەوزێت، و تەنانەت ئەگەر خاوەنی خوداپەرستی زۆریش بێت، بۆیە (ئیبن عەبباس)، "خوا لە خۆی، و باوكیشی ڕازی بێت"، كاتێك كە باسی خەواریج و كۆششەكانیان و نوێژەكانیان كرا بۆی، فەرمووی: "ئەوانە لـە جولەكـە و گاورەكـان كۆششـی زیاتریـان لـە خوداپەرسـتییدا نـەكردووە، بێگومـان جولەكـە و گاوریش لەسەر ڕێگای گومڕایین".[1]

بەڵام سەبارەت بە گرووپی بیدعەچی و بیدعـەكاران، كـە ئـەمانیش بـە شـێوەیەكی گشتی كۆمەڵە شتێك لە ئیسلامدا دادەهێنن، كە خودا و پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیە وسلم)، وەك شەرع بەرجەستەیان نەكردووە، بۆیە دەكەونە ناو دژایەتی شـەرع و سوننەتەكانی ئیسلامەوە، (بیدعە)یش، لە زاراوەی شەرعدا، ئەو شتەیە كـە خـودا و پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، وەك شـەرع دەریـان نـەبڕیوە، و شـەرعی پـاكی ئیسلام فەرمانی پێنەكردووە، نەوەك ئەوەی كە (واجب) بێت و نە سوننەت، جا ئەو شـتانەی كـە شـەرع، وەك (واجـب)، و سـوننەت (مسـتحب)، فـەرمانی پێكـردوون و فەرمانەكەیشی بە بەڵگەی شەرعی پشتڕاست كردبێتەوە، ئەوە سەر بەو ئاینەیە كـە خودا، وەك شەرع دایناوە، و ئیتر چونیەكە، كە ئەو كارە لە سـەردەمی پێغەمبـەردا (صلی الله علیە وسلم) كاری پێ كرابێت، یاخود لەسەردەمی ئـەودا (صـلی الله علیـە

---

[1] الشریعة، للإمام أبي بكر الآجري، ل٢٨.

وسلم) كاری پیّ نەکرابیّت، بەلاّم لە دوای فەرمانكردنی ئەوەوە كاری پیّ كرابیّت، وەكو كوشتاركردنی هەلگەڕاوەكان و خەواریجەكان، كە ئەمەیش بە سوننەتی پیّغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دیّتە ئەژمار و لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا نییە، و هەروەها سوننەتی خەلیفەكانی ڕاشیدینیش (ڕەحمەتی خوایان لیّ بیّت)، سەر بە شەرع و ئایینی ئیسلامن، چونكە پیّغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی كردووە، بە شویّنكەوتنی سوننەتی ئەو خەلیفە ڕاشیدانە،(ڕەحمەتی خوایان لیّ بیّت)".[1]

٤٠٩- یەكیّكی تر لە ڕاجیاییە سەرزەنشتكراوەكان، ئەوەیە كە دەكەویّتە نیّوان ئەو كەسانەی كە وابەستە (مقلّد)ـی، مەزهەبە ئیسلامییەكانن، كە ئەم كارەیشیان وایان لیّ دەكات، كەوا بیر بكەنەوە، كە قسەی ئەو كەسەی كە شویّنی كەوتوون، هەقە و قسەی ئاڕاستە پیّچەوانەكانیان ناهەقە، و دواتر لەسەر ئەم ئەندیّشەیە ئەنجامگیری زۆر ترسناك و خراپیان لیّوە سەرچاوە دەگریّت، كە ڕەوشی سەقامگیری و یەك دوانگەیی گەلی ئیسلام تووشی پەرتەوازەیی دەكات، وەك ئەوەی كە نویّژ لە پشت سەری ئەو كەسەوە ناكەن، كە لە مەزهەبەكەی خۆیان نییە، و تەنانەت جاری وا هەیە، كە ئەم گرفتە بۆ دژایەتیش سەردەكیّشیّت، هەروەك لە سەردەمی ڕابردوودا ڕوویداوە، بیّگومان كە ئەم جۆرە ڕاجیاییەیش بە بیّ بوونی هیچ گومانیّك سەرزەنشتكراوە، و هیچ ڕوویەكی ڕاستی و دروستی نییە، چونكە مەزهەبە ئیسلامییەكان تەنها ڕوانگەیەكن بۆ شرۆڤەكردنی دەقەكانی شەرع، لە قورئان و سوننەتدا، و هەلّهیّنجانی حوكمەكان، لەسەر بنەمای ئەوان، بیّگومان لەسەر هەموو مسولّمانیّكیش پیّویستە كە گویّڕایەلّی و شویّنكەوتەیی بكات، لەوەی كە خودا ناردوویەتی و پیّغەمبەرەكەی (صلی الله علیه وسلم) ڕوونی كردووەتەوە، جا ئەگەر مسولّمان نەیتوانی كە خودی خۆی هەست بەمە بكات، ئەوا بۆی دروستە،(بەلاّم

---

[1] مَجموعَة الفتاوی، لإبن تیمیة، ب٤، ل١٠٨.

لەسەری واجب نییە)، کە ببێتە شوێنکەوتەی یەکێك لە مەزهەبە ئیسلامییە بڕواپێکراوەکان، کە پێشەواکانی شایەتی خوادۆستی و لەخواترسان و چاکە و شەرعزانی بۆ درابێت، و لەسەر ئەو کەسەی کە دەبێتە پەیڕەوکاری یەکێك لەم مەزهەبانە، پێویستە کە ئەوە بزانێت کە ئەو بەو پێودانگە دەبێتە پەیڕەوکاری ئەو مەزهەبە، کە ئەو مەزهەبە جێگای دەستکەوتنی بیروڕا دروستەکانە، و هەروەها جێگایەکە بۆ ناسینی شەرعی خوا، بەڵام ئەم جێگای ناسینی شەرع و ڕای دروستە، تەنها لەو مەزهەبەدا کورت هەڵنەهاتووە، کە ئەو پەیڕەوکاریەتی، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە زانا موجتەهیدەکان و ئەوانەی لەسەر ڕێی ڕاستن، لە ناو گەلی ئیسلامدا، لەم مەزهەبەدا زیاتر بوونیان هەیە و بڵاون، بۆیە هەرگیز بۆ کەسی (پەیڕەوکار، و لاسایی کەرەوە: مُقلِّد) دروست نییە، کە نکوڵی لە پەیڕەوکارێکی تر بکات، کە پەیڕەوی لە مەزهەبێکی تر دەکات، یاخود لەسەر ئەمە دژایەتی بکات، و ئەوەی کە ئەو کەسە لەسەریەتی بە تەواوی، بە بەتاڵی ئەژمار بکات، و نوێژ لە پشت سەرییەوە نەکات، ئەی ئایا نازانێت؟! کە پێشینە چاکەکانمان، تەنانەت ئەو پێشەوایەش کە ئەو بە پێشەوای مەزهەبی خۆی دەزانێت، کە هەندێکیان لە پشت سەری هەندێکی تریانەوە نوێژیان کردووە، هەرچەندە لە ڕووی فیقهییەوە ڕاجیاییان هەبووە؟!!

١٠ـ هەروەها جۆرێکی تر لە ڕاجیایی سەرزەنشتکراو، ئەوەیە کە لە نێوان پاڵپشتەکانی تەقلید، و نکوڵی کارانی تەقلیددا ڕوو دەدات، و جاری وا هەیە، کە کەسی (موقەلید: پەیڕەوکار)، کارێك واز لێ دەهێنێت، کە لە سوننەتدا هاتووە، لەبەرئەوەی کە مەزهەبەکەی دەرینەبڕیوە، وەك بەرزکردنەوەی دەستەکان لە نوێژدا، و لە کاتی چەمانەوە (ڕکوع)دا، وە لە کاتی هەستانەوە لێی، جا ئەوانەی کە پەیڕەوی لە سوننەت دەکەن، لەم کارەی نکوڵی دەکەن، بەڵام کابرای موقەلید

قسـەکەیان وەرناگرێـت، بـە بیـانوو و بەڵگـەی ئـەوەی کـە مەزهەبەکـەی ئـەو، ئـەو سـوننەتەی پشتڕاسـت نەکردووەتـەوە و دەرینـەبڕیوە، بۆیـە کـابرای پـەیڕەوکاری سوننەت خۆی لێ سوور دەکاتەوە، و توندی بەرامبەری دەنوێنێـت، جـاری وا هەیـە کـە دژایـەتی دەکـات و پەیوەنـدی لەگـەڵ دەپچـڕێنێت، و جـاری وایـش هەیـە، کـە کێشمەکێشم لە نێوان هەردوو گرووپەکەدا ڕوو دەدات و سەردەکێشێت بۆ کاروبـاری قەدەغـەکراوی تـریش، چـونکە هۆکـاری خراپـی و سەرزەنشـتکراوی ئـەم جـۆرە ڕاجیاییە ئەوەیە کە پەرتەوازەیی و دووبەرەکی قەدەغەکراوە، لە شەرعدا، و کەچی لـەم حاڵەتـەدا پێچـەوانە بووەتـەوە، بۆیـە کـاری لـەم جـۆرە پەسـەندنەکراو، و ناشـەرعییە، و یـەکبوون و هاوپـەیمانێتی داواکـراوە لـە شـەرعدا، و بەرزکردنـەوەی دەستەکان لەو دوو حاڵەتەدا سەر بە کارە جوانەکانی نوێژن، بـەڵام پایـەکانی نوێـژ نین، و هەستان بـەو کـارە و بـەو شـێوازە جوانـە کـارێکی دروسـت و جوانـە، ئەمـە یەکلایی بۆتەوە، و هەروەها پەیڕەوکردنە لە سوننەتی جێگیری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، ئەگەر کەسێك واز لەم کارە بهێنێـت، حوکمەکـەی دواجـار ئەوەیـە کـە پاساو و بیانووی ئەوەی هەیـە کـە ئاگـادار و شـارەزا بـەو سـوننەتە نـەبووە، بـەڵام کـارێکی لـەم جۆرە پێویسـت بـە کێشمەکێشـم و دژایـەتی و دووبـەرەکی ناکـات، و تەنانەت پێویست بەوەندە نکۆڵی کـردنیش هـەر ناکـات، بـە جۆرێـك کـە وا گومـان ببرێـت نکـۆڵی کردنـە لـە کـارێکی حـەرام، و بـەڵکو ئـەم پرۆسـەیە پێویسـتی بـە نەرمونیانی لە ڕوونکردنەوە و ئامۆژگاری هەیە، تـا ڕێگـای سـوننەتەکەی بـۆ ڕۆشـن بکرێتەوە، و هەروەها دەبێت بیروباوەڕمان وا بێت، کە پێشەوای ئـەو مەزهەبـە، بـە هۆی بوونی پاساوو بیانوویەکی وەرگیراو کـاری بـەو سـوننەتە نـەکردووە، هـەروەك دواتر ئەم پرسە ڕوون دەکەینەوە، و دواتریش ئەگەر کەسی پـەیڕەوکار (مُقَلِّد)، لـە پـرس گـەلێکی لـەم جـۆرەی بەرزکردنـەوەی دەسـتەکاندا، قسـەی ڕای بەرامبـەری

وەرنەگرت، ئەوا بڕینی پەیوەندی و دوژمنایەتی کردنی هەر کارێکی دیسان دروست نییە، چونکە یەکبوون و هاوپەیمانێتی و یەکێتی لە واجبە شەرعییەکانە، و لە پێناوی کارێکی سوننەتی شێوە (مستحب)دا، وازهێنان لە (واجب) دروست نییە.

هەروەها شێوەیەکی تری ڕاجیایی سەرزەنشتکراو ئەوەیە کە لە نێوان ئەهلی (فیقهـ)، و ئەهلی تەسەوفدا، بەدی دەکرێت، جا گرووپی یەکەم نکۆڵی لە گرووپی دووەم دەکەن، لە ڕوانگەی ئەوەوە کە بانگەشەی بۆ دەکەن و جەختی لەسەر دەکەنەوە، لە پرسەکانی حاڵی دڵ (أحوال القلوب)، و پاکڕاگرتنی دڵ و پاکژی دڵ و دەروون، واتە، گرووپی یەکەم، نکۆڵی لەم پرسانەی گرووپی دووەم دەکەن، و گرووپی دووەمیش نکۆڵی لە گرووپی یەکەم دەکەن، لەوەیدا کە وابەستەن بە شتە ڕووکەشەکانەوە و گوێ بە ناوەڕۆك نادەن، و جاری وا هەیە، کە هیچ سەنگێك بۆ ڕەوتە فیقهییەکە دانانێن، جا ئەم ڕاجیاییەی نێوان ئەم دوو ئاڕاستەیە، بەم شێوازە، کە بە زۆری دەبێتە هۆی دووبەرەکی و جیاکاری و پەیوەندی پچڕان و ڕق و کینە، کەوتنە نێوان، ڕاجیایی سەرزەنشتکراوە، و بە پلەیەکیش سەرزەنشتکراوە، کە دەگەوزێن تیایدا، کە ئەوپەڕی ناشیرینییە، و لە گەڵ پلەوپایەی ئەواندا ناگونجێت.

**- ڕاجیایی ستایشکراو (الخِلاف المَمْدوح):**

**١١م-** لە جۆری ئەو ڕاجیاییەی کە لە شەرعدا ستایش کراوە، بریتییە لە ڕاجیایی موسڵمانان لە گەڵ هاوبەش پەیدا کارەکاندا، چونکە ئەمە لە پێداویستییەکانی دەست پێوەگرتنی باوەڕدارانە، بە ئایینە ڕاستەکەیانەوە، و شەریعەتی ئیسلامیش فەرمانی کردووە بە پێچەوانەگەری کردن لە گەڵ هاوبەش پەیداکارەکاندا، و ڕێگری کردووە لە خۆچوواندان پێیان، ئیتر چونیەکە ئەم فەرمانکردن و ڕێگری کردنەی شەرع بە شێوەیەکی یەکلایی و تۆبزی (حتم والإلتزام) بێت، یاخود بە شێوەی

سوننەتی (مندوب) و (مستحب) بێت، هەر چونیەکە، و هەروەها ئەم فەرمانکردن و ڕێگری کردنەی شەرع لە پرسە بیروباوەڕییە بەتاڵەکان و ئارەزووخوازەکاندا بێت، یاخود لە نەریت و عادەت و ئەحواڵی ڕووکەشیاندا بێت، هەرچونیەکە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ۚ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۖ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ ﴾[1]، جا هەموو ئەوانەی کە دژ و پێچەوانەی شەرعن، دەچنە ناو دەستەواژەی (الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ)، و سەرجەمی ئەوانەی کە بە پێی ئارەزوو کار دەکەن و ئەوەی کە هاوبەشدانەرەکان لەسەری دەڕۆن، لە حاڵ و باڵی ڕووکەشی خۆیاندا، کە دەرهاویشتەی ئاینی بەتاڵی ئەوانە، دەچنە ناو دەستەواژەی (أهواءهم)، جا بێگومان کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری کردووە، لە نوێژکردن لە کاتی هەڵهاتنی خۆردا، و لە کاتی نیشتن و ئاوابوونیدا، کە هۆکاری ئەم ڕێگری کردنەی بۆ ئەوە گەڕاندووەتەوە، کە بێ باوەڕان لەو کاتەدا کڕنووشی بۆ دەبەن، بۆیە بۆ ڕێگری کردن لە لێکچوونی باوەڕداران، بە بێ باوەڕان لە ڕووکەشدا، ئەمەی کردووە، هەرچەندە مەبەستیان لێکچواندن نییە، بەڵام ڕێگرییەکە بەم هۆکارە هاتووە، و لە فەرموودەدا هاتووە، کە دەفەرموێت: (مَنْ تشبَّهَ بِقَومٍ، فهوَ مِنْهُم)، هەرکەس خۆی بە کۆمەڵ و کەلێك بچووێنێت، ئەوە لەوانە، واتە دەبێتە بەشێك لەوان، و لە ئەندازەی هاوبەشی ئەو لێکچواندنەدا، کە کردوویەتی پێیان،

---

[1] سورة الجاثية: ١٨ – ١٩، لە دوای کێشەی خاوەن نامەکان، ئێمە تۆمان خستە سەر بەرنامە و شەریعەتێك لە ئاین، جا تۆیش شوێنی بکەوە، و بە پوختی پەیڕەویی بکە، و شوێن هەواو هەوەس و ئارەزووی ئەو نەزانانە مەکەوە(١٨) بێگومان ئەوانە هیچ شتێك لە خوداوە، لە تۆ دوور ناخەنەوە، ئەگەر شوێنیان بکەویت، کەوابوو، هیچ کات تاڵە موویەك، لە شەریعەتەکەی خوا، لا نەدەیت، و بێگومان ستەمکاران بە شیرك، یارویاوەری یەکترن، لە دونیادا، و پەرستراوی هەقیش تەنیا (الله)یە، و یارو دۆستی پارێزگارانە، و سەرپەرشتیی هەموو کارێکیان دەکات (١٩)

هەروەك (شيخ الأسلام، أبن تيمية) دەفەرموێت: (پێشەوا ئەحمەد)، "ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، دەقی لەسەر ئەمە هەیە، هەروەك لە پەڕاوی (اقتضاء صراط المستقيم)[1] دا، هاتووە، لەسەر ئەوەی کە ئامادەبوون لە جەژنی هاوبەش پەیداکاراندا باش نییە، و مەکروهە، و گوتوویەتی: نابێت لە جەژنەکانیاندا خۆتان بەوان بچوێنن، و نابێت وەڵامی داوەتنامەیان بدەنەوە، و نابێت هاوکارییان بکەن تیایاندا، بەڵام دەتوانرێت بەهۆی پێویستی، یان بەرژەوەندییەکی ئاینی پێچەوانەگەری لەگەڵ هاوبەشدانەراندا، لە ڕەفتار و ڕەوش و مامەڵەی ڕووکەشیاندا، واز لێ بهێنن.

(ئیبن تەیمیە)، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، دەفەرموێت : ئەگەر مسوڵمانێك لە (دار الحرب) یان (دار الكفر)ێکدا، کە جێگای شەڕ نەبێت، ئامادەیی هەبوو، ئەوە فەرمانی پێنەکراوە کە پێچەوانەگەری بێ باوەڕان بکاتەوە، لە ڕەفتار و مامەڵەی ڕووکەشیاندا، چونکە کاری لەم جۆرە بۆ بکەرەکەی زیانمەندە، و بەڵکو بۆ ئەو کابرایە وا جوان و باشە، و یاخود لەسەری پێویستە، ئەگەر بەرژەوەندی ئاینی تیادا بوو، وەك بانگەوازکردنیان بۆ لای ئیسلام، و لادانی زیانیان لە سەر مسوڵمانان، و هاووێنەی ئەمانە، لە نیاز و مەبەستە باشەکان، ئەوا بەشداری کردنی لە ڕەفتارە ڕووکەشەکان لەگەڵ ئەوان کارێکی دروستە.

۱۲ـ هەروەها نموونەیەکی تر، لە ڕاجیایی ستایشکراو، بریتییە لە پێچەوانەگەری مسوڵمان، لە گەڵ جەژن و پەرستش و لاساییکردنەوە و نەریتەکانی سەردەمی نەزانی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ

[1] پەڕاوی (اقتضاء صراط المستقيم)، ل١٧٦ـ ١٧٧.

ٱلۡأُولَىٰ ﴾[1]، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە فەرموودەیەکدا، کە پێشەوایان (بوخاری) و (مسلم) گێڕاویانەتەوە، فەرموویەتی: (لیس منا من ضرب الخدود، وَ شق الجیوب، وَ دعا بدعوی الجاهلیة)، واتە: هەرکەس بۆ کەسی مردوو بدات، لە ڕوومەتی خۆی، و یان یەخەی خۆی دابدڕێت، و لە گریان و شیوەنی خۆیدا، قسەی نەزانانە کە خوا پێی ناخۆش بێت، بکات، لە ئێمە نییە، جا کە لە مسوڵمان داواکراوە پێچەوانە بێت، لە گەڵ نەریتە جاهیلییەکاندا، ئەم کارە بە دوورکەوتنەوە و وازهێنان و ڕوو وەرچەرخان دەبێت لێیان، و جا هەرکەس ئەم نەریتە خراپانە زیندوو بکاتەوە و داوایان بکات و بانگەواز بکات بۆ لایان، ئەوە کەوتووەتە ناو تاوانێکی گەورەوە و پێچەوانەگەری کردووە، لە گەڵ شەریعەتی ئیسلامدا، و لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێت: (أبغض النّاس إلى الله ثلاثة: ملحدٌ في الحرم، وَ مبتغ في الإسلام سنَّة الجاهلية، ومُطّلب دم امرئ بغير حق، ليهريق دمه)، واتە: بێزراوترین مرۆڤ، لە لای خودای مەزن سێ کەسن، کەسێك کە لە حەرەمی پیرۆزی مەککە و مەدینەدا، لە هەق لابدات و تاوانکاری و خراپە ئەنجام بدات، و هەروەها کەسێك کە لە ئیسلامدا خۆی خەریك بکات، بە زیندووکردنەوەی داب و نەریتەکانی سەردەمی نەفامی، و هەروەها کەسێك کە بە ناهەق بە شوێن ڕشتنی خوێنی کەسێکی ترەوە بێت.

وشەی (ابتغاء)، بریتییە لە (داواکردن و ویستن)، جا هەرکەس ویستی لە ئیسلامدا، کە کار بە بەشێك لە داب‌ونەریتەکانی سەردەمی نەفامی بکات، ئەوا دەچێتە ناو چوارچێوەی مانای ئەم فەرموودە پیرۆزەوە، و مەبەستیش لە داب‌ونەریتی نەزانی (السنة الجاهلية)، بریتییە لە داب‌ونەریتی ئەوان لە پەرستش و شتی تریشدا، و

---

[1] سورة الأحزاب: ٣٣، وەك خۆدەرخستنی ئافرەتانی چەرخی نەفامی کۆن و پێش ئیسلام، خۆتان دەرمەخەن، لە ئاستی پیاوی بێگانە.

بـەکارهێنانی وشـەی (سـنة) بـۆ سـەر فیعلـی (جاهلیـة)، واتـە، بـەکارهێنانی دەستەواژەی (السنَّة الجاهليّة) لە بنەمای زمانی عەرەبیدا هاتووە.[1]

## - ڕاجیایی ڕەوا، و وەرگیراو:

**١٣ـ** ئەم جۆرە ڕاجیاییەش ئەوەیە کە لە نێوان موجتەهیدە شـەرعزان و مـوفتی و دادوەرەکانـدا هەیـە، لـەو پرسـە ئیجتیهادییانەیـدا، کـە ئیجتیهـاد و ڕاجیـایی کـردن تیایاندا ڕەوایە، و ئەمیش لەو دۆز و پرسانەدا دەبێت، کـە دەقـی یەکلاکـەرەوەیان لەسەر نییە، و بەڵگەیش لەسەر ڕاجیایی وەرگیراو و ڕەوا زۆرن، لەوانە:

**یەکەم:** لە فەرموودەی ساغدا، لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) هـاتووە، کـە فەرموویەتی: (إذا حكم الحاكم فاجتهد فأصاب فله أجران، وَ إذا حكم فاجتهد فأخطأ فله أجرٌ)، واتـە: ئەگـەر دادوەر ئیجتیهـادی کـرد و پێکـای، ئـەوە دوو پاداشـتی بـۆ هەیە، و ئەگەر ئیجتیهادی کرد و هەڵەی کرد، ئەوە یەك پاداشتی هـەر هەیـە، ڕووی بەڵگەکردنی ئەم فـەرموودە پـیرۆزە، ئەوەیـە کـە ڕاشـکاوانە بـوونی هەڵـەی ئامـاژە پێداوە، و لە بڕیار و کاروباری کەسـی موجتەهیـددا، و مانـای ئەمـەیش ئەوەیـە کـە بۆی هەیە، ڕاجیایی ڕوویدات و هەبێت، لە نێوان ئەوەیاندا کـە پێکاویـەتی، لـە گـەڵ ئەوەیاندا کە هەڵـەی کـردووە، و ئـەم گونجانـەیش هـەر بـە کـردەوە و بـە ڕوودانـی ڕاجیایی هاتووەتـە دی و سەلماوە، لەبەرئەوەی کە فەرموودە پیرۆزەکە دان بـەوەدا دەنێت، کە هەردوو جۆرە موجتەهیدەکە، کە ڕاکانیان جیاوازە، ئـەوەی پێکاویـەتی و ئەوەیشیان کە هەڵەی کردووە، هەر خاوەنی پاداشتن، و مانای ئەمـە ئەوەیـە کـە ڕاجیاییەکـەیان ڕەوا و وەرگـیراوە، چـونکە ڕوونـە کـە پاداشـت لـە سـەرکاری سەرزەنشتکراو نادرێت.

---

[1] فيض القدير، شرح الـجامع الصغير، للمناوي، ب١، ل٨١.

**دووەم:** هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت)، لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، ڕاجیاییان هەبووە، لەو جۆرە ڕاجیاییەش وەك ئەوەی کە لە شێوازی تێگەیشتنی فەرمانەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، هەیانبووە، وەك ئەوەی کە نوێژی عەسریان لە ناوچەی (بني قريظة) کرد، کە هەیانبوو، نوێژەکەی لە ڕێگادا کرد، و لە کاتی خۆیدا، و هەیانبوو کە لە دوای کاتەکەی خۆیەوە نوێژەکەی کرد، لە دەڤەری (بني قريظة)یش، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەم کارەیانی زانی، نکۆڵی لە هیچکام لەو دوو گرووپە نەکرد، و ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕاجیاییەکەیان ڕەوا و وەرگیراوە.

**سێیەم:** هاوەڵە بەڕێزەکان (خوایان لێ ڕازی بێت)، و تیایاندا خەلیفەکانی ڕاشیدین (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)، لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ڕاجیاییان هەبووە، لەسەر پرسە فیقهییە ئیجتیهادییەکان، و کەسیشیان لەسەر ئەمە نکۆڵی و ڕەخنەی نەبووە و ئەمەیش بە پلەی کۆڕا (إجماع)ـی، هاوەڵانە، لەسەر ئەوەی کە ئەم جۆرە ڕاجیاییە، ڕاجیایی ڕەوا و وەرگیراو بووە.

**چوارەم:** بەردەوام شەرعزانەکان لە دوای سەردەمی هاوەڵان، (خوایان لێ ڕازی بێت)، تا ئەمڕۆ، ڕاجیاییان هەبووە لەسەر پرسە ئیجتیهادییەکان، بە بێ ئەوەی کەس لەم بارەیەوە نکۆڵی بکات، و ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم کۆڕاییەی گەلی ئیسلام لەم بارەیەوە سەلمێنەری ئەوەیە کە ئەو جۆرە ڕاجیاییە ڕاجیایی ڕەوا و وەرگیراوە.

**ـ مەرجەکانی ڕاجیایی ڕەوا (الإختلاف السائغ):**

**٤١٤ـ** لە ڕاجیایی ڕەوا و وەرگیراودا، ئەوە بە مەرج گیراوە، کە ئەو ڕاجیاییە لە کەسانی شەرعزانی سەر بە ئەهلی عیلم سەرچاوەی گرتبێت، چاودێر بن و شارەزا بن، بە سەر فیقهەوە، و بەتوانا بن لە هەڵهێنجانی حوکم لێیەوە، واتە، موجتەهید بن، و ئەو مەرجانەی موجتەهید کە هەن و لە کتێبە فیقهی و ئوصوڵییەکاندا چەسپێنراون، تیایاندا هاتبێتە دی و دەبێت ئیجتیهادکردن و ڕاجیایی کردنەکەیان لەو پرسە لاوەکی (فرعیة)یانەیدا، کە ئیجتیهادکردن و تێڕامان تیایاندا ڕەوایە، ئەنجام بدرێت، کە ئەمەیش ئەو پرسانەن کە بەڵگەی یەکلاکەرەوە لەسەریان نییە، چونکە لەکاتی بوونی دەقدا، ئیجتیهادکردن ناڕەوایە، و دەبێت مەبەستی موجتەهیدەکان لەم ڕاجیاییە تەنها بریتی بێت، لە گەیشتن بە ڕێگای دروست و هەق، بۆیە هەروەك (ئیبن حەزم) دەڵێت: ((هاوەڵان، "خوایان لێ ڕازی بێت"، بە هۆی ڕاجیایی کردنیان لە تێڕوانینیان بۆ پرسەکان، سەرزەنشت ناکرێن، چونکە ئەمان بۆ پەی بردن بە هەق و ڕاستی و دۆزینەوەی ڕای دروست، گەڕاون و کاریان کردووە، و ئیجتیهادیشیان هەر لەم پێناوەدا کردووە، بۆیە بەم هۆیەوە خاوەن پاداشتن)).[1]

دەبێت موجتەهیدەکان ئەوپەڕی توانا و هەوڵیان بخەنەگەڕ، بۆ گەیشتن بە هەق و ڕاستی، بۆیە هەرکات یەکێکیان خەمساردی کرد، لەم هەوڵدانەیدا و دواتر ڕاجیایی کرد، ئەوا ئەم ڕاجیاییەی سەرزەنشتکراوە و بەرپرسیارێتی کەسی ڕاجیاکار لەم بوارەدا زیاترە، چونکە کەم و کورتی و خەمساردی کردووە، لە هەوڵ و کۆشش کردنیدا، ئەگەر بەڵگە شەرعییەکە ڕوون بوو، یاخود دەکرا بە هەوڵێکی کەم بزانرێت، بەڵکو جاری وا هەیە، کە ڕاجیایی کردنەکەی لەم حاڵەتەدا نیشانەیە

---

[1] اصول الأحكام، لإبن حزم، ل٦٤٥.

لەسەر کەموکورتی و خەمساردی خودی کەسەکە لە کەموکورتی کردن لەو کۆشش و هەوڵەیدا کە دەبێت لەو بوارەدا بیدات، ئەمە بە پێچەوانەی ئەوەوەیە کە ئەگەر بەڵگە شەرعییەکە ناڕوون، یان گرژ و تێك ئاڵاو و نادیار بێت، یاخود بە ئاسانی نەدەتوانرا، لە سەری هەڵوێستە بکرێت، یان پێی بگەین، ئەوا لەم حاڵەتانەدا قسەی کەسی موجتەهیدی ڕاجیاواز لەسەر ئەو بەڵگەیە، ئەمە نیشانەیە لەسەر هەڵوێستە نەکردنی بۆ گەیشتن بە بەڵگەکە، و سەرەڕای هەوڵدانی بە پێی توانا بۆ ئەم کارەی، بۆیە ڕاجیاییەکەی لەم کاتەدا بە ڕەوا دادەنرێت، هەروەها بە مەرج گیراوە کە نابێت ئەو ڕاجیاییە ببێتە هۆکاری پەرتەوازەیی و پەیوەندیی پچڕاندن و جیاوازی دڵەکان، چونکە ڕوودانی کارگەلێکی لەم جۆرە، بەڵگەیە لەسەر ئاوێتەبوونی ئارەزووبازی لەگەڵ دڵی هەردوو ئاڕاستەی ڕاجیایی کاران، و یاخود گرووپێکیان، بۆیە بۆی هەیە کە هەردوو گرووپەکە سەرزەنشتکراو بن، یاخود گرووپێکیان سەرزەنشتکراو بێت، و ئەم گرووپە خۆی هۆکاری پەرتەوازەیی و پەیوەندی پچڕانەکە بێت، بەهۆی ڕاجیایی کردنەکەیەوە، و هاوەڵە بەڕێزەکانیش (خوا لێیان ڕازی بێت)، هەروەك لێیانەوە ئەوە زانراوە کە لەو پرسە ئیجتیهادییانەیدا، کە بڕیار یاخود فەتوایان لەسەر داوە، ڕاجیاییان کردووە، بەڵام دڵیان بەرامبەر بە یەکتر ڕاجیایی تیادا نەبووە، و بەڵکو هەر بە گرێدراوی پێکەوە ماونەتەوە.

## ـ ئێمە کەس هان نادەین لە سەر ئەنجامدانی ڕاجیایی ڕەوا:

۱۵ـ سەرەڕای ئەوەی کە ڕاجیایی جۆری ڕەوا و وەرگیراویشی هەیە، بەڵام ئێمە هەر کەسی لەسەر هان نادەین، و لە لای شیرینی ناکەین، کە ئەنجامی بدات، بەڵام ئەگەر هەر ڕوویدا، ئەوا بە جێگای سەرسوڕمانی نازانین، و هۆکاری ئەمەیش ئەوەیە کە بێگومان هاوپەیمانێتی و کۆکبوون و یەکانگیری باشترە لە پەرتەوازەیی و

دووبەرەکی، و تەنانەت لەو پرسە ئیجتیهادییانەیشدا، کە ڕاجیایی تیایاندا ڕەوایە، بۆیە هاندان و هەڵنان لەسەر ڕاجیایی، هەرچەندە ڕاجیایی ڕەوایش بێت، هەر دروست نییە، چونکە ئەگەر وا بکەین، مانای ئەوەیە کە بە تایبەتی ئەو ڕاجیاییەمان کردووە، ئەمەیش مانای ئەوە دەدات بەدەستەوە، کە پێچەوانەگەری لەگەڵ داواو ناواخنی بەڵگە شەرعییەکاندا دروستە، کە بە هۆیەوە ڕاجیایی ڕوو دەدات، و بێگومان کارێکی لەم جۆرەیش بە تەواوەتی بەتاڵ و نادروستە، و هەروەها یەکێکی تر لە مەرجەکانی ڕاجیایی ڕەوا، بریتییە لە یەکلایی کردنەوەی مەبەست و مەرام لەسەرئەوەی کە تەنها ئەو ڕاجیاییە بۆ گەیشتن بە ڕای دروست و هەق ئەنجامت داوە، و دواجار نیاز و مەبەست لەم جۆرەیش لەگەڵ حەزی کەوتنە ناو ڕاجیایی یەك ناگرێتەوە، و مەبەستی ئەوەیە کە دەبێت، ڕاجیایی لەوپەڕی ناچاریدا، ئەنجام بدرێت، کە ئەنجامدرایش بە سنگ فراوانییەوە وەربگیرێت.

## ـ ( أختلافُ أمّتي رَحْمَةٌ : ڕاجیایی گەلەکەم ڕەحمەتە ):

۱۱٦ـ جاری وا هەیە، کە ئەوەی گوتمان بە هۆی بێژراوێکەوە، کە هەندێك کەس وەك فەرموودە تەماشای دەکەن، دەیدەنە پاڵ سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەیکەنە ڕەخنە بەسەرمانەوە و دەیدەنەوە بە ناوچاوماندا، ئەویش دەستەواژەی (أخْتِلاف أُمّتي رَحمة)یە، واتە، ئەو ڕاجیاییەی کە لەناو ئوممەتەکەمدا هەیە، ڕەحمەت و میهرەبانییە بۆیان! کە لەم دەستەواژەیەوە هاندان و حەزلێکردنی ڕاجیایی دەفامرێتەوە، چونکە حاڵەتەکە وایە، هەرشتێ ڕەحمەت بوو، دەبێت هاندانی لەسەر بکرێت و هۆکارەکانی ئەنجامدانی فەراهەم بکرێن، کە گوایە یەکێك لە فاکتەرەکانی بەدیهێنانی ئەو ڕەحمەتە، لێرەدا (ڕاجیایی : أخْتِلاف)ـە ! و ئەمەیش سەراپای دژی ئەوەیە کە گوتمان، کە ئێمە کەس هان نادەین، لە سەر ڕاجیایی و خۆشەویستی ناکەین لە لای.

ـ وەڵامدانەوەی ئەم ڕەخنەیەش، لە دوو ڕوانگەوەیە:

**ڕوانگەی یەکەم:** ئەم فەرموودەیە صەحیح نییە، و (پێشەوا سەخاوی) دەفەرموێت: کۆمەڵێك لـە زانایـان بـە سـەنەدی زۆر لاوازەوە باسـیان کـردووە، و هەنـدێکیش بـە مورسەلـی و بە سەنەدی لاواز هێناویانە،[1] پاشـان (ابـن الـديبع الشـيباني) دەڵێـت: زۆرێك لە پێشەوایان فەرموویانە کە ئـەم ڕیوایەتـە ئەصـڵ و بنـەمای نییـە، و بـەڵام پێشەوا خەطابی لە (غريب الحديث)دا، باسی کـردووە و ئـەوەی درکانـدووە، کـە لـە لای ئەو ئەصڵ و بنەمای هەیە،[2] و پێشەوا (السُبکی) دەفەرموێت: ئەم گێڕانەوەیـە لـە لای فەرموودەناسـان ناسـراو نییـە و هـیچ سـەنەدێکی سـاغی، یـان لاواز، یـان هەڵبەستراویم بەدی نەکردووە، و وا گومـان نابـەم، کـە ئەسـڵ و بنـەمای هـەبێت، و تەنها قسەی سەر زمـانی خەڵکییـە، بـۆ وێنـە کەسـێك گوتوویـەتی: (اِخْـتِلاف أُمّـتي رَحمـة)، هەنـدێ کـەس لێیـان وەرگرتـووە و وایـان زانیـوە فەرموودەیـە، ئیـدی بـە فەرمایشتی پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) ئـەژماریان کـردووە، و تـا ئێسـتایش بڕوام وایە کە ئەم فەرموودەیە ئەسڵ و بنەمای نییە، و پاشـان پێشـەوا (السـبکی)، بـە بەڵگـەی ژمارەیـەك ئایـەت و فـەرموودەی صـەحیح نادروسـتی ئـەو گێڕانەوەیـە دەچەسپێنێت و دەبێـژێت، کـە ئـەو بەڵگـە گەلـە سـەلمێنەری ئـەو ڕاستییەن، کـە (ڕەحمەت) لە (ڕاجیایی نەکردنەوە) سەرچاوە دەگرێت،[3] و پێشـەوا (سـیوطي) لـە پـەڕاوی (الجـامع الصـغير)دا، دەفـەرموێت: (نصـر المقدسـی) گێڕاویەتییـەوە، لـە پەڕاوی (الحجة)دا، و هەروەها (بەیهەقی)، لە پەڕاوی (الرسـالة الأشـعرية)دا، بـە بـێ سـەنەد گێڕاویەتییـەوە، و پاشـان (الحليمـی) و (قاضـي حسـين) و (پێشـەوا

---

[1] المقاصد الحسنة للسخاوي، ل٢٦ـ ٢٧.

[2] تمیز الطيب من الخبيث، فيما يدور على ألسنة الناس من الحديث، لأبن الديبع الشيباني.

[3] تفسير الآلوسي، ب٤، ل٢٤.

حەڕەمەین) و هی تریش هێناویانە، و لەوانەیە لە هەندێ لە پەڕاوەکانی پێشەوا مەزنەکانی فەرمووده (حفاظ)دا، هاتبێت، کە بەدەستی ئێمە نەگەیشتووە، و پێشەوا (المناوي) پەڕاوێزێك لە سەر ئەو قسەیەی پێشەوا (سیوطي) دەدات و دەبێژێت: (السبکی) گوتوویەتی، جا ئەوەی پێشتر هێنامان ئەویش دەیهێنێت، و پاشان (المناوي) دەفەرموێت: (حافظ العراقي) فەرموویەتی: سەنەدەکەی لاوازە،[1] و پاشان فەرموودەناسی سەردەم (الشیخ محمد ناصر الدین الألباني)، "ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، دەفەرموێت، ئەم گێڕانەوەیە ئەصڵی نییە، و لە پێشەوا (ئیبن حەزم)ـەوە، هێناویەتی، کە گوتویەتی: ئەم گێڕانەوەیە بەتاڵ و درۆیە،[2] و لەم ڕوانگەیەوە، کەواتە: ئەم فەرموودەیە صەحیح نییە، و یاخود زۆر لاوازە، و نموونەی لەم جۆرە نابنە بەڵگە، بۆیە بۆ ئەوە ناشێت، کە دواجار وەك بەڵگەهێنانەوە بەکاربهێنرێت.

**ڕوانگەی دووەم:** گریمان دروست بێت، کە بیکەینە بەڵگە، ئەوا دەکرێت کە مانا و مەبەستەکەی وا لێك بدەینەوە، کەوا ڕاجیایی موجتەهیدەکان لەو بوارەیدا کە ئیجتیهاد و ڕاجیایی تیایدا ڕەوایە، ئەمەیان ڕەحمەتە بۆ ئەوانیش و بۆ گەلی ئیسلامیش، جا ئەو ڕەحمەتە بۆ موجتەهیدەکان لەوەدایە کە سەرجەمیان بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خاوەن پاداشتن، کە باسمان کرد، و ڕەحمەت بۆ گەلەکەیشی لەوەدایە کە ڕاجیایی نێوان موجتەهیدەکان لە دوای ئیجتیهادکردنەکەیان ڕوودەدات، ئیجتیهادکردنیشیان بۆ ناسینی ئەو حوکمە شەرعییانەیە کە دەقیان لەسەر نییە، و لەو پێشهاتانەیدا کە ڕوو لە گەلی ئیسلام دەکەن، کە ئەمەیش کارێکی ویستراو و وەرگیراوە، لە شەرعی ئیسلامدا، چونکە

---

[1] فيضُ القَدير، شرح الجامع الصَغير، لِلمُناوي، ب١، ل٢١٢- ٢١٣.

[2] سلسلة الأحاديث الضَعيفة، وَالمَوضوُعَة، لِلشيخ مُحَمّد ناصِرالدين الألباني، ل٧٦.

کارناسانی دەکات، بۆ ئەم گەلە لە بەڕێکردن و لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا، و لە چوارچێوە و سێبەری بەرفراوانی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا، و ڕەوتکردن و بەڕێ کردنی ئەم کاروبارانە لەم چوارچێوەیەی دەق و ئیجتیهادکرنەدا، دەبێتە هۆکاری فەراهەم بوونی ڕەحمەتی خوای پەروەردگار، و پاشان بێگومان لە ڕاجیایی موجتەهیدەکاندا، کە لە دوای ئیجتیهادی پێویستی خۆیان کردوویانە، ئامرازێکە بۆ دەرخستنی بیروڕاکانیان و بەڵگەکانیان، دەکرێت لە نێوان یەکتریدا بەرابەری (مُقارَنة)یان، پێ بکرێت، و دواجار ئەوەیان بناسین و بدۆزینەوە، کە زیاتر نزیکە و هاوشێوەیە لەوەی کە لە قورئان و سوننەتدا هەیە، و دواتر ئەوەیان کە زیاتر نزیکە و لەو دوو سەرچاوەیە دەچێت، ئەمەیان شایەنی شوێنکەوتنە، و بێگومان شوێنکەوتنی ئەمەیشیان کە زیاتر وابەستە و هاوشێوەی قورئان و سوننەتە، فاکتەرە بۆ داباریینی ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە، چونکە هەر ئەمەندە و بەم ئەندازەیە لە تواناادا بووە، کە کار بکرێت، وا کراوە.

## - پێکان و هەڵەکردن، لە فەرمایشتی موجتەهیدەکاندا:

**١٧م** جائەگەر هاتو ڕاجیایی نێوان موجتەهیدەکان ڕەوا بوو، ئایا فەرمایشتی سەرجەمیان بە ڕاست و دروست و پێکراو ئەژمار دەکرێت؟ و ئایا سەرجەمیان لە قسەکانیاندا پێکاویانە، یان نا؟

هەندێ لە زانایان لە وەڵامی پرسیارێکی لەم جۆرەدا فەرموویانە، کە فەرمایشتی هەموویان هەقە و دروستە و پێکاویانە، و هەموو یەکێکیان ڕاکەی دروست بووە و پێکاویەتی، و ئەم زانایانە پشتڕاستی ئەم ڕایەیان کردووەتەوە، و ئەم پرسەیش لە لایەن (الشعراني)یەوە، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە پەڕاوی (الميزان)دا، ڕوونی کردووەتەوە، و بەرگری لێ کردووە، چونکە ڕای وایە، کە فەرمایشتی موجتەهیدەکان، بە پێی بەهێزی و لاوازی بڕوای خەڵکی، لە دوو حاڵەت بەدەر

نییه، یان ئاسانكاری كردنه، و یان توندی و بارگرانكردنه، و هـەروەها لـه پێشـەكی پـەڕاوی (المیـزان)دا، فەرموویـەتی: ئەوەنـدەی كـه دەزانـین هـیچ فەرمایشـتێكی زانایـانی شـەریعەت لـه دەرەوەی بازنـەی یاسـا و ڕێسـاكانی شـەریعەت نییـه، و فەرمایشـتی ئـەوانیش وەك پێگـەی هـەموو مرۆڤێـك یـان نزیكـه لـه بنەما شـەرعییەكانەوە، و یـان نزیكترینـه، و یـان دوورتـره و دوورترینـه، و ڕۆشـنایی و تیشكی شەریعەتیش سەرجەمیان دەگرێتـەوە، هەرچـەندە لـه پلـەكانی (ئیسـلام) و (ئیمان) و (ئیحسان)یشدا، لێك جیاواز بن، و پاشان دەفـەرموێت: فەرمایشـتی هیچ كام لەو موجتەهیدانـەمان لـه دوولا و شـایانی (ئاسـانكاری) و (تونـدی و گرانكـاری) نەچووەتە دەرەوە، و شەرعیش لەبەر ئەو فراوانی و پـان و پۆرییـەی كـه هەیـەتی، دەتوانێت سەرجەمی وتەكانیان بگرێتە خۆ و لەناو خۆیدا جێگایان بكاتەوە.[1]

١٨ـ زیاتری شەرعزانەكان ڕایان وایە، كە هەق و ڕاستی لـه لای یـەكێك لـەو كۆمەڵـە ڕایانەیە، ئەگەرچی بەهۆی نەبوونی بەڵگەی یەكلایی كەرەوە و دڵنیاكەرەوە لەسەر هەق، ناتوانین ئەو ڕایە بە یەكلایی دیاری بكەین، كە پێكاویەتی، و هەروەها هاوەڵە بـەڕێزەكان (خـوا لێیـان ڕازی بێـت)، كـه لـەو پرسـانەیدا كـه لەسـەری ڕاجیاییـان هەبووە، هەڵەی یەكترییان دیاری دەكرد، بۆیە ئەگـەر هـەموو موجتەهیـدێك لەسـەر هەق بوایە، ئەوا هەڵەكەیان دیاری نەدەكرد.

پاشان ئەگەر هەق لە لای یەكێك لـەو فەرمایشـتانە بـوو، ئایا هـەموو موجتەهیدێك بەوە دێتە ئەژمار، كە پێكاویەتی، سەرەڕای بوونی ڕاجیایی ئەو لەگەڵ موجتەهیدی تردا، یان نا...؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا چەند ڕوانگەیەك بوونیان هەیە، گوتراوە كە ئەوەیان كە پێكاویەتی، تەنها یەكێكیانە، چونكە ناكرێت دوو قسەی پێچەوانەی یەكتری هەبن و هەردووكیش پێكابێتیان و دواجار ئەوەی كە پێكاویـەتی تـەنها ئـەو

[1] المـيزان، للإمام الشعراني، ب١، ل٢ـ ٦.

کەسەیە کە خاوەنی قسە هەقەکەیە، و هەروەها گوتراویشە کە هەموو موجتەهیدێك لەسەر هەقە و پێکاویەتی، هەرچەندە هەقەکە هەر لەلای یەکێکیانە، بە بەڵگەی ئەوەی کە هاوەڵە بەڕێزەکان (خوا لێیان ڕازی بێت)، هەرچەندە نکوڵییان لە ڕای یەکتری کردووە، بەڵام هەریەکترییان بە ئاراستەی ڕاست و پێکان ئەژمار کردووە.

پاشان بڕێك زانا هەن، کە ڕایان وایە کە هەندێ لەو موجتەهیدانەی کە دوچاری ڕاجیایی بوونەتەوە، لە گەڵ یەکتریدا لەسەر هەڵەن، و هەر خۆیشیان لەسەر پرسی گوناهباری ئەوانەی کە بە هەڵەکەدا چوون، ڕاجیاییان هەیە، هەندێکیان دەڵێن: گوناهبار نابن، و هەندێکی تر دەڵێن، بە پێی ئەندازەی هەڵەکانیان تاوانبار دەبن.[1]

١٩- توێژینەوە و شرۆڤەکردنی ئەم پرسە سەرجەمی لەم فەرموودەوە وەردەگیرێت و دێتەدی، کە دەفەرموێت: (ئەگەر دادوەر بڕیاری دەرکرد و تیایدا ئیجتیهادی کرد و پێکای، ئەوە خاوەنی دوو پاداشتە، و ئەگەر نەیپێکا، ئەوە یەك پاداشتی هەیە، جا ئەم فەرموودە پیرۆزە، بەڵگەیە لەسەر چەند شتێك:

**یەکەم:** ئەوەیە کە لەناو ئەو قسانەدا یەکێکیان هەقە و ئەوانی تریان هەڵەن.

**دووەم:** ئەو موجتەهیدەی کە هەقەکەی دۆزیبێتەوە، ئەوە پێکاویەتی، و ئەوەیان کە نەیپێکاوە، هەڵەی کردووە.

**سێیەم:** ئەو موجتەهیدەی کە هەڵەی کردووە، گوناهی لەسەر نییە، بە بەڵگەی ئەوەی کە یەك پاداشتی هەیە و پاداشتیش لەسەر تاوان وەرناگیرێت، پاداشتەکەیش لەسەر هەڵەکەی نییە، چونکە پاداشت لەسەر هەڵەیش وەرناگیرێت، و بەڵکو بۆ ئەوەیە کە بە شوێن هەقدا گەڕاوە و کۆششی بۆ دۆزینەوەی کردووە،

---

[1] جامِع بَيان العِلْم وَفَضلِه، للإمام إبن عبدالبَرّ، ب٢، ل٨٩- ٩٠، المُستصفى، للإمام الغزالي، ب٢، ل٣٦٣ و دواتر، المُوافقات، للإمام الشاطِبي، ب٢، ل٨١، فَواتح الرحَموت، ب٢، ل٣٨٠ و دواتریش، إرشاد الفُحوُل، للإمام الشَوْكاني، ل٢٣٠.

بۆیە (پێشەوا شافیعی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، دەفەرموێت: ئەو کەسە لەسەر هەڵەکەی پاداشت وەرناگرێت، چونکە هەڵەکردن لە ئایندا هیچ جۆرە فەرمانێکی پێ نەکراوە، بەڵکو پاداشت لەسەر ئەوە وەردەگرێت، کە هەوڵیداوە و ویستوویەتی هەق بدۆزێتەوە و لەم کەین و بەینەدا و بەم هۆیەوە تووشی هەڵە بووە، و هەروەها ئایەتی: ﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ﴾[1]، بەڵگەیە لەسەر لادانی تاوان لەسەر موجتەهیدێك کە بەهەڵەدا چووبێت.

**چوارەم:** ئەوەی کە لە کەسی موجتەهید داواکراوە، ئەوەیە کە دەبێت هەوڵ و کۆشش بکات، ئەمەی لەسەر شان واجبە، بەڵام لەسەری پێویست نییە، کە لە ئیجتیهادکردنەکەیدا هەق بپێکێت، مادام توانای نەبووە، کە بگات بەو هەقە، چونکە فەرموودەکە ئەم هەق پێکانەی لەسەر واجب نەکرد، ئەگەر توانای ئیجتیهادکردنی هەبوو، و نەیکرد، ئەوا لەم حاڵەتەدا تاوانبارە، و ئەگەر ئیجتیهادیشی نەکرد و لە توانایدا نەبوو، هەقەکە بدۆزێتەوە و مەبەستەکە بناسێت، تەنها بەهۆی بوونی توانای ئەو ناسینەوە، فەرمانی پێ نەکراوە، کە بیکات، جا ئەگەر ئیجتیهادەکەی ئەم کەسە قسەیەکی هەڵەی هێنایە بوون، ئەوا لەسەری پێویستە کە کاری پێ بکات، جا ئەمە لەبەر ئەوە نییە کە پێکاویەتی، و لەبەر ئەوەیش نا، کە بە پێی شەرع فەرمانی بەو گوتەیە پێکراوە، بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی کە شەرع فەرمانی بەو داوە کە کار بکات، کە دەرهاویشتەی ئیجتیهادەکەیەتی، و هەروەها کار بکات بەوەی کە توانیویەتی بیناسێت، و تەنها ئەو ئەندازەیەی توانیوە بکات، کە بۆی دەرکەوتووە، کە ئەو قسەیە پێکاویەتی، بۆیە ئەو موجتەهیدە لەو ڕووەوە فەرمانی پێکراوە کە لە توانایدا بووە و کردوویەتی، نەك لەو ڕووەوە کە پێکابێتی، ئەمەیش

---

[1] سورة الأحزاب: ٥، هیچ گوناهتان لەسەر نییە، لەو تاوانانەی کە بە هەڵە کردووتانە، و بەڵکو گوناهتان لەسەرە، لەوەی کە بە دڵ و دەست ئەنقەست، و نیاز، و نیەتتان لە سەریەتی و کردووتانە!

ئەمە ڕوون دەکاتەوە، کە ئەگەر چەند موجتەهیدێك لەسەر ئاڕاستەی ڕووگە (قیبلە) ئیجتیهادیان کرد، و ڕووە و چوار ئاڕاستە نوێژیان کرد، بێگومان و بەیەکلایی یەکێکیان پێکاویەتی، و سەرجەمیان کاریان بەوە کردووە کە فەرمانیان پێکراوە و گوناهباریش نین و دیاریکردنی ڕووگە لەسەر ئەوانەیان لاچووە، کە نەیانتوانیوە بیدۆزنەوە، و لەسەر هەموو یەکێکیان پێویست بووە، کە ئەوە ئەنجام بدات، کە لە توانایدا هەیە، بیکات، لە دوای ئیجتیهادکردنەکەی، ئەویش ئەوەیە کە ڕای وابووە فلان ئاڕاستە، یان (ڕوو) ڕوو بە قیبلەیە، بۆیە ئەو کەسە فەرمانی پێکراوە، کار بکات بۆ دۆزینەوەی ئەوەی کە دروستە و پێکراوەکەیە، بەلام بە مەرجی ئەوەی کە توانای ناسین و دۆزینەوەی هەبێت، مادام کە توانای دۆزینەوەی هەقەکەی نەبوو، ئەوا فەرمانی پێکراوە کە کار بەوە بکات، کە ئەو ڕای وایە هەقە و پێکانی تێدایە، و لەم حاڵەتەیشدا ئەوەی کە ئەو موجتەهیدە دیاری کردووە، ئەوە لەسەر بنەمای توانا و زانینی ئەو کەسەیە، نەوەك لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلامی.[1]

[1] مَجموُعُ الفَتاوى، شيخ الإسلام إبن تَيمية، ب٢، ل٢٧ـ ٣٠، و هەروەها بروانە: جامع بيان العلم وفضله، لإبن عبدالبرّ، ب٢، ل٨٩، والأحكام، لإبن حزم، ل٦٤٨، و إرشاد الفُحوُل، للشَوكاني، ل٢٣١.

## سێیەم : هۆکارەکانی ڕاجیایی

### ـ هۆکاری ڕاجیایی سەرزەنشتکراو:

٢٠ـ هۆکارەکانی ئەم جۆرە ڕاجیاییە سەرزەنشتکراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەرکێشی و شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکان و نەزانین، و جاری وا هەیە کە ئەم هۆکارانە سەرجەم پێکەوە کۆدەبنەوە و لێیانەوە ناشیرینترین و خراپترینی جۆری ڕاجیایی بەرهەم دێت، و جاری وایش هەیە، کە بە جیاجیا دەردەکەون و دەبنە مایەی ڕاجیایی سەرزەنشتکراو، کە دواجار دەبێتە هۆکاری تاوانبار بوون و لەناوچوونی ئەنجامدەرانی ئەو ڕاجیاییە سەرزەنشتکراوە.

### یەکەم: سەرکێشی (البَغي):

٢١ـ (بَغي: سەرکێشی)، بریتییە لە لادان لە هەق و ڕاستی، و لە پەڕاوی (اللسان)ی، (ئیبن مەنظور)دا، هاتووە، کە دەڵێت: هەموو تێپەڕکردن و لادانێك و ڕۆچوونێك و زیادەڕەوی کردنێك لەو سنوور و ئەندازەیەی کە بۆ هەر شتێك دانراوە، بە (البَغي: سەرکێشی) کردن، ناوزەدکراوە، و هەر لەسەر ئەم بنەمایەش لە پێناسەگەلێکی (البَغي)دا، گوتراوە، کە مەبەست پێی خراپە و گەندەڵی (الفساد) و ستەمکردن و ئێرەیی بردن و خۆبەزلزانین و درۆکردنە، چونکە ئەوەی ئەم خراپەگەلەی پێوە نوسابێت، ئەوە لەو سنوور و ئەندازەیە تێپەڕی کردووە، کە دەبوو لە ئاستییدا بوەستێت و پێوەی پابەند بێت و قورئانی پیرۆزیش ئەوەی ڕوون کردووەتەوە، کە لە هۆکارەکانی ڕاجیایی سەرزەنشتکراو کە (ئەهلی کیتاب: گەلانی تری خاوەن پەیامی ئاسمانی) تێکەوت، بریتی بوو لە (البَغي: سەرکێشی کردن)، و ئیتر چونیەکە ئەو ڕاجیاییەیان لە نێوان خۆیاندا بووبێت و یان لەگەڵ باوەڕدارانـدا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا

ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ ﴾[1]، و هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴾[2]، لە (تەفسیری پێشەوا ئیبن کەثیـر)دا، سەبارەت بەم ئایەتە هاتووە، کە ئەوانە هەندێکیان بەرامبەر بە هەندێکی تریان سەرکێشییان کرد، و لەمەڕ هەق ڕاجیاییان تێکەوت، چونکە ئێرەییان بە یەکتری دەبرد، و ڕقیان لە یەکتری بوو، و پشتیان لەیەکتری دەکرد، سەبارەت بە هەق و ڕاستی تووشی ڕاجیایی هاتن، و ئەو ڕق و کینەیەی کە بەرامبەر یەکتری هەیانبوو، بوویە هۆکاری ئەوەی کە گوفتار و کردارێك ڕەت بکەنەوە، هەرچەندە، لەسەر هەقیش بێت و ڕاجیایی تیادا بکەن.[3]

۲۲۔ جاری وا هەیە کە نموونەی ئەم ڕەوشە بێزراوە، یاخود بەشێکی تووشی مسوڵمانانیش دەبێت و دەکەوێتە نێوانیان، و دواجار دەبێتە هۆکاری پەرتەوازەیی،

---

[1] سورة البقرة: ۲۱۳، ئادەمیی یەك کۆمەڵن (بە سروشت)، ئینجا خوا پێغەمبەرانی نارد بە مژدەدەرو ترسێنەر، وە نامەی ڕاستو دروستی لەگەڵا ناردنە خوارەوە، تا بڕیار بدەن لە ناو مەردومانا لەو شتانەی کە تیایادووبەرەکیی بوون، وە کەس دووبەرەکیی نەکرد لەو نامانەدا، مەگەر ئەوانەی کە نامەیان درابوویە، دوای ئەوەی نیشانەهای ڕۆشنیان بۆ هات، (ئەم دوو بەرەکییەشیان) لە ڕووی سەرکێشیی ناو خۆیانەوە بوو، ئینجا خوا بەیارمەتی خۆی ڕێنموونیی بڕوادارانیی کرد بۆ ئەو ڕێگا ڕاستەی کە دوو بەرەکییان تیا ئەکرد، وە خوا کێی بویَ ڕێنموونیی ئەکات بۆ ڕێی ڕاست.

[2] سورة آل عمران: ۱۹، دینـی پەسـەندکراو لای خـودا، تـەنها ئیسـلامە، و ئەوانـەی نامـەیان بـۆ هـاتبوو، دووبەرەکییان تیَ نەکەوت، دوای ئەوە نەبیَ، کە زانینی بـە ڕاسـتییان بـۆ هـات، و (ئـەم لادانەشـیان) لـە ڕووی ستەمەوە بوو، و ئەو کەسەی بیَ بڕوا بیَ، بە ئایەتەکانی خودا، بە ڕاستی خودا زوو حسابی لە گەڵدا دەکات.

[3] تفسیر إبن کثیـر، ب۱، ل۳٥٤.

و ڕاجیایی ناشیرین، لەبەر ئەوەی کە لە دەروونیاندا حەز بە ستەمکاری وئێرەیی بردن و خۆبەشتزانین لەسەر زەوی هەیە و تەنانەت ئەگەر بە ڕێگای گەندەڵیش بێت و دەستیان بکەوێت هەر دەیکەن و ئەمانەیش هەموو لە نیشانەکانی سەرکێشی و لاڕێی کردنن، و هەروەها شێوەیەکی تر لەو سەرکێشییەی کە کەوتووەتە نێوان مسوڵمانان، ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە مسوڵمانان، کار لەسەر کردەوەیەکی دروستی شەرعی دەکەن، بەڵام کۆمەڵێکی تر بە هۆی سەرکێشی و ڕق و قینی دڵیانەوە بەرامبەریان نکۆڵی لەو کارە شەرعییەیان دەکەن، و هەروەها وەك ئەوەی کە لە جۆراوجۆریی هەندێ لە پەرستشەکاندا هەیە، وەك بانگدان و قامەتکردن و (قنوت خوێندن)، و نزای سەرەتای نوێژ دەستپێکردن و نوێژی مردوو و نوێژی هەردوو جەژنەکان و هاووێنەکانیاندا هەیە، کە شێوەی بەرجەستەکردنی ئەو پەرستشانە و چۆنیەتی بەرپاکردنیان، سەرجەمی جۆرەکانیان دروست و شەرعین، ئەو قسانەی کە هەن لەسەریان لەسەر ئاستی ئەوەدایە کە کامیان باشترە، نەوەك لە سەر ئاستی شەرعیی بوونیان، بەڵام بەهۆی سەرکێشی کردنەوە و یاخی بوونەوە، جاری وا هەیە، کە مسوڵمانێك بە هۆی ئەوەوە کە مسوڵمانێکی تر یەکێك لەو جۆرە پەرستشانە، وەك ئەم ئەنجام نادات، نکۆڵی لە کارەکەی دەکات و تەنها بەم نکۆڵی کردنەوە ناوەستێت و جاری وا هەیە، کە دژایەتیشی دەکات و پەیوەندی لەگەڵ دەپچڕێنێت، و دواجار لەناو گۆمی ڕاجیایی سەرزەنشتکراودا دەگەوزێت.

هەروەها شێوەیەکی تر لە سەرکێشی نێوان مسوڵمانان، ئەوەیە کە گرووپێك سەرجەم شتەکانی گرووپی بەرامبەر بە هەق و ناهەقەوە نکۆڵی لێ دەکات، و ئەم جۆرە کارانەیش دەبنە هۆکاری نەشونماکردنی ڕاجیایی سەرزەنشتکراو و پەرتەوازەیی بە دوای خۆیاندا دەهێنن، چونکە هەر گرووپە و بەرامبەرەکەی وەك دوژمن و یاخی و سەرکێش تەماشا دەکات، چونکە نکۆڵی لەو کارانە کردووە، کە

ئەم گرووپە دەیکات، هەرچەندیش دەزانێت کە بەدڵنیاییەوە لەسەر هەقە وئەم بیرە خراپە وا لەم گرووپە دەکات، کە چاو لە هەقی بەرامبەر بپۆشێت و واز لەو ناهەقی و بەتاڵییە نەهێنێت، کە خۆی کاری پێ دەکات، قورئانیش شێوەیەك لەم یاخیبوونەی نیشان داوین، کە دەفەرموێت:﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ ﴾[1]، ئەم سەرزەنشتکردنە لێرەدا هەردوو گرووپەکە دەگرێتەوە، بەهۆی ئەوەوە کە هەردوکیان پێشوازییان لەو ڕەوشە ناپەسەندە کردووە، کە لە دیاردەکانی یاخی بوون و سەرکێشین و شتێکی لەم جۆرەیش بێگومان لە ئێستادا گیرۆدەی نێوانی مسوڵمانانیش بووە، بۆ نموونە، کە دەبینیت، (صۆفییەکان) نکۆڵی لەکاری (شەرعزانەکان:الفُقَهاء) دەکەن، لەسەر ئەوەی کە شەرعزانەکان کار لەسەر ڕووکەش دەکەن و دیکۆر بینن، و شەرعزانەکانیش نکۆڵی لە صۆفیەکان دەکەن و ڕەخنەیان لێ دەگرن، لەسەر ئەوەی کە زیاتر کار لەسەر ناوەڕۆك دەکەن، و هەر گرووپەو ڕای بەرامبەرەکەی بە خراپ دەزانێت، و هەریەکەیان بەرامبەرەکەی بە هەق و ناهەقیەوە ڕەت دەکاتەوە، و ئەم کارەیش هۆکارە بۆ پەرەپێدانی و ورووژاندنی پەرتەوازەیی و ڕق و قین لە نێوان هەردوو گرووپەکەدا، و دواجار دەیانخاتە ناو ڕاجیاییەکی سەرزەنشتکراوەوە، و سەرچاوگی سەرجەم ئەمانەیش یاخی بوون و سەرکێشییە و بێویژدانییە، کە هەر گرووپێکیان، بەرامبەر ئەویتریان هەیەتی، و دان نانێت بە هەق و ڕاستی بەرامبەرەکەیدا، و هەروەها هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەو تەرازووەی کە دەبێت، هەق و ڕاستیی، پێ بکێشین، دەبێت تەرازووی قورئان و سوننەت بێت، و ملکەچی پێوانەی ئەو دووانە بێت، و ئەوەی کە قورئان و سوننەت بە هەقی زانی لە لای

---

[1] سورة البقرة: ١١٣، جوولەکە ئەڵێن گاور، لەسەر هیچ (ئایینێك) نین، و گاور ئەڵێن، جوولەکە لەسەر هیچ (ئاینێك) نین!

هەردوو گروپەکە، ئەوە هەقی ڕاستەقینەیە و پێکاویەتی، و ئەوەیشی کە قورئـان و سوننەت دانی پێدانا بە ڕاستی و هەقایەتیدا، ئـەوە نـەیپێکاوە و بەتاڵـە، و بەرنامـەی ئیسلامیش وەك چۆن هاتووە، کاروباری دڵ و دەروون و ناوەڕۆکیش ڕوون بکاتەوە، هەر بەو شێوەیەش بۆ ئەوە هاتووە، کە کاروباری ڕووکەش و پەلوپۆ و ئەندامەکان ڕوون بکاتەوە، و ڕێك بخات.

## دووەم: حەز و ئارەزووەکان:

**٢٢٣-** مەبەست لە حـەزو ئارەزووەکـانیش ئەوانـەن کـە دەروونـی مرۆڤــ، لـە چێژ و سەرپێچییەکان دەیخوازێـت، و حـەزو ئـارەزوویش لـە قورئانـدا باسـی تـەنها بـە سەرزەنشـتکردن هـاتووە، و تێکـەڵبوونی حـەزو ئـارەزوو بـە دڵ دەبێتـە هۆکـاری ئـەوەی کـە ئـەوەی دەروون و نەفسـی مرۆڤــ، دەیـەوێت، لـە خراپـە و ناحـەقی و بەتاڵی، خاوەنەکەی شوێنی بکەوێت، و ئیتر واز لە ڕاستی بهێنێت و دژایەتی ئـەهلی هەق بکـات، و دواجـار ئـەو کەسـە حـەزو ئـارەزوو ویسـتە دەکەوێتـە نـاو زەلکـاوی ڕاجیایی سەرزەنشتکراوەوە، بەرامبەر بە ئەهلی ڕاستی و هەقایـەتی، هـەروەك ئـەم بارودۆخـە لـە جولەکـەکان ڕوویـدا، بەرامبـەر بـە پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم)، وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾[1]، کە بێگومان ئەوان هەقیان دەناسی و چاوەڕوانی دەرکـەوتنی پێغەمبـەریان (صـلى الله عليـه وسـلم) دەکـرد، بـەڵام کـە پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) هـات و لـەو

[1] سورة البقرة: ٨٩، وە جولەکـەکان، لـەوەو پێشـیش، داوای زاڵ بوونیـان دەکـرد، بەسـەر ئەوانەیدا، کـە بـێ بڕوابوون، کەچی، ئەو پێغەمبەرەی کە دەیانناسی بۆیان هات، بێ بڕوابوون پێی، ئینجا دەی نەفرەتی خودا، لە بێ بڕوایان.

کۆمەڵەیە نەبوو، کە ئەوان دەیانخواست، گوێڕایەڵییان نەکرد و باوەڕیان پێ نەهێنا، جا جۆرێك لەم مامەڵە و ڕەوشتە سەرزەنشتکراوە و هاوشێوەکانی کەوتنە نێوان مسوڵمانان و وایان لێهات کە قسە تەنها لە کەسێکی دیاریکراو، یان کۆمەڵێکی دیاریکراو، یان مەزهەبێکی دیاریکراو، وەربگرن، و هەندێکیشیان بەوە ڕازی نین کە کەسێك لە غەیری کۆمەڵ و مەزهەبی خۆیان بێت، سەرۆکایەتییان بکات و فەرمانیان بەسەردا بکات!

٢٤ـ شێوازی تری ئەم حەزو ئارەزووانە، بریتییە لە حەزی دەرکەوتن و زاڵبوون بەسەر ئەوانی تردا، ئەم حەزەیش بکەرەکەی ڕەوانەی لای درۆکردن و درۆخوازی دەکات و شەیتانیش دەرگای مانالێکدانەوەی خراپ (التأويل الفاسد)ـی، بۆ دەخاتە سەرپشت و لەبەر چاویدا جوانی دەکات، و وا دەخاتە دڵییەوە کە ئەو کارەی ئەو دەیکات بەرگری کردنە لە ئایین و ورە و غیرەتی دینە ئەنجامی دەدات، و لە ڕاستییدا پاکژکردنەوەی دڵ و دەروون لە حەزو ئارەزوەکان کارێکی سەختە، بەڵام نەگونجاوو مەحاڵ نییە، و لەسەر باوەڕدار پێویستە کە بەردەوام چاودێری نەفس و دەروونی خۆی بکات، تا حەز و ئارەزووەکان دزە نەکەنە ناوییەوە، و ئەگەر نەیتوانی لە دڵ و دەروونی خۆیدا لای ببات، ئەوە بە لایەنی کەمەوە لەسەریەتی کە دوای نەکەوێت و پێچەوانەگەری بکات لە گەڵیدا، چونکە شوێنکەوتنی ئارەزووەکان گومڕاییە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾[1]، و لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێت: (لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعاً لما جئت به)، واتە: هیچکام لە ئێوە نابێتە باوەڕداری تەواو، تا

[1] سورة ص: ٢٦، شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆت مەکەوە، ئەوەك ئارەزووی نەفس ڕێی خودات لێ وون بکات.

حەز و ئارەزووەکانی نەبنە شوێنکەوتەی ئەو شتەی کە من، وەك پەیام هێناومە بۆ مرۆڤایەتی.

## سێیەم: نەزانین (الجهل):

٤٢٥ - یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ڕاجیایی سەرزەنشتکراو، بریتییە لە (نەزانین)، بێگومان سروشتی مرۆڤ، وایە کە نەزانین بەسەریدا زاڵترە، تا زانین، و زۆرجاریش ئەم ڕاستییە لەبیر دەکات، و سەبارەت بەو شتانەی کە ڕەتیان دەکاتەوە، و نکوڵییان لێ دەکات، وردەکاری ناکات، و وا گومان دەبات، کە ئەوەی ئەو بە تەنها دەیزانێت، بەس ئەوە هەق و ڕاستییە، و پێکاویەتی، و غەیری ئەوە ناڕەوا و ناهەقە و نەیپێکاوە، ئەمە دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە نکوڵی لە بەرامبەرەکەی بکات، بەشێوەیەك کە ئەم نکوڵی کردنە دەبێتە هۆکاری دوژمنایەتی و بەربەرەکانێ لە نێوانیاندا، و دواجار دەکەوێتە ناو زەلکاوی ڕاجیاییەکی سەرزەنشتکراوەوە، و بەڵکو جاری وا هەیە کە دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە شەرەف و ئابڕوو و سەرزەنشتکردنی دژەکەی بە حەڵاڵ بزانێت، هەروەك ئەمە لە (خەواریجەکان) ڕوویدا، کە هۆکاری بنەڕەتی کەوتنە ناو ڕاجیایی ئەوان لەگەڵ مسوڵمانان‌دا (نەزانین) بوو، نەوەك دووڕوویییان، و فەرموودەی زۆریش هەن، کە بەڵگەن، لەسەر ئەم ڕاستییە، لەوانە فەرموودەی: (يقرؤون القرآن لا يتجاوز حناجرهم، يمرقون من الدين، كما يمرق السهم من الرّمية)، واتە: خوێندنی قورئانەکەیان لە گەروویان ناچێتە خوارەوە، و لە دین دەردەچن، وەك چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت، ئەوانە لە مانای قورئان و ئامانج و مەبەستەکانی شەریعەت تێنەگەیشتوون، هەرچەندە زۆر قورئان دەخوێنن، و شەیتان بیرکردنەوەکانی ئەوانی لێ کردوونەتە ڕاستی و حەقیقەت، ئەمە پاڵی پێوە نان، تا لە بازنەی کۆمەڵی مسوڵمانان بچنە

دەرەوە، و ئەوەندە پێچەوانەگەرییان بکەن، تا بگاتە ئاستێك کە لە کوشتنی بێ باوەڕاندا هەست بە شەرمەندەیی بکەن، بەڵام خوێن و کوشتنی بڕواداران حەڵاڵ بکەن، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر نەزانینەکە نەزانینی سادە (الجهل البسیط) بوو، لەم حاڵەتەدا، جاری وا هەیە، کە خاوەنەکەی لە نەزانینەکەی وازدەهێنێت، و دەگەڕێتەوە کە هەقی بیست و یادی خرایەوە، هەروەك هەندێك لە خەواریجەکان کە قسەی هەقیان بیست لە (ئیبن عەبباس)ـەوە، (خوای لیّ ڕازی بێت)، کە ڕۆیشت بۆ لایان و گفتوگۆ و موناقەشەی کردن و بیروڕا گوماناوییەکانی ئاشکرا کردن، گەڕانەوە و وازیان لەو هەزرە هێنا، پاشان جاری وا هەیە کە نەزانینەکە ئاڵۆز و قورسە و بەتایبەتی ئەگەر سەرکێشی و یاخیبوون و حەز و ئارەزووی تێکەڵ بوویێت، جا لەم حاڵەتەدا سەختە کە بتوانرێت خاوەنەکەی لەو نەزانینە پەشیمان بکرێتەوە و گومانە فیکرییەکانی ئاشکرا بکرێن، هەرچەندە هەموو جۆرە بەڵگەیەك بدرێت بە گوێیدا، هەروەك هەمان ڕەوش لەگەڵ ئەو خەواریجانەدا ڕوویدا، کە ئەو بەڵگە و نیشانانەی (ئیبن عەبباس)، (خوای لیّ ڕازی بێت)، خستییە بەردەمیان ڕەتیان کردنەوە.

## ـ فاکتەرەکانی ڕاجیایی ڕەوا و وەرگیراو:

٢٦ـ ڕاجیایی موجتەهیدەکان بۆ زۆر هۆکار دەگەڕێتەوە، کە لە جێگای خۆیاندا لە پەڕاوەکانی (فیقهـ)، و (أصول)، و (خلاف)دا، دەزانرێن و دەناسرێنەوە، و لێرەدا ئێمە مەبەستمان نییە، کە بچینە ناو ڕوونکردنەوە و درێژەباسی ئەم پرسەوە، ئێمە لێرەدا بە قسەکردن لەسەر هەندێ لەو هۆکارانە دەیبڕینەوە، وەك ڕاجیایی ئەوان لەسەر یاسا و ڕێسا و بنەماکانی شرۆڤەکردنیان بۆ دەقەکان، ئیتر چوونیەکە دەقی قورئان بن، یان سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم)، کە ئەمیش دەبێتە

هۆکـاری ڕاجیاییـان لەسـەر ئـەو ئەحکامانـەی کـە لـەو دوو سەرچـاوەیەوە هـەڵیانهێنجاوە، و هـەروەها هۆکـارێکی تـری ڕاجیاییـان ئەوەیـە، کـە هەنـدێ لـە شەرعزانان سوننەتی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بـە ڕێگایـەکی متمانـەپێکراو پێ دەگات و لە مانا و مەبەستەکەی تـێ دەگـات، و کـار بـە داواو ناوەڕۆکەکەیشـی دەکـات، لـە کاتێکدا کـە ئـەم سـوننەتە نەگەیشـتووە بـە شـەرعزانێکی تـر، یـاخود بەشەرعزان گەلێکی دیکە، بۆیە ئیجتیهادی تیادا دەکەن، و جاری وا هەیە، کـە بـەو ئیجتیهادکردنـەیان دەیپـێکن و هـاوڕێکی سـوننەتەکە بڕیـار و ئیجتیهادەکـەیان دەر دەکـەن، بـەڵام جـاری واش هەیـە کـە ئیجتیهادەکـەیان پێچـەوانەی سـوننەتەکە دەردەچێت، و موجتەهیدە ڕا پێچەوانەکە لێـرەدا خـاوەن پاسـاوو بیـانووە، و لـەم پێچەوانەگەرییەیدا کە کردوویەتی، و پاشان جاری وا هەیـە کـە سـوننەتەکە دەگـات بەو کەسـەی کـە بـە پێچـەوانەیەوە ئیجتیهـادی کـردووە، بۆیـە لـە ڕا پێچـەوانەکەی پاشـگەز دەبێتـەوە، و ڕاجیاییەکـە دەڕەوێنێتـەوە، و جـاری وا هەیـە کـە هـەر سوننەتەکەی ناگاتە لا، و دواجار ئەو ڕا پێچەوانەیەی هەر دەدرێتە پاڵی، و خـەڵکی تـریش تەقلیـدی دەکەنـەوە، و یـاخود بـا لێـرەدا گومـانی بـاش بـە موجتەهیـدە پێشـووەکانمان بـەرین و بڵـێین کـە ئـەو ڕاجیاییـە لـە لای شـوێنکەوتەکانیان دەمێنێتەوە، و لێـی لا نـادەن، و جـاری وایـش هەیـە کـە ئـەو فـەرموودە پـیرۆزەی پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم)، دەگاتـە لای شـەرعزانەکە، بـەڵام متمانـە بـە گێڕەرەوەکانی ناکـات، بۆیـە وەریناگرێـت و کـاری پـێ ناکـات، لەکاتێکدا کـە هـەر هەمان فەرموودە، بە ڕێگایـەکی متمانـەپێکراو، گەیشـتۆتە لای شـەرعزانێکی تـر، و کاری پێ دەکات، و لێرەوە ڕاجیاییەکە دروست دەبێـت، و جـاری وایـش هەیـە، کـە فەرموودەکە دەگات بـە شـەرعزانان و متمانـەیش بـە ڕێگاکـانی گەیشـتنی دەکـەن، بـەڵام لـە مانـا و دەلالەتکردنیـدا و لەسـەر مەبەسـت و مەرامـەکانی ڕاجیاییـان تـێ

دەکەوێت، لەو ئەحکامانەیدا کە لێوەی هەڵیانهێنجاوە، و ئەمەیش باسێکی فراوانی هەیە.

ئینجا ئەوەی کە پێویستە مرۆڤی مسوڵمان بیزانێت، ئەوەیە کە هیچ پێشەوایەك لە پێشەوایانی مسوڵمانان کە شایەتی خوادۆستی و خواناسی و زانستییان بۆ دراوە، بە تایبەتی، و دەست ئەنقەست، پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەبووەتەوە، کە زانیبێتی فەرموودەکە صەحیحە، و (سڕاوە:مَنْسُوُخ) نییە، و دەلالەتکردنی لەسەر مەبەستەکەی ڕوون و ئاشکرا بێت! جا گومانی لەم جۆرە بەتاکی مسوڵمانی ئاساییش نابرێت، چ جای گومان ببرێت، بەو زانا مەزنانەی کە خودا پلەو پایەیانی شکۆمەند کردووە و بەرزی کردوونەتەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ﴾[1]، لەم ڕوانگەیەوە بۆ مرۆڤی مسوڵمان دروست نییە، کە زماندرێژی بکات و قسەی بریندارکەر بەرامبەر بەو پێشەوا موجتەهیدانەی ئایینەکەمان ببێژێت، بە بیانووی ئەوەی کە شتێکیان گوتووە، کە پێچەوانەی فەرموودەی صەحیحە، چونکە ئەو موجتەهیدانە لەو پێچەوانەبوونەوەیاندا پاساودارن، و خودا تەنها بە ئەندازەی توانا ئەرك دەخاتە سەرشانی مرۆڤ، و هەر ئەوانیش لەسەر ئەو ئیجتیهادەیان، و لەسەر ئەو مەبەستەی کە هەیانبووە، کە هەق بناسن و ئەحکامەکانی شەرع بزانن، خاوەنی پاداشتن.

هەروەها یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ڕاجیاییان بریتی بووە لە ئاستی بە بەڵگەکردنی هەندێ لە سەرچاوەکانی فیقهـ، و شەرع، بۆ نموونە هەندێکیان دان بە (قیاس)دا، نانێن، وەك سەرچاوەیەکی ئەحکام، بۆیە هەر حوکمێ لەسەر قیاس بنیات بنرێت،

---

[1] سورة المجادلة: ١١، خودای مەزنیش، پلە و پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە، لە ئێوە، کە بڕوایان هێناوە، و ئەوانەی کە زانینیان پێ بەخشراوە، بە چەند پایە و پلەیەکی باڵا و مەزن.

یاخود ئەحكامی لێوە دەربهێنرێت، ئەوان دانی پێدا نانێن، بۆیە لێرەوە ڕاجیایی لە نێوان ئەوانەدا دروست دەبێت، کە بڕوایان بە قیاس هەیە، لەگەڵ ئەوانەیدا کە بڕوایان پێی نییە، وەك بەڵگەیەکی شەرعی.

هۆکارەکانی ڕاجیایی بەشێوەیەکی گشتی لەو شتانەدایە کە دەقی لەسەر نییە، و ئەمەیش دەبێتە هۆی ڕاجیایی نێوان شەرعزانەکان لەئاستی هەستکردن و ئەندازەگیری کردنیان و پەی بردنیان بە بوونی بەرژەوەندی و خراپە و هۆکاری حوکمەکان و مەرامی دەقەکان و مەبەستەکانی شەریعەت و پراکتیزەکردنی سەرجەمی ئەمانە بەسەر ئەو پێشهات و ڕووداوانەوایدا، کە فەتوای لەسەر دەردەکەن، و یان بڕیاری لەسەر دەدەن، ئەم باسەیش هەر زۆر پان و پۆڕ و بەرفراوانە، هەربۆیەش هاوەڵە بەڕێزەکان (خوا لێیان ڕازی بێت)، ڕاجیاییان هەبووە، لەسەر ئەو شتانەی کە دەقیان لەسەر نییە، هەرچەندە کە سەردەمەکەیشیان زۆر نزیك بووە، بە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، و هەروەها شایەتحاڵی دابەزینی ئایەتەکانی قورئان بوون و نهێنی و مەبەستەکانی شەریعەتیان زانیوە، ئەگەر هاوەڵە بەڕێزەکان بەو بەڕێزی و شکۆمەندی و پایەبەرزییەوە لەسەر پرسە ئیجتیهادییە فیقهییەکان ڕاجیاییان هەبووبێت، ئەوا کەسانی غەیری ئەوان زۆر لەبارترن بۆ ئەوەی ڕاجیایی بکەوێتە نێوانیانەوە.

جا ئێمە بەم ڕاجیاییەی نێوان موجتەهیدەکان سنگمان توند نابێت، و هەناسەمان سوار نابێت و ئاسایی وەری دەگرین، و بە بەش بەشکردنی ئایینی نازانین، بەڵکو وەك نیشانەی چالاکی و ئەکتیڤی شەرعزانە مسوڵمانەکانمانی تەماشا دەکەین، و لە سەرمانە کە سوودی لێ وەربگرین، و لە گەڵ بوونی ڕێزماندا بۆ ئەو شەرعزانە مەزنانە، بەڵکو ئێمە هەناسەمان بەوە سوار دەبێت و بەوە تەنگەتاو دەبین، بەوەی کە هەندێ نەزان و نەفام دەیکەن، لە ژێر ناوی ئەو ڕاجیاییەی نێوان شەرعزانەکان

کە خۆیان تووشی دەمارگیری و ڕاجیایی سەرزەنشتکراو دەکەن، و پیرۆزی و شکۆمەندی نابەجێ دەدەنە پاڵ ئەو شەرعزانە مەزنانە، و بە بێ هەڵە و پەڵەیان دادەنێن و قسەکانیان پێش قورئان و سوننەت دەخەن، و چەندەها کاری خراپی تریش کە خەڵکانی دەمارگیری نەزان دوچاری بوون و تێی کەوتوون، کە هەرگیز ئەو شەرعزانە گەورانەمان شتی وایان نەفەرمووە، و هەروەها تەنگەتاو دەبین، بەوانەیش کە بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە تەقلیدی هیچ مەزهەبێك ناکەنەوە، و ئیجتیهادکردنی خودی خۆیان لە کاروباری ئاینیدا بە ڕەوا دەزانن، سەرەڕای ئەوەی کە لە ئایەتێکی قورئانیش حاڵی نین و لێی تێ ناگەن، و هەروەها بۆ خۆیان بە ڕەوای دەبینن تانە بدەن، لە پێشەوا موجتەهیدەکان، بە پاساوو بیانووی ئەوەی کە گوایە شوێن قورئان و سوننەت کەوتوون، و ئەم پرسەیش ڕوون و سادەیە، ئەویش ئەوەیە هەرکەس توانای هەڵهێنجانی ئەحکامی هەیە، لە سەرچاوەکانەوە، با بیکات و هەرکەس توانای ئەمەی نییە، ئەوا لەسەری پێویستە کە پشت بە زانایان ببەستێت، چ زیندووەکانیان و چ ئەوانەی کە کۆچی دواییان کردووە، و سەبارەت بە زیندووەکانیان با بگەڕێتەوە بۆ لایان و پرسیاریان لێ بکات و بۆ مردووەکانیش با بگەڕێتەوە سەر کتێبەکانیان، ئەوانەیان کە بڕواپێکراو و صەحیحن، و نموونەی ئەم زانا کۆچکردووانەیش، وەك ئەو زانایانەی مەزهەبەکان، کە مەزهەبەکانیان لە ناو گەلی ئیسلامدا، تا ئێستایش پارێزراوە و زانایانی مەزهەبەکەیشیان شایەتی زانستیان بۆ دراوە و جێگای قەبوڵی گەلی ئیسلامن، جا ئەگەر کەسێك فەرمایشتێکی بەدی کرد، لەناو ئەو مەزهەبەیدا کە ئەو پێی ڕازییە، و پەیڕەوی لێوە دەکات و پێچەوانەی فەرموودەی ساغ و صەحیح بوو، با کار بە فەرموودەکە بکات، دوای ئەوەی کە دڵنیابوویەوە لە صەحیحی و مانا دروستەکەی، چونکە سەرجەم ئەو شەرعزانانەی کە پەیڕەوییان لێوە دەکرێت، فەرموویانە: "إذا

صحَّ الحديث فهوَ مَذهبي: ئەگەر فەرموودەیەك صەحیح بوو، ئەوا ڕوانگە و مەزهەبی من، هەمان ئەو شتەیە کە فەرموودەکە فەرموویەتی".



والحمد لله أولاً، وَ آخِراً

وَ صَلّى اللهُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ، وَ عَلى آلِهِ الطَيِّبينَ الطاهِرين، وَ عَلى أَصْحابِهِ المُجاهِدين، وَ مَنْ تَبِعَهُم بِإِحْسانٍ إِلى يَوْمِ الدِّين.

## ﴿بەرهەمەکانی تری وەرگێڕ﴾

١. کوردانندنی (دَلالات النُصوص، وَ طُرُق أستِنباطِ الأحكام)ـی، د. مستەفا زەڵمی.
٢. کوردانـدنـی ﴿الطلاق مرّتان، فِـي تفاسيرِ القرآن﴾ـی، د. مستەفا زەڵمی.
٣. کوردانـدنـی ﴿خُطُوات الطّلاق، فِـي القُرآنِ الكَريم﴾ـی، د. مستەفا زەڵمی.
٤. کوردانندنی ﴿الطّلاق الـمُعَلّق، فِـي الشّريعَة الأسلامِيّة﴾ـی، د. مستەفا زەڵمی.
٥. کوردانندنی ﴿الطلاق الـمقتَرن بِالعَدَد، لا يَقَع بِهِ ألاّ طَلقة واحِدَة﴾ـی، د. مستەفا زەڵمی.
٦. کـوردانـدنـی ﴿الطّلاق فِـي الـقُـرآنِ الـكَـريم﴾ـی، د. مستەفا زەڵمی.
٧. کـوردانـدنـی ﴿الطّلاق فِـي الأسلام قَبلَ الـمَذاهِب﴾ـی، د. مستەفا زەڵمی.
٨. کوردانندنی کتێبی (الوَجيز فِـي أُصوُل الفِقه)ـی، د. عبدالكريم زەیدان.
٩. کوردانندنی کتێبی (تيسير مُصطلح الـحَديث)ـی، دکتۆر مَحمود الطَحّان.
١٠. کوردانندنی (صَحيح مُسنَد أسباب النزوُل)ـی، "الشيخ مقبل بن هادى الوادعى".
١١. کوردانندنی (هِدايَة الـمُستَفيد)، دەربارەی زانستی تەجوید.
١٢. کوردانندنی موناجاتی ئیمامی شافیعی.
١٣. کوردانندنی، (مَنْظُومَة أِبْن فَرَح الأشبيلى)، لە زاراوەکانی فەرموودەدا.
١٤. شەرحی (أُصولُ الـحَديث)ـی، شێخ (مُحَمّد أفَنْدي البُرْكَوي)، لـە زانستەکانی فەرموودەدا.
١٥. شەرحی (نُخْبَةُ الفِكَر)ـی، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، لـە زاراوەکانی فەرموودەدا.
١٦. شەرحی (نُزْهَةُ النّظَر)ـی، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، لـە زانستەکانی فەرموودەدا.
١٧. شەرحی (الـمَنظومَة البَيْقونِيّة)، لە زانستەکانی فەرموودەدا.
١٨. شەرحی عەوامیلی جورجانی. (کورتە شەرح).
١٩. شەرحی عەوامیلی جورجانی.(شەرحی درێژ، لە"٤٠٠" لاپەڕەدا).
٢٠. شەرحی عەوامیلی بورکەوی.
٢١. شەرحی عەوامیلی مەلا موحسین.
٢٢. شەرحی (الـمُقدمة الآجرومية).(کورتە شەرح).
٢٣. شەرحی (الـمُقدمة الآجرومية).(شەرحی درێژ، لە "٣٠٠" لاپەڕەدا).

٢٤. شەرحی (الـهِدايَة فِي النّحو).

٢٥. شەرحی (مِفتاحُ الآداب)ـی، (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مدرّس)، بە کوردی.

٢٦. شەرحی (الفَوائِدالصَّمَدِيّة)، لە زانستی نەحودا.

٢٧. کورداندنی ﴿أرمغان جوانان﴾ـی، مامۆستا مەلا باقری بالك. (نەحـو)

٢٨. کوردانندی ﴿شەرحی ئیبـن عەقیل – بەرگی یەکەم﴾.

٢٩. کوردانندی (مَتْـنُ الأمْثِلَة)، لە زانستی صەرفدا.

٣٠. کوردانندی (صیغ الـمشکله)، لە زانستی صەرفدا.

٣١. پوختەیەك دەربارەی زانستی ﴿صەرف﴾، (کە لە فارسییەوە وەرمگێڕاوە).

٣٢. شەرحی (عُمْدَةُ الطُلاّب)ـی، شێخ عباس الـمدنی الشافعی، لە زانستی ئوصولی فیقهـــدا.

٣٣. شەرحی (الورقات)ـی، ئیمامی حەرەمەین، لە زانستی ئوصولی فیقهدا.

٣٤. کوردانندن و ڕاڤـەی (الأسئِلَة وَ الأجوبَة فِي أُصوُل الفِقه)ـی، مامۆستا مەلا عوسـمان عەبدولعەزیز.

٣٥. پوختەیەك دەربارەی زانستەکانی قورئانی پیـرۆز، (علوم القرآن).

٣٦. ڕیزبەندی قورئانی پیرۆز، بە گوێرەی باس و بابەتە جیاوازەکان.

٣٧. گوڵچنێ لە گوڵزاری فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلامﷺ.

٣٨. (حەفتا و سێ فیرقەی جیاواز). دەربارەی دەستە، و تاقمە ئیسـلامییەکان، (الفِرَق الاِسلامِيّة).

٣٩. الـمُلاّ أبوبکر الـمُصَنِّف، حیاته ومؤلفاته وآراؤهُ. (بە عەرەبی)

٤٠. مەلا ئەبوبەکری موصەنیف، (ژیان، و کتێب، و بیروڕاکانی).

٤١. چمکێك لە ژیان وکەسایەتی موتەصەویفی مەزن، شێخ عەبدوڵلای دەمەیەوی.

٤٢. تەحقیقی ﴿حەج نامەی کوردی﴾، مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵلا دەمەیەوی.

٤٣. ئامادەکردنی، ﴿دیوانی جەلال﴾، شیعرەکانی: مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵلا دەمەیەوی.

٤٤. شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی، و دوو پەیامی عیرفانیی لە لووتکەدا.

٤٥. خوشکم حیجاب خۆش بەختییە.

**وصلى الله على سيدنا و نبينا محمد و على آله و صحبه وسلم و**

**الحمد لله رب العالـميـن**

بسم الله الرحمن الرحيم وبه نستعين

المجيز: جلال ابن الشيخ عبدالله الدمنيوي.

المجاز: عبدالله بن المرحوم الشيخ أحمد بن المرحوم الشيخ محمد بن المرحوم الشيخ عبدالله الدمنيوي.

الحمدلله الذي دلّ بذاته على ذاته، وتقدّس في صفاته عن شائبة النقص وسماته، وشهد على وحدانية نظام سلكه وانتظام مصنوعاته، وزيّن سماء الدين بنجوم العلماء الراسخين الذين هم ورثة الانبياء، بشهادة سيّدالمرسلين، يا من هو شاهد في ثمين، والاشاهدالعين، واقرب من كل شيء من عينه، وقد حال الحجب في البين، صلّ على حبيبك الهادي اليك بعد ما وقب غاسق الجهالة، وسلم على صفيّك القائد الى جنابك، حيث أطلب وجه محجّة اتهدى بظلم الضلالة، سيدنا محمد المظهر الاتم، فاتحة الكنز المطلسم، خط الوحدة بين قوسي الوجود والعدم، وعلى آله وأصحابه براهين الاستقامة ونجوم الهداية في الحلّ والحرم.

وبعد: فيقول، أفقر عبادالله، تراب أقدام الطالبين، غبار مجالس العلماء العاملين، جلال ابن الشيخ عبدالله الدمنيوي، أنالهما الله عليهما الرحمة والرضوان وأسكنهما بمحض فضل وجوده، أعلى غرف الجنان، انّه المولى كلّ نعمة واحسان، ان العلم لواء قدره مرفوع لايوضع، وأساس عزة موضوع لا يرفع من لعلمه به فلا يضلّ ولايشقى، ومن أعرض عنه فقي خزي الدنيا والاخرة يبقى، وقد تظاهرت الايات والاحاديث والاثار على فضله، قال تعالى عزّ من قائل:(قل هل يستوي الذين يعلمون، والذين لايعلمون)،(وقل ربّي زدني علما)،( يرفع الله الذين آمنوا منكم، والذين اوتوا العلم درجات)، وقال النبي صلى الله عليه وسلم:(من يردالله به خيرا يفقهه في الدين)، اذا أرادالله بعبد خيرا فقهه في الدين وألهمه رشده، أفضل العبادة الفقه، وأفضل الدين الورع، قال صفوان بن عسال:(يارسول الله، جئت أطلب العلم، قال مرحبا بطالب العلم، انّ طالب العلم، لتحفه الملائكة بأجنحتها، ثمّ يركب بعضهم بعضا، حتى يبلغ السماءالدنيا من محبّتهم لما يطلب وانّ فضل العالم على العابد، كفضل القمر على سائر الكواكب، وانّ العلماء ورثة الانبياء، انّ الانبياء لم يورّثوا درهما، ولا دينارا، ولكنّهم ورّثوا العلم، فمن أخذه أخذ بحظّ وافر)، وقال علي كرّم الله وجهه:(كفى بالعلم شرفا، أن يدّعيه من لايحسنه، ويفرح به اذا نُسب اليه، وكفى بالجهل ذمّا، أن يتبرأ منه من هو فيه، وقال أبو مسلم الخولاني، مثل العلماء في الارض، مثل النجوم في السماء، اذا برزت للناس اهتدوا، واذا أخفيت عليهم تحيّروا، وقال معاذ رضي الله عنه، تعلموا العلم، فانّ تعلمه حسنة وطالبه عبادة ومذاكرته تسبيح والبحث عنه جهاد وبذله صدقة وأمثال هذه الايات والاخباروالاثار كثيرة، ومن ذكرها غنيّ لكونها شهيرة، وانّ ممن اهتدى بنور الهداية الى معارج هذه المرتبة العليّة دارتقى بمعراج توفيقه الى معارج هذه المنقبة السنيّة قرّة عيون أصحاب صفة الرشد الخالي من الشين والمين ابن اخي وحبيبي عبدالله بن المرحوم الشيخ أحمد بن المرحوم الشيخ محمد بن المرحوم الشيخ عبدالله الدمنيوي، وفقه الله تعالى لترويج السنن السنيّة ودفع البدع الغير مرضيّة، بمنّه، آمين، لقد أنفق في كثير من الزمان البحث عن رموز الاصول والفروع والكشف عن المعقول والمنقول، فارتقى بحسن توفيقه الى أعلى المدارج، وأقصى المعارج، فوجدناه للتحلي بحلل التدريس حريّا وقمينا، وللتجلي ببذل معارف العلوم لطالبيها صادقاوأمينا، فأجزته بعد المعاهدة بقيام السنن السنيّة والشيم المرضيّة، وان لم أكن أهلا لذلك، لكن تشبّها بأهلها وتشبّثا بأذيال العلماء الاعلام، واستمدادا عن نفوس الاولياء الكرام، بتدريس العلوم العقليّة والنقليّة، كما أجازني الاستاذي الفاضل الشيخ (بابا شيخ بن السيّد عبدالله الكازاوي _ الماتة)، أفاض الله عليهما الرحمة والرضوان، بإجازته عن أستاذه الفاضل ذو المناقب والمفاخر، مولانا الملا عبدالقادر البياري، نوّر الله روحه، بإجازته عن أستاذه الجامع بين علميّ الظاهروالباطن، فريدالزمان مولانا أحمد النودشي، ابن مولانا عبدالرحمن، أنعم الله عليهما بنعمة لقائه في أعلى قصورالجنان، عن أستاذه مظهر ألطاف الملك العليم المعطي، مولانا محمّدالخطي، نوّر الله روحه، عن أستاذه الفاضل الكامل المتحلّي بالخلق الربّاني، مولانا عبدالرحمن الروزبهاني قدّس سرّه، عن أستاذه النورلني صبغة الله أفندي الحيدري، عن والده ذي الفيض الجاري، مصطفى أفندي الزيباري، عليهما رحمة الباري، عن أستاذه الذي يسيل علمه كسيل الوادي على أهل البلاد والبوادي، صبغة أفندي الحسين آبادي، عليه رحمة المنّان الهادي، عن والده الأعلم الأفخر مولانا ابراهيم ابن حيدر عن والده الماجد حيدر ابن أحمد عن والده الأعظم أحمد بن حيدر عن والده الأفخم حيدر الاوّل وهو تلميذ شيخ الاسلام صدر المحققين مولانا زين الدين البلاتي، تلميذ نصرالله الخلخالي، تلميذ مولانا ميرزاجان، تلميذ خواجه جمال الدين محمود الشيرازي، تلميذ رئيس المحققين مولانا جلال الدين محمّد بن أسعد الصديقي الدواني، تلميذ والده الماجد أسعد الدواني، تلميذ العلامة السيّد الشريف الجرجاني، تلميذمباركشاه البخاري، تلميذ قطب الدين الرازي، تلميذ العلامة الشيرازي، تلميذ الكاتب القزويني، تلميذ الأمام فخرالدين الرازي، تلميذ حجّة الاسلام الإمام الهمّام محمّدبن محمّد الغزالي، تلميذ أبي المعالي امام الحرمين عبدالملك يوسف الجويني، تلميذ الشيخ أبي طالب المكي، وهو أخذ الانابة والارادة ولبس الخرقة من ابي عثمان المغربي، وهو عن أبي عمرو الزجّاج، وهو عن سيّد الطائفة أبي القاسم جُنيد البغدادي، وهو عن خاله أبي الحسن السري السقطي، وهو عن تاج الأولياء المعروف الكرخي، وهو عن الامام المرتضى الامام علي الرّضا، وهو عن أبيه غرّة جباه الأعاظم الامام موسى الكاظم، وهو عن أبيه الجامع للمفاخر الامام محمّدالباقر، وهو عن أبيه انسان أعيان الزاهدين، الامام علي زين العابدين، وهو عن أبيه أسعد السعداء، الامام حسين سيّدالشهداء، وهو عن أبيه الامام الهمام أسدالله الغالب، باب مدينة العلم، علي ابن أبي طالب، كرّم الله وجهه، وهو عن حضرة دُرّة صدف الوجود المخصوص بالمقام المحمود واللواء المعقود والحوض المورود، والمكان المشهود، الكنزالمطلسم خليفة الله الأعظم معدن الصدق والصفا، سيّدالمرسلين، أبي القاسم محمّدالمصطفى، صلى الله عليه وعلى آله وسلم، وهو من أمر ذي النور المبين، بواسطة الروح الأمين، الممتاز بين الملائكة المقرّبين، برسالة ربّ العالمين، الى الانبياء والمرسلين، جبرائيل الامين، على نبيّنا وعليه الصلوة والسّلام، اللهم أفض علينا من بركاتهم واسلك بنا مسلك كراماتهم، واجعل هذا العهد مقرّبا اليك، و وسيلة عند الوقوف بين يديك، واقرن بفاتحة السعادة أمالنا، واختم بفاتحة الشهادة آجالنا، آمين، و الصلوة والسّلام على سيّدالمرسلين، وآخر دعوانا أن الحمدلله ربّ العالمين.

تراب تحت أقدام علماء العاملين

جلال ابن الشيخ عبدالله الدمنيوي

أؤيد قابلية المجاز السيد عبد الله بن المرحوم الشيخ أحمد الدميوي بالإجازة العلمية كما زكاه المرحوم الشيخ جلال الناوي رحمه الله